# زەردەشت و
# زەردەشتییەکان

نووسینی

**د. الشفيع الماحي احمد**

وەرگێڕان و لێکۆڵینەوەی

**محمد حسن**

بۆ بلاوکردنەوە و راگەیاندن

| | |
|---|---|
| ناوی کتێب: | زەردەشت و زەردەشتییەکان |
| نوسەر: | د. الشفیع الماحی احمد |
| وەرگێڕانی : | محمد حسن سەرگەینێلی |
| نەخشەسازی ناوەوە: | هەردی |
| بڵاوکردنەوەی: | نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر |
| خەت: | نەوزاد کۆیی |
| بەرگ : | أمین مخلص |
| نۆرە و ساڵی چاپ: | یەکەم ١٤٣٠ك – ٢٠٠٩ز |
| تیراژ: | ١٥٠٠ دانە |

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (٤٣)ی ساڵی ٢٠٠٦ دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٢٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

www.al-tafseer.com

# پوختە:

## ١- ئامانجەکانی توێژینەوەکە:

توێژینەوەکە لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی بنەما و لقەکانی ئاینی زەردەشتی کۆن دەخاتە ڕوو، لەگەڵ بنەما و لقەکانی ئاینی ئیسلامیان بەراورد دەکات و، ئەو گۆڕان و لادانانە ئاشکرا دەکات، کە بەسەر ئاینەکەدا هاتووە و لە کۆتاییدا گۆڕیویەتی بۆ ئاینی مەجوسی کە بەر لە زەردەشتدا هەبووە[1] پاشان لێکۆڵینەوەکە مێژووی زەردەشتیەکانی نووسیوە.

[1] بێگومان زۆر لە نووسەرە مێژوویەکان دەڵێن: وشەی مەجوس بەر لە زەردەشتی یەتدا (ع) نەبووە، بەڵکو وشەی (مەجوس) لە (موغ) ەوە هاتووە کە ناوی پەیڕەوانی زەردەشت بووە و، پاشان لە کاتی وەرگێڕاندا گۆڕانی بەسەردا هاتووە لەوانە مامۆستای خوا لێ خۆش بوو (مسعود محمد) لە کتێبی (لسان کرد) دا. بۆیە وشەی مەجوس شوێنی مانای ئاگر پەرستی ناگرێتەوە. یان بۆ نموونە (احسان نوری) لە کتێبی (مێژووی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد) کە (حەمە کەریم عارف) لە فارسییەوە کردوویە بە کوردی لە (ل: ٦٦) دا دەنووسێ: (ماد و ماژو، موغ و کرمانج) لەیەك وشەوە هاتوون کە ناوێکی بۆ گەلی کورد وە لە (کتاب المقدس/سفر التکوین/١٠/٣) دا ماد کە بە (madai) هاتووە یەکێکە لە کوڕەکانی یافتی کوڕی نوح (ع). بەو پێیەی (ماد) باوکی گەورەی زەردەشتە و باپیرەی کوردەکانە.

وە بڕوا وایە میدیەکان لە (٧٠٠پ. ز) دا لە لایەن (دیاکۆ)وە کراون بە یەك تیرە و دەوڵەتەکی بەهێزیان لێ دروست بکات و شاری ئەکبەتانا (هەمەدان) بکات بە پایتەخت. (مادەکان) هەمیشە لەگەڵ ئاشوریەکان لە شەڕدا بوون و لە کۆتاییدا لە هەندێ مێژوودا لە (٦١٢پ. ز)دا بە هاوپەیمانی لەگەڵ کلدانیەکاندا هێرشیان کردە سەر نەینەوا و دەوڵەتی ئاشوریان ڕووخاند. سەرکردەیەکی ئەم سوپایە کەیخەسرەو بووە و بە (کیا کسار) هاتووە. لەسەردەمی کەیخەسرەودا هەموو کوردستان و ناوچەکانی دەوروبەری لە ژێر دەسەڵاتدا بووە. ئەم پێناسەیەی میدیەکان ئیمڕۆ مامۆستا (احمد امین) لە (فجر الاسلام) دا دەڵێ: (زەردەشت پێغەمبەرێکی چاکە خواز بوو خوا بۆ سەر گەلی میدی نارد). (وەرگێڕ)

## ٢- سەرچاوەکانی لێکۆڵینەوەکە:

کتێبی (الابتسان المقدس عند المجوس) و هەندێ کتێبی عـەرەبی و ئینگلیـزی سەبارەت بە زەردەشت و زەردەشتیەکان.

## ٣- ئاکامی توێژینەوەکە:

توێژینەوەکە سەلماندوویەتی کە ئاینی زەردەشتی ئاینەکە خوا بۆ زەردەشـتی ناردووە و، لەگەڵ ئەو لادان و گۆڕینەشـدا کـە لـە بنـەماکانی ئـاینی ڕاسـتی بردۆتە دەرەوە، بەڵام هەر لەو کاتەوە تا ئیمرۆش مانای ئەم ئاینەی بەشاراوەیی تێدا ماوەتەوە، کە مانای ئەو زەردەشتیە (مەجوسییە) یە لە هینـد و ئێرانـدا لە ناویدا دەژین.

# پێشەکی

ئەم توێژینەوەیە مەبەستی هێنانە دی دوو کارە: پیشاندانی ژیانی زەردەشت لە قۆناغە جیاکانیدا خستنە ڕووی پەیامە ئاینیەکەی. کە بنـەمای توێژینەوەکەیـە، کە بە قسە کردن سەبارەت بنەماکانی ئاین دەستی پێ کردووە، ئەویش سەرەتا بە قسە کردن لە بـارەی خـودا و نـاوو ئاوەڵناوەکـانی دەسـت پـێ دەکـات و، ئـەنجا حەقیقەتی جووتەیی (الثنائیـة) لە ئایندا و، بوونی فریشتەکان و، ڕۆژی دوایـی و، چەند بابەتێکی تری پەیوەندیدار بەم باسەوە.

دوای بنەماکان (الاصول) ڕوو لە باسـکردنی لقـەکانی (الفـروع) دەکـات و، تـێ ڕوانینی ئاینی لە مەڕ پاکژی لەش و دەروون ڕوون کردۆتەوە، پاشـان پەرسـتن وەکـو نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و پێکهێنانی خێزان و نزیك بوونەوە لە پەرستراو بە ئیش و کار وەکو جوتیاری چاودێری کردنی ئەو شتانەی پەیوەستن بە زەوییەوە وەکو گاوو سەگ.

بەڵام بەشی دووەمی لە توێژینەوەکە بەشی زۆری جەخت دەکاتە سـەر ڕێـڕەوی ئاینی زەردەشتی لە مێژوودا و، چۆن بە درێژایی چاخەکان تێکەڵی بیرو بڕوای جیا جیا لە یەکتر بووە و، لەوانەش کە گرنگترینیانە گرنگی دانە بە ئاگر بۆ ئاستی بـە گەورە دانان و، ئەوەش بە دینی ئاگر پەرستی (المجوس) ناونراوە و، ئێستا ئەم نـاوە

بۆتە ناوونیشانی ئەو[1]. کۆتایی توێژینەوەکە باسی باروودۆخی زەردەشتی یەکانی ئیمڕۆ دەکات لە ئێران و هیند کە ئاین گۆڕاوە بە ڕەوتی نەتەوەیی و، لەگەڵ ئاماژە کردن بۆ هەندێك لەو دیاردە خوا پەرستی و بڕوایانەی لە ناوید ماونەوە.

---

[1] خۆرهەڵاتناس کریستین لە کتێبی (ایران در زمان ساسانیان/ل: ٥٥) دا دەڵێ: (ئاینی کۆنی ئاریەکان لەژێر سەرپەرشتی هێزی سروشتی و توخم و تەنە ئاسمانیەکان دادەمەزرا).

(محمد معین) لە کتێبی (مزدیسناو ادب فارسی/ط٢/ل٤٣)دا دەڵێ: (ئێرانیەکان هەر لە کۆنەوە باسیان لە پڕە نسیبی خێر و شەڕ کردووە و، بە (خودا) و (شەیتان)یان ووتووە خودا، (ئەهریمنان) وە کاری چاکەیان وەکو ڕووناکی و باران داوەتە پاڵ خواو، کاری باری خراپیش وەکو تاریکی و بێ بارانی دەیاندایە پاڵ خودا و، ئاگریان لە بنەڕەتدا بە کچی ئاسمان داناوە کە بروسکەیە. . . . . ).

(دوزمیل)ی خۆرهەڵاتناس لە کتێبی (تاریخ تمدن ایرانی) بە فارسی کە کۆمەڵێ خۆرهەڵاتناس نووسیویانە دەڵێ: (ئەوەی ڕاستی بێ زانیاریەکانی زەردەشت گەشەندە و ئازایانە بوو، بەڵام ئاینەکەی دوای ئەو چارەنووسی وەکو ئاین و مەزهەبەکانی تری لێ هات).

زەمەخشەری لە (تفسیر الکشاف) سەبارەت بە ئاینی باب و، باپیرانی ئیبراهیم (علیه‌السلام) دەڵێ: (ئازەری باوکی و گەلەکەی بت و خۆر و مانگ و ئەستێرەیان دەپەرست). دیارە ئەم ڕاستیانەش لە قورئاندا باس کراوە و ڕوون کراوەتەوە: (إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَوْثَانًا وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا. . . . ) العنکبوت/. . . . واتە: جگە لە خوا چەند بتێ دەپەرستن و بوختان هەڵدەبەستن. لە سورەی (الانعام/٧٥-٨٣)دا ئاماژە بە پەرستنی هێزە سروشتیەکان دەکات کە ناو گەلی ئاری و بابلی دا بووە (فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَى كَوْكَبًا قَالَ هَذَا رَبِّي. . . . . ). واتە: کاتێ شەو تاریك داهات هەسارەیەکی بینی، ووتی ئەمە پەروەردگاری منە.

ئەم ئاخافتنەی ئیبراهیم بۆ گریانکاری و ئەگەرە، نەك قۆناغێ بووبێ لە قۆناغەکانی بڕوای ئیبراهیم وەکو هەندێ لە نووسەران و زانایان وایان لێك داوەتەوە. پەرستنی دیاردە سروشتیەکان نەك هەر لای گەلی ئاری و بابلیەکان پەرستراوە، بەڵکو لای هەموو گەلان پەرستراوە لە دێریندا وەکو گەلی فارسی و، عەرەبی و، فارسی و، یۆنانی و، هیندی و، میسری. بۆ زانیاری پتر بڕوانە (الطبیعة في القران الکریم/د: کاصد یاسر الزیدي).

## ( دەروازە )

بیرۆکەی ئەرك خستنە سەرشانی خودایی، کە ویستی خوای گەورەیە بۆ هەر کارێ کە لە سەر مرۆڤە و دژواری و ناخۆشی تێدایە کاری گەرییەکی لە سروشت و جۆری مرۆڤدا پەیدا کرد کە بە دوو کارەوە لە بوونەوەردا دەربکەوێت:

١- ئەرکێکەوە کە کردی بە جێنشین و جێگری خوایی لە زەویەکەیدا.

٢- بە سیفەتێکەوە کە پەیوەندی بوونی بە خوای گەورەوە بۆ بکات بە تایبەتمەندیەك بۆ کەسی تر نەبێ، کە سیفەتی ئەرك پێ سپێراوە، واتە (المكلف).

ئەرك و سیفەت هەردووکیان بۆ مرۆڤ پێویستن و، لێی دانابڕێن و، هەتا ژیان بەردەوام بێ لێی جیانابنەوە، بەڵام پەیوەست بوونەکە بۆ ئەو، خستیە گۆشەیەکەوە کە لەو زیاتر کەسی تر بەشداری تێدا نەکات و، ئەوەش وەکو ڕێز لێنان و بەرزکردنەوەی ئەو بە سەرپەرشتی تردا، لە کاتێکدا بە پێویست دەمێنێتەوە بۆ ئەوو، ئەو زۆر ناچار کراوە بۆی کە ئەمەش بناغەی ئەوە لە سروشتی دا، سیفەتەکەی لێ جیا دەبێتەوە، هۆی ئەو جیابوونەوەیەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە پەیوەست کردنی مرۆڤ بەو ئەرکانەوە، کە پێی سپاردوون ئازادی و سەرپشکییەکی (الاختيار) فراوانی تێدایە، دوور لە هەموو جۆرە تۆبزی کردن و ناچار کردنێك، بۆیە لە تەکلیف کردن و ئەرك سپاردن بە مرۆڤ ناوترێ ئەو ناچار کراوە یان سەرپشکە، بەڵکو ئەوە بۆ ڕێز و پایەی ئەو شایستەیە، کە بووترێ لەگەڵ ناچار کردنیشدا ئەو ڕوو لێ نراوە و ئەرك پێ سپێراوە[1] لەسەر ئەم بناغەیە مرۆڤ دەتوانێ

[1] لێرەدا نووسەر ئاماژە بە قەزا و قەدەر و، کردەوەکانی مرۆڤ دەکات ئایا مرۆڤ لە وەرگرتنی ئەرکە خواییەکان و قەزا و قەدەردا ناچار کراوە یان سەرپشکە و، نووسەر وای بە شایستە دەزانێ کە مرۆڤ لە بەرامبەر ئەمەدا نە سەر پشکە و ئازادە و، نە ناچار کراویشە بەڵکو لەو نێوانەدایە. ئاشکرایە لە بیرو دیدەی موسڵمانان لە مەڕ قەزا و قەدەر و کردەوە و ئەرکەکانی خوایی لەسەر مرۆڤ جۆراوجۆرە. هەندێ لە=

ئەرکی سەرشانی خودایی پەسەند بکات و، لە هەمان کاتیشدا پەسەندی نەکات و ئەگەر بە دڵی خۆی و بێ ناچار کردن پەسەندی بکات، بەر لە هەموو شتێ پێویستە بڕوا بە خوا بکات بەو سیفەت و جێ ناوەی ڕایگەیاندووە و، ویستوویەتی بیکات بە تەوەرێ بە تەواوی پەیوەندییە ئەرك پێ سپاردنەکەی، ئەمەش سیفەتی بەدیهێنەری ئەرك پێ سپێرە.

بەڵام ئەگەر هەر بە ویستی خۆی ئەرکە پێ سپێراوەکە پەسەند نەکات هیچ ئەرکەکانی ناکەوێتە سەر.بەڵام پەسند نەکردنی مانای بەدرۆ خستنەوەی خودای گەورەیە لەوەی کە لە بارەی خۆیەوە ڕایگەیاندووە و، ئەمەش دەبێتە هۆکارەکانی تەواو بۆ ئەگەری نەبوونی دامەزراندنی هیچ پەیوەندییەك لەگەڵ ئەوو خوای گەورەدا و، بە سیفەتی تایبەتی جیا دەبێتەوە.

بە ڕاست دانان سادەترین مانای ئەوەیە کە ئەو هەواڵەی خوا ڕایگەیاندووە بە ڕاستی بزانێت و، حوکمی بە ڕاست دانانی هەواڵەکە بدەیت، بەرزترین بە ڕاست

---

=زانایانی عەقیدە و بڕوا پێیان وایە مرۆڤ ناچار کراوە و، هەموو ئەو کارانەی بەسەر مرۆڤدا دێ لە ئەزەلدا بۆی بڕیار دراوە و، مرۆڤ ناچارە ئەنجامیان بدات. هەندێ دەڵێن: خوا کارەکانی خۆی بە مرۆڤ سپاردووە و، چیان بوێ ئەوە دەکەن و، خوا دەسەڵاتی بە سەر کارەکانی ئەواندا نییە.

گرۆپی یەکەم بڕوایان بە (الجبر) هەیە و، گروپی دووەم بڕوایان بە (التفويض) هەیە.

گروپی تر هەیە بە ناوی سەرپشکەکان (الاختياري) کە دەڵێن: مرۆڤ سەرپشکە و، خوا لە ڕێگای پێغەمبەرانەوە چەند کارێکی بە مرۆڤ سپاردووە کە بیکەن و هەندێکی لێ قەدەغە کردوون و، فەرمانی پێ کردوون کە گوێڕایەڵی بکەن. دوای ئەوەی توانا و ویستی پێداون سەرپشکی کردوون لە کردنی هەر کارێکدا بێ ناچار کردن.

هەندێ لە زانایانی هارچەرخ دەڵێن: کردەوەکانی مرۆڤ دوو بەشە خۆویست و خۆ نەویست، مرۆڤ لە بەرامبەر کردەوە خۆ ویستەکان بەرپرسیارە چونکە خۆی دەتوانێ بیانکات و نەیان کات وەکو کاروباری عیبادەت و چاکە و خراپە. بەڵام لەبەرامبەر کارە خۆنەویستەکان بەرپرسیار نییە، بۆ نموونە کاتێ مرۆڤ بە ناچاری دێتە دنیاوە و، نەخۆش دەبێ و، دەمرێت و، زیرەك دەبێ و تەمبەڵ دەبێ لەم جۆرە کارانەدا بەرپرسیار نابێت چونکە دەسەڵاتی بەسەریاندا نییە. (وەرگێڕ)

دانان و بڕواپێ کردنیش ئەوەیە سەر بەخۆ لە سینەوە بێتە دەر کە بە ئاستی دڵنیا بوون و یەقینی زانستی بگات و لە شێوازی زانستی ڕووتی خۆیەوە بگۆڕێ بۆ بڕوایەکی قایم و پتەو کە بە هیچ شێوەیێ گومان هەڵنەگرێت وە ئەوەش مانای بڕوایە. چونکە بڕوا جووڵەیەکی دڵییە لە مرۆڤەوە بە مەبەستی خۆ دانە پاڵ خودای گەورە و پەیوەست بوون پێیەوە بەو سیفەتەی خوای شکۆدار دەیەوێت: بۆیە ئیمان بە جۆرێك لە ڕوو لێ نانی خوایی دادەنرێ و، مرۆڤ بە سیفەتی ڕوو لێ نراوو تەکلیف لێ کراو وەری دەگرێ و، بەمە دەرگای پلەی ڕێز و، زێدە باشی، ئەوەی لە بوونی دەرەکیدا دەردەکەوێ لە بڕوا پێ کردن و بە ڕاست دانان (ئیسلام)ە، چونکە بە بڕوا مرۆڤ پاڵ دەدرێتە لای دروستکەرەکەی و، لە گشتییەتی دروستکراواندا بۆ تایبەتمەندییەتی پەیوەندی دەگوازێتەوە. ئەنجا پەیوەندییەکی تووند و هەمیشەیی لەگەڵ خوادا پەیدا دەکات. ئیسلامیش ڕواڵەتی دەرەکی ئەو خۆدانە پاڵ و ئەو پەیوەندییەیە، بۆیە واتاکانی پەسەند کردن و دان پیا نان و مل کەچ کردن و خۆسپاردن دەگرێتە خۆی و، هەموویان بۆ بڕوا دەگەڕێنەوە کە تەوەری پەیوەندی ئەرك پێ سپاردنە.

به هەر حاڵێ بە سپاردنی ئەرکی خوایی بە مرۆڤ و پەسەند کردنی ئەرکەکە لە لایەن مرۆڤەوە ناونابرێ بە ئیسلام، واتە دوای دان هێنان نەبێ بە خوای گەورە و، گەواهی دان نەبێ بە سیفەتێ کە تایبەتی ترە لە سیفەتی دروستکەر، کە سیفەتی ئەرك سپێرە (المكلّف) و،بە بێ دان هێنان و خۆ دانەپاڵ خودا و پەیوەندی کردن بەوەوە ناوی ئیسلامی بە زۆر و ناچاری ڕەش دەبێتەوە. لە ئاکامی ئەمەدا تەواوی واتا بەرزەکان لادەچن کە مرۆڤ دەتوانێ بە بڕوا بە دەستیان بێنێ و، پایەکەی بۆ

ئاستی شتی نزمتر لە خۆی دادەبەزێ تا یەکسان دەبێ لە گەلێداو، زۆر جار عەدەم و نەبووندا یەکسان دەبێ و، ئەوەش مانای ئاشکرای بڕوا بوونە. ئایینی ئیسلام بەم مانایە لە تەواوی ئاینە ئاسمانیەکاندا دەرکەوت، وە لە لای هەموو پێغەمبەران و ڕەوانە کراوانی خوایی کە قورئانی مەزن هەواڵی داون، بەڵام ئەو پێغەمبەرانەی ناویان لە قورئاندا نەهاتووە، ناوی ئیسلام دەرکەوتووترین مەسەلەیە کە بابای لێکۆڵەر لە ئاینی زەردەشتیدا بەرەو ڕووی دەبێتەوە، ئەوەش لە دوو ڕووەوەیە:

گەواهی دان بۆ خوای گەورە بە سیفەتەکی تایبەتی تر لە سیفەتی کردگار (الخالق) کە سیفەتی خوای پەرستراوە، واتە: دان پێدا هێنان بەو بە سیفەتی ئەرك پێ سپێر (المكلّف). دەروون گەیشتن بە لوتکەی کە ماڵی و تەواو بوون بە خوا پەرستی نەبێ تەواو نابێ واتە بە تەکلیف و پێ سپاردنی ئەرك.

بەڵام دروشمەکانی ئیسلام لە ئاینی زەردەشتی دا لەگەڵ بوونی ئەو مانایە بە ئاشکرا لەناویدا بە هۆی لادان و گۆڕین لە دوای چەند چەمکێکەوە داپۆشراوە کە پەیوەندی بە سروشتی ئاسمانەوە نییە. بەهۆی لە یاد کردنی و بێ ئاگایی تێکەڵ بە چەند بڕوایەك بووە کە بە هیچ شێوەیێ پەیوەندی بە ئیسلامەوە نییە. ئەوەی ئیمڕۆ لە ئارادایە هیچ ئیسلامەتییەکی تێدا بەدی ناکرێ، هیچ ڕاستیەیەکی تێدا ناخرێتە دەست تەنیا بە هۆی ئیسلامەوە نەبێ کە دوا ئاینی خودایە.

لەبەر ئەوەی هەموو ئاینەکی خوایی ئیسلامە و، خودایە بەپێی ئەوەندەی خەڵکی پێویستی پێ هەبێ ڕەوانەی کردووە و، پاشان خوای گەورە پەیامی ئیسلامی بە محمد (ﷺ) مۆری کۆتایی لێ دا، تا ببێ بە بناغەیەك بۆ سەرجەم ئاینەکان و، لە هەمان کاتیشدا تا لەگەڵ هەر ئاینەکەدا مامەڵەیەکی تایبەتی بکات، ئەوەش لە بەر بوونی ئەو تایبەتمەندییەی لە ناویدا ماوەتە بۆ خەڵك لە پەیوەندی بە خوای گەورەوە.

ئەم بەندانەی دێن تەقەلایەکە بۆ هەڵماڵینی پەردە لەسەر هەندێ مانای ئیسلام لە پەیامی زەردەشتدا بۆ خەڵکی ماد و فارس بەر لە پەیدا بوونی مەسیحد (علیەالسلام) بە (٦) سەدە.[1]

[1] لێرەدا چەند تێبینییەکی گرنگمان هەیە لەسەر ئەم چەند دەستەواژەیەی نووسەر کە سەرنجی خوێنەرانی بۆ ڕا دەکێشێت:

نووسەر لە دایك بوونی دینی زەردەشت بۆ (٦٠٠) ساڵ بەر لە زاین دەگێڕێتەوە، بەڵام مێژوو نووسان هەموویان لەسەر ئەم ڕایە نین بەڵکو لە دایك بوونی زەردەشت بۆ (٦٠٠-٦٠٠٠) ساڵ دادەنێن.

محمد گۆیەی لە کتێبی (زەردەشت) دا دەنوسێ زەردەشت کوڕی دەغدوڤای کچی ئیبراهیم خەلیل بوو، بەم پێیە دەبێ مێژووی زەردەشت زۆر کۆنتر بێ لەم مێژووەو، ئیبراهیم (علیەالسلام)، ئەنسکلوپیدیای یەهود بەرواری لە دایك بوونی ئیبراهیم بۆ (١٥٠٠-٢٠٠٠پ. ز) دەگێڕێتەوە.

(مسعود محمد) لە (لسان کرد) و محمد ئەمین هەورامی لە کتێبی (فەرهەنگی ئیریەن قەج)دا دوای لێکۆڵینەوەی زمانی ئاوێستا دەری دەخەن کە زمانی ئاوێستا زمانی ماددی بووە کە باپیرەی کوردەکانن. هەرو (محمد گۆمەیی) نووسیوەتی کە دەغدوڤا مێردی بە کوردە سەرۆك خێڵەکانی موکری دەکات بە ناوی (پوراستەسپە) و، باوکی ناوی (سپیسمان) بووە و، زەردەشت لەو پەیدا بووە.

لە (قاموس کتاب مقدس/مستر هاکس) دا ئیسماعیلییەکان نەوەی میدیەکانن (madai) و، لە نەژادی (یافث)ی کوڕی نوحن (علیەالسلام). وە لە (٦٠٦پ. ز) دا دەوڵەتی ئاشور دەڕوخێنن و حوکمی دونیا دەکەن و، (سفری ئەشعیا)ش (١٣/١٧-٢٢) ئاماژە بەمە دەکات. کە لە(٥٥٠پ. ز) دا بە دەستی فارسەکان ڕووخاوە. (مسعود محمد) دەڵێ: میدیەکان یان مادیەکان باپیرەی کوردەکانن هاوسنووری فارسەکان بوون کەوتوونەتە باکوری خۆرئاوایان و، تا دەگاتە باشوریان، یەکەم کەس کە ناوی مادی داوە لە کتێبەکانیدا پاشای ئاشوری شلماسی دووەمە کە خاکی ماد (کوردستانی ئێرانی ئێستا) بووە لە ساڵی (٨٤٤پ. ز) دا داگیری کردووە).

هەروا دەڵێ: (زمانی ئاڤێستا بۆ واڵا بوونی بۆ زمانە ئاریەکان بە گشتی چەند وتووێژەکی هەیە و، هاوشانی سنسکریتیە و، نزیکە کە دایکی یان دایەنی فارسی کۆن و پەهلەوی ئێو، لە بۆچوونی ئێمەدا بناغەی کوردییە و، هیچ زمانەکی ئاری نییە پەیوەندی بە ئاڤێستاوە نەبێت).

بەڵام محمد ئەمین هەورامی لە (فەرهەنگی ئیریەن ڤەجدا) دا دەڵێ: (لە زمانی ئاڤێستا و زمانی کوردیدا، لایەکی نزیك و وێکچوون لەنێوان وشە و موفرەداتیان دا زۆر زۆرە، زۆرترە لەوەی ئەو وێکچوونە کە هەیە لە نێوان هی ئاڤێستا و هەر زمانەکی تری ئێرانیدا).

زانایانی بەرزی تازە کە دەڵێن: زمانی کوردی لە دایك بوونی زمانی میدییە، پرۆفیسۆر (ڤلا دیمیر مینورسکی)یە کە دکتۆر (کمال مظهر احمد) وەری گێڕاوە. بەڵام نووسەری کتێبی (زەردەشت و زەردەشتیەکان) ئەم زانیارییانەی فەرامۆش کردووە، هەر بۆیە بە پێویستمان زانی تیشکێ بخەینە سەر ئەم مەسەلەیە تا خوێنەرانی بەرێزی کورد لێی بێ ئاگا نەبن. (وەرگێڕ)

# بەندی یەکەم:

## (زەردەشت: پێغەمبەر و پەیام)

ناوی زەردەشت لە زمانی فارسی کۆندا زاراشسترا (zarathustra)یەو، لە زمانی پەهلەوی دا هەمان خوێندنەوەی هەیە و، لە قۆناغی ناوەڕاستی فارسیدا بووە بە (زار تهسترا) و، پاشان یۆنان گۆڕیویەتی بە زراسترو، پیتەکانی دوایی ناوەکانی پەهلەوی هەمیشە هەمزەدارە، واتە نزیکە بە (مەنصوب) بخوێنرێتەوە، بۆ دەرخستنی ئەم دۆخە لە لاتینی تازەدا ئەلف دەنووسن، بەو پایە ئەلفی دوایی لە (زراتهسترا) بە دەنگێکی شێوە (مەنصوب) واتە (سەرە)ی هەبێ دەخوێندرێتەوە..

کتێبە فارسیەکان بە خوێندنەوە و لەهجە و زاراوەی جیا جیا وشەکە پێشان دەدەن، بەڵام بە گشتی لەگەڵ خوێندنەوەی پەهلەویدا وەکو یەکن کە ناوەکە بە تای خاوەن سەر (التاء المفتوحة) قسەی پێ دەکرێت، بەڵام نوسراوە ئیسلامیەکان وەکو پەهلەویەکان بە تای مەفتوحە دەیخوێننەوە.

مانای ناوەکە لێ پچڕاندنی زەحمەتە، بەڵام لە ئەنجامی بەراورد کردندا لە میان فارسی کۆن و تازەدا دەسەلمێ کە وشەی (ustra - ئیسترا) یان ئوستر بە مانای وشتر دێت و، لە فارسی نوێدا بە هەمان واتا دێت، لەگەڵ بوونی جیاوازی کەمدا لە دەربڕینی وشەکە و شێوەکەیدا.

زەحمەتی و دژوارییەکە لە وشەی (zarath) دا دەمێنێتەوە، بە تایبەتی لە پیتی (ثاء)دا، ئەگەر ئەم پیتە نەبوایە بیرت بۆ (زەرا) دەچوو کە مانای (زێڕە) و، مانای ناوەکە دەبوو بە خاوەنی وشترە زێڕ[1].

وە ئەم مانایەش ئەگەری دوورە و، (زەرا) لە مانای پەهلەویدا بە چەندان واتای جۆراو جۆر دەگۆڕێ و، تا ئیمڕۆ لەسەریەك واتا نەماوەتەوەو، جارێ بە مانای پیری دێ و، ئەم ناوە لێکدراوە لە دوو ووشە پێك دێ کە مانای (خاوەن وشترە پیرە دێت)و، جارێ بە مانای زەرد و، یان خێرا دێ و، هزر بۆ واتای (خاوەن وشترە زەرد، یان وشتری خێرا دەبات) .

بەشی یەکەم لە ناوی (زراث zarath) مانای تری جگە لەمەش هەیە، ئەمەش بۆ نادیاری ووشە دەگەڕێتەوە بە هۆی خوێندنەوەی بە شێوەی جیا جیا و گۆڕاو، ووشەکە لە چاوگی ترەوە کە کرداری ڕانەبردوو (فعل المضارع) هاتووە وەك: (سزای دەدات) یان (دژیاری دەکات - یعاکس) وە ناوەکە بۆ (سزا دەری یان دژیاری وشتر) وەرگەڕاوە.

---

[1] لێرەدا نووسەر بێ ئاگایە لە زمانی ماد یان کوردی، یان لەبەرئەوەی وێك چوونێ هەیە لە میان ئەو زمانە و زمانی فارسی و پەهلەویدا، بۆیە هیچ ئاماژەیێ بە زمانی ماد ناکات کە ئاڤێستای پێ نووسراوەتەوەو، زمانی کوردی کۆنە و، زەردەشتیش وشەیەکی مادییە و، لە ناو کوردا (زار تهسترا) زەردەشتیە و، ئەمەش ناوی ڕاستەقینەی ئەوە و، لە کاتی وەرگێڕان و گواستنەوەدا گۆڕان بەسەر ناوەکەدا هاتووە. لێرەدا لێکدانەوەی وشەی (زەردەشت) بە خاوەن زێڕ، یان خاوەنی وشتری زەرد شیاو نیە بۆ پێغەمبەرێك بەلکو مانای تری بەرزی هەیە کە تا ئیمڕۆ نەزانراوە. دیارە کە نەك هەر ناوی زەردەشت مانای نادیارە بەلکو زۆر لە پێغەمبەران ناوەکەیان دیار نییە مانای چییە، بۆ نموونە (ابراهیم) هەندێ دەڵێن: ناوەکی کوردییە واتە (جوان بوو)، هەندێ دەڵێن: ناوەکی عەجەمی نادیارە.

یان (اسرائیل- یەعقوب) هەندێ دەڵێن: واتە: شەوڕۆیی کەرو، هەندێ دەڵێن: واتە بەندەی خوا. یان (اسحاق) هەندەك دەڵێن: وشەکی عیبرییە واتە: پێدەکەنێ و یان (لوت)یان (اسماعیل) یان (نوح) هیچ کام مانای تەواویان نەزانراوە. (وەرگێڕ)

ئەم ووشەیە بە مانای ئـەوەش دێ ڕایـدێنێ - مەیتـەری دەکـات - بـەڕێوەی دەبات و دەیگرێ و بەکاری دێنێ. ئەم ووشانە پێکەوە ئەگەر لێـك بـدرێن، چـەند واتایەك پێك دێنن، ڕاست ترینیـان بـە (ڕاهێنانـە دی وشـتر - سـائس الجمـل - الجمال) دێت.

ناوەکە بۆ گەلانی هاوسێی فارسەکان گوازرایەوە، بەو مانایەی کە جارێـك لـە لێکدانەوەی ڕابردوو نزیك بێ و، جارەکی تر لێی دوور بێ و بەپێی ئەو مانایە بـێ کە وەرگێڕ لێی تێگەیشتووە، ئەنجا بە واتای وشتری سوور و، بـە مانـای ڕوونـاکی زێڕین و، ئەستێرەی پرشـنگدار هـاتووە، یـان (زێـڕی دەشـت) و، زێـڕی پاشـا و، شانـشینی زێـڕو، شـوێنی خۆشوشـتن بـە زێـڕ (المغتـسل بالـذهب)، ناوەکـە لای یۆنانیەکان بە (ئەستێرەی زێڕ) واتاکەی دامەزرا. ئەمەش دوورترین لێکدانەوەیە بۆ زمانە سەرەتا و بنەڕەتەکەی.

خەریکە کۆڕا لەسەر ئەوەبێ، کە زێدی زەردەشت ئێرانی بـاکور بـوو بـێ واتـە ئازەربیجان[1]، کە یەکێ لەو ناوچانە بووەکە هۆزی میدی (madia) لێـی ژیـاوەو،

[1] بێگومان بۆ زێدی لە دایك بوونی زەردەشت زۆر شوێن گوتراوە بۆ نموونە: خاوەنی کتـێبی (مزدهـاروز) وەکو (صديق الدملوجي) لە (امارة بهدينان) دا باسی کردووە بڕوای وایە ئـەم پێغەمبـەرە مەزنـە لـە گوندی دارین کە دەکەوێتە ناوچەی زەراریا پەیدا بووە) و باوکی ڕەوەند بووە لە هۆزی موکریان بووە.

وە هەندێکی تر دەڵێن: لە (هەزار مێر) کە (١٣) کم لە ڕۆژئاوای سلێمانیەوەیە پەیدا بـووە، وەك لـە زمان و ئەدەبی کوردیدا) پۆلی چوارەمی گشتیدا (چ١/٢٠٠١ز) دا هاتووە.

زۆر شوێنی تر باسکراوە کە هزر و، زانایان پەسەندی ناکەن و، مێژووش شەرعییەتی پێ نادات وەك فەلەستین و شوێنی تر.

هەندێکی تر دەڵێن زەردەشت خەڵکی ورمێ بووە و هەر لەوێ دەستی بە بڵاو کردنەوەی بانگەوازی کردووە.

ئەمـــەش لـــە (مێـــژووی کـــورد/پـــۆلی دووەمـــی ناوەنـــدی/دانـــانی لیژنـــەکی پـــسپۆڕ/١٩٩٩-٢٠٠٠/چ١/هەولێر) داهاتووە، هەروەها لە کتێبی (مهد البشرية/ دبليـو، أي، ويگرام و ادگـار. بـێ. ای. ویگرام/ل: ١٦٥)دا.

زەردەشت دەدرێتە پاڵ ئەوانە و، ئاڤێستا بە هەموو ئەو ناوچانەی گەلانی ئاری لەناودا ژیاوە دەڵێ (ئێوەن ڤەچ airyana vaeja) . خوای گەورە بەزەردەشتی فەرموو، کە ئەم ناوچەیە ئاوا وەسف دەکات: (هەموو شوێنەکم کردۆتە شوێنی بە دڵ بوون و شانازی کوڕەکانی، ئەگەر خۆشی و شادیشی تێدا نەبێ و، ڕووت بێ لە قەشەنگی و جوانی و، زەردەشت! ئەگەر هەموو خاکێ نەکەم بە شوێنی بە دڵ بوونی کوڕەکانی هەموو خەڵکی ڕوو دەکەنە ئێریەن ڤەچ یەکەم و باشترین ناوچە کە من خوام دروستم کردووە).

ئەم شوێنە وەك قەزوینی دەست نیشانی کردووە لە نێوان بەلخەوەیە تا کۆتایی ئازەربیجان و ئەرمینیا و تا قادسیە و، تا دەریای فارس و، پاشان وەسفی دەکات: (ئەم سنوورە هەڵبژاردەی خاکی منە و پیرۆز ترینیانە و چونکە دەکەوێتە دڵی هەرێمەکانەوە و دواى ئەوە خەڵکی خۆرهەڵات و، خۆرئاوا و باشور و باکور تووشی ئازار دەبن پێی).[1].

لە بارەی خەڵکەکەیانەوە دەڵێ: (خاوەنی هزری ڕاستن و، بۆچوونی دروستن و، لەشیان ساغە و، ڕەوشتیان جوانە و لە پیشەسازیدا داهێنەرن، بۆیە دەیان بینی ڕوویان لە هەموو خەڵکی جوانتر و، لەش ساغترن و، بەرگی جوانتر دەکەنە بەرو، ڕەوشت شیرین ترن و، شارەزاترن لە بەرێوەبردنی کارەکاندا).[2]

---

[1] لە کتاب المقدس/سفر التکوین/٢/١١-١٥) ئاماژە بە زێدی ئادەم دەکات کە چوار ڕووباری پێدا هاتووە فشون و، جیجون و، حیداقل و، فورات). وە لە (سفر التکوین/٨/١٥) دا دەکات کە کەشتی نوح لەسەر ئەرارات دا نیشتۆتەوە: (واستقر الفلك على جبال اراراط).

لە قورئانی پیرۆزیشدا ئاماژە بە خاکی ئاری یان میدی دەکات و دەفەرمێ: (وَقُلْ رَبِّ أَنزِلْنِي مُنْزَلاً مُبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ الْمُنزِلِينَ) المؤمنون/٢٩. واتە: بەڵێ پەروەردگارم لە شوێنەکی پڕ بەرەکەتم دابەزێنە تۆ باشترین دابەزێنەریت.

(وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ). هود/٤٤. واتە: لەسەر جودی دابەزی. ئاشکرایە جودی چیایەکی زنجیرە چیاکانی ئەراراتە لە کوردستاندا.

[2] وە لە (کیتاب المقدس/سفر اشعیا/١٣/١٨-٢٢)دا باس لە گەلی مادد و، ئازایەتی و پیاوەتییان دەکات: (ها أنا اثیر علیهم المادیین الذین لا یکترثون للفضة ولا یسرون بالذهب. . . ). =

زۆربەی مانای ووشەی (ئیر) کە ناوی هەرێمەکەی لێوە پەیدا بووە بە ناوی پاکی و شەرەف و سەر بڵندی و پایەداری یە، چونکە ووشەکە لە فارسی کۆندا

---

=وە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە: (قُلْ لِلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَى قَوْمٍ أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ). الفتح/١٦. عەللامە (ابن کثیر) لە (تفسیر القران العظیم)دا دەڵێ: (قوم أولي بأس شدید هم البارزون).

وە لە فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) کە (متفق علیه)یە هاتووە: (ولا تقوم الساعة حتى تقاتلوا قوما نعالهم الشعر).

واتە قیامەت نایەت تا شەڕ لەگەڵ گەلێك نەکەن کە کاڵەك بە موون. لە (اقتران النیرین/ج٣/مەلا ڕەشید بەگی بابان) دا هاتووە کە ئەم ناوچەیە کوردستانە و کوردەکانن.

محمد مەردۆخی دەڵێ: (کوردەکان بینیان و تێفکرین کە ئەم ئاینە تازەیە بە تەواوی موافقی تەبع و وجدانیانە لەبەر ئەوە بە ئاسانی بەرە بەرە قبوڵیان کرد).

وە گەلی کورد خاوەنی زۆر بیر تیژی گەورە و سەرکردەی گەورەیە و، مێژو بە بەرز و کەڵەپیاو ناوی هێناون وەکو: (عبدالقادر گەیلانی و، ابن تیمیە و، ابن حجر و، ابن اثیر و، ابن خلکان و، ابن صلاح شارەزووری و، سەلاحەدینی ئەییوبی و، سەید جمالەدینی ئەفغانی و، شێخ محمد عەبدە و، شێخ سەعیدی پیران و، شێخ سەعید نەورەسی و، شێخ عەبدوڵلای دەهلەوی و، شێخ مەحموود و،. . . هتد) کە خزمەتێکی بێ وێنەیان بە ئیسلام کردووە.

وە (الجاوشلی هادی رشید) لە کتێبی (التراث التأریخي للقومیة الکردیة /ل٦٦)دا دەنووسێ کە لەسەردەمی خەلافەتی عومەری کوڕی خەتتابدا بەر لە گەیشتنی سوپای ئیسلام بۆ ناوچەی باشووری عێراق کوردەکان ئاینی ئیسلامی پاکیان وەك دین و بڕوا بۆ هەمیشەیی وەرگرت).

وە (عباس العزاوي) لە (عشائر العراق الکردیە/ل٢٨) دا دەڵێ: (مێژوو لە ڕێڕەوو ڕووداوە دوورەکانیدا بەڵگەی بەدەستەوە داوە کە ڕەگەزی کورد هەر لەو کاتەوە هاتۆتە دینەوە، دین گرنگترین ڕوکنەکانی بووە و، دڵسۆز بووە بۆ بڕواکەی و، بڕوا بەرزەکەی کاری تێ کردووە و پاشان بەشەکی زۆری لەشارستانی و، پلەیەکی پەسەندی وەرگرتووە. . . ).

گەشتیاری ئینگلیزی ریچ (رجلە الى العراق عام ١٨٢٠) دا دەنووسێ: (کەسم نەدیتووە لەش بەهێز و ساغ بن لەهەر دوو ڕەگەزدا وەك لە کوردستاندا دیتومە. . . . ).

بەو پێیە ئەو وەسفەی ئاڤێستا کردوویەتی بۆ گەلی میدی و زۆرەکەی لە نامە ئاسمانیەکانی تر وتەی زاناکاندا پشتگوێ نەخراوە و، ئاماژەی بۆ کراوە)..

ناوەکی گشتییە بۆ خێر و چاکە و باشی و، فارسەکان لەم ووشەوە بە سەرۆکی ماڵی ئاگر دەڵێن: (ئیریذ) واتە: سەرۆکی چاکەکاران و، ئەنجا ناوەکە بووە بە عەرەبی و گووتراوە (هتریذ)[1].

بە کۆی دەنگی زانایانی بڕوا پێ کراو لە بواری مێژوویی دا زەردەشت سەر بە هۆزی مادای یان میدیایە کە گەورەترین هۆزی ئارییە کە لە ناوچەی ئێریەن ڤەجدا نیشتەجێ بوون. پاشان بۆ هۆزی پارسا (parsa) یان پەرسیس پاڵ دەدرێن کە هاوشانی میدی بوون لە هێز و زۆری دا و، بۆ خێزانی ئەلیخانی زەمینە خۆش دەکەن کە ئێران لەیەك دەوڵەتدا کۆ بکەنەوە و، دینی زەردەشتی کردە دینی ڕەسمی دەوڵەت و، بۆیە زەردەشت لە بنەڕەتدا میدییە و، لە ڕەگەزدا ئارییە.[2].

بەڵام ئەگەر بمانەوێ ئەو کاتە دەست نیشان بکەین کە زەردەشتی تێدا پەیدا بووە ماددەی زانستی زۆر کە لەبەر دەستماندایە ئەوەندەمان پاریدە نادات کە بتوانین بە دڵنیاییەوە بە ڕاستی وەری بگرین، چونکە سەرچاوەکانی هەردوو لایان

---

[1] محمد امین هەورامی لە فەرهەنگی (ئیریەن ڤەج)دا لەسەر ووشەی ئەیر (aira) دەنووسێ: لە ئاڤێستا دا ووشەی (ئەیریا) بە مانای ئاریان هاتووە و، ووشەی ئەیریا لە بری ووشەی ئاریانی ئیمڕۆ هاتووە. لە پارسی کۆندا ئەو ووشەیە بووە بە ئاریا (aria)و لە سانسکریتیش دا بووە بە ئاریە(arya). ئەم ووشەیە وەك ناو بۆ ناوی گەلە ئێرانیەکان بەکاردێ واتە (نەجیب، نەژاد باش، ڕەسەن) هاتووە. (ل: ٦٩). وە دوور نیە (ایران) لە ئاریەوە هاتبێ واتە خاکی ئاریەکانە خۆرهەڵاتناسان مێژوو نووسەکان هەندێکیان کورد بە ئاری ئێرانی دەزانن وەکو لە کتێبی (الكرد في دائرة المعارف الاسلامية/ مجموعة من المستشرقين) دا باس کراوە: (کورد لە بنەڕەتدا ئێرانین). (وەرگێڕ)

[2] لە کتێبی (الكرد فى دائره المعارف الاسلاميه) دا کە کۆمەڵێ خۆرهەڵاتناس نووسیویانە و (حەمە کەریم عارف) کردوویە بە کوردی لەوێدا هاتووە کە من لە عەرەبیەکەی وەرم گرتووە: (دەڵێ خالدی و کوردی و کۆرتی و کوردیا هەموویان یەکن و یەك مانا دەدەن. (بێ نرخ) لە کتێبەکەیدا لێکۆڵینەوەیێ دەربارەی کوردی ئێران و باپیرەکانیان. . . . سانت بترز بوك ١٨٥٦)دا هەمان ڕای رایسکەی هەیە. وە (ام. هارتمان. نولدکە و ئەلیسباخ) کە چەند لێکۆڵەرێکن بە شێوەیەکی تر باسەکە دەخەنە ڕوو، ئاماژە بەمە دەکەن کە کورد و قرد و یەك ڕەگیان نییە و، دەڵێن: (کۆرتی) ئەم گەلە کە مێژوونووسانی یۆنانی کۆن بە بەشێ لە هۆزی مادو پارسیان داناون هەمان کوردی ئیمڕۆن. (وەرگێڕ)

پەهلەوی وساسانی پشت بە چەند هەواڵێ دەبەستن کە لە بناغەدا مێژوویی نین و، جێگای متمانە نین.

مێژووی لە دایك بوونی زەردەشت لە نێوان (٦٠٠٠پ.ز) و (٦٠٠پ.ز) دا دیاری کراوە و، ناشێ بە ئاسانی پەسەند بکرێ لەبەر دووری تەواوی لەو ماوەیەدا کە شاگشتاسب لە بەڵخ حوکمی تێدا کردووە. واتە لە نیوەی دووەمی سەدەی (٦پ.ز).

مێژوونوسە تازەکانی زەردەشتی حوکمی شاکشتاسب هەر لەو ساڵەوە هاتۆتە سەر دەسەڵات و، تا ئەو کاتە وەڵامی بانگەوازی زەردەشتی دایەوە وچووە ناو بانگەوازەکەیەوە کە بانگێشەی بۆ کردبوو....لەتەك ئەوەدا وەستان و کردیانە سۆنگەی بنەڕەتییان و، لەمەوە گەڕانەوە بۆ ئەو ساڵەی خودا سروشی بۆ کردووە و، وە لەوێشەوە بۆ هەتا ساڵی لە دایك بوونی، دوای چەند کردارێکی ماتماتێکی درێژ و ئاڵۆز پشت بەو ڕاستیە ناودارانە دەبەستێ لە مێژووی پێغەمبەرایەتی و پەیامەکەیدا. ساڵنامەیەکی نوێیان دانا بۆ دین و مێژووەکەی لەمەوە پوختەی مەسەلەکەیان ئاوا لێ کرد کت و مت پێغەمبەرەکەیان لە (١٩- مانگی خرداد کە هاوکاتە لەگەڵ ٣٠ مانگی مایۆی ٦٦٠پ.ز[١]. ئەم دیاری کردنە وردەی ڕۆژ و مانگ و ساڵەیە بۆ ڕابردویەکی زۆر دوور ئەمیش لەسەر سەرچاوەیەکی مێژوویی

---

هەندێ بڕوایان وایە زەردەشت ناوی موژومولهایە و، لە ڕەچەڵەکی فەرەیدونی کوردی دادەنرێت کە ئەم فەرەیدونە هەندێ مێژوونووس دەڵێن زولقەرنەین بووە کە لەگەڵ کاوەدا ئەژدیهاك لەناو دەبەن. ئەژدیهاك بەسەرجەمشیدا زاڵ بووە. (ابن کثیر /قصص الأنبیاء)دا ئاماژە دەکات ئە بڕوای وایە برای فیرعەونی میسر بوو بێت. بە پێی ئاڤێستا پێغەمبەران لە کێومەڕدن کە بڕوا وایە نوح بووبێ. وە بەر لە کێو مرد پێغەمبەران هەبوونە بە ناوی مهاباد واتە سەرکردە. ئەحزام کوڕی ئازەر هەیە کە ڕەنگە ئیبراهیم بوو بێت کە بە زەردەشتی سێیەم ناوزەد کراوە، کتێبی (سیرقملان تر بیت درا یران باستان) وەك ئیحسان نوری ئاماژەی پێ کردووە لە (مێژووی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد/ل٥٨)دا دەڵێ: کۆن بە پیاوانی ئایینی گوتراوە زەردەشتمە. . . . زەردەشتییەکان بڕوایان وایە مەهاباد پێغەمبەری یەکەمە و، هۆشەنگ کە ئاگری دۆزییەوە پێغەمبەری دووەمە و، زەردەشتی سێیەم ئیبراهیمە. بەم پێیە زەردەشتەکان زۆر بوونە و لەمەوە کێشەی لە دایك بوونەکان سەری هەڵداوە. (وەرگێڕ)

بڕوا پێ کراو دانەمەزراوە، بۆیە تەنیا سوودەکەی ئەوەیە کە بەو کاتەیەوە دەبەستێتەوە کە زەردەشتی تێدا ڕەوانە نەکراوە و، ئەو ماوە زەمەنیەش دیاری دەکات کە زەردەشت کەوتووەتە خۆی بۆ بانگێشە کردنی خەڵك بۆ ئاینی خودا و، ئەو توانایەشی هەیە کە بتوانێ نادیاری لەسەر سەردەمی نامەکە لاببات.

دیاری کردنی شوێنی لە دایك بوونەکەی بە کت و متی ئاسانە، چونکە تەواوی سەرچاوەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەو لە دەڤەری باکوری ئێران پەیدا بووە، واتە ئازەربیجان و، لە نزیك دەریاچەی ئۆرمیە urmia و، ووردتر لای خۆرئاوایەکەی و، لەسەر کەناری ڕووباری داریز یان ئاراس. ڕووباری ئاراس لە ئاڤێستا (الابتساق) دا شای ڕووبارەکانە و لە کتێبی زەردەشتییەکانی پاشینەدا بە ڕووباری پیرۆز ناوی هاتووە و، لەسەر کەنارەکە (پوراشاسپ) ماڵی خۆی دامەزراندووە، کە زەردەشتی تێدا لەدایك بووە.

لە دایك بوونی زەردەشت پڕە لە کۆمەڵە دیاردەیەکی نائاسایی گەلێ زۆر و، زۆر جار دەگەڕێتەوە بۆ بەر لە مێردکردنی دایکی کە (دەغدوڤا)یەو، پاشان بەر لە دایك بوونی بە چەند ڕۆژەکی ئەم کردارە نائاساییانە چڕ دەبنەوە و زۆرتر دەبن و زیاتر لادانیان پێوە دەبینرێت. ئەندێشەی میللی ڕازێنراوە بە کارو ئەرکی ناپەسەندی دوور لە هەموو نەریت و باوێکی خراوەتە سەر کە شایانی پێغەمبەرانی خوایی نیە وەکو زەردەشتی یەکان وەسفی دەکەن هەتا لە ڕیزی ئەفسانە میللییەکان دانراون کە لە ناوەندی گشتی دا بڵاو دەبنەوە لە پێناو شکۆدار ڕاگرتنی پێغەمبەرەکە و بە گەورە دانانی پلە و پایەکەی.

ئەوەی لەم دیاردانە دا بەلامانەوە جێگای بایەخە ئەوەیانە، کە پەیوەندی بە کاتی لە دایك بوونەوە هەیە و بەس، کە یاسای خوا وایە بۆ ئەو گەلەی ئاشکرا دەکات کە پێغەمبەری تێدا ڕەوانە دەکرێ وەك ڕاگەیاندن و مژدەیێ بە وان بە هاتنی پیت و فەڕەکەی.

ئەوانە چەند دیاردەیەکن ئەگەر لە مەڕ پێغەمبەرەوە بن وەکو چەند موعجیزە و پەرجووێك پێچەوانەی هزرنیە و، دوریش نییە لەوەی لە نەریتی خەڵکدا دامەزراوە.

بۆیە لە سەرچاوەکانی پەهلەویدا هاتووە کەبەر لە لەدایك بوونی زەردەشت بە چەند ساتێك ڕووناکی یەکی خوایی درەوشاوە لە ماڵی پوراشاسپدا دەرچوو، سروشت و دەوروبەری شادمان بوو، لە ئاسماندا دەنگ بیسترا مژدەی لە دایك بوونی دەدا و، لەو کاتەدا لەم ژوورە ڕووناکە خواییەدا زەردەشت وەك منداڵێ پەیدا بوو، پڕ بە دەمی پێ دەکەنی. وە لە قۆناغەکانی شێوان و داڕوخانی ئایندا هەندێ لەو ڕواڵەتانە خزێنراوەتە ناو دەقەکانی ئاڤێستاوە وەکو بەڵگە نیشاندانێ لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی زەردەشت و، مەزنی پەیامەکەی و، زۆرینەی پەیامەکەی چڕ دەبێتەوە لە بارەی شەیتان (ئەهریمەن) و یارانی کە هەوڵیان داوە دوای لە دایك بوون لە ناوی ببەن و، ڕاسترینیان کە پەسەند بکرێ ئەوەیە کە لە (فەندید) دا هاتووە: (داخەکەم زەردەشتی پاکژ لە ماڵی پوراشاسپ پەیدا بوو، ڕێ و شوێنی لەناو بردنی دەبێ چۆن بێت، ئەو ئەو چەکەیە بە زەبر لێمان دەدات و، بەڵای گەورەی ئێمەیە و، شەیتان پەرستی لەسەر زەوی لادەچێ و، درۆ و ساختەیی لەناو خەڵکدا لەبەین دەڕوا).

## منداڵەتی و لاوی:

لە کاتی گەیشتنی زەردەشت بە (٧)ساڵانە، باوکی وەك نەریتی خەڵکی ئەو کاتە زەردەشتی ناردە لای (گۆرۆ یورجین کروس)، ووشەی گۆورو لای میدییەکان پیاوەکی دانایە کە لە ڕەگەزی مەجوس بێت[1]. یورجین کورس بە دانایی و زانست و

[1] لە فەرهەنگی ئیریەن ڤەچدا (محمد ئەمین هەورامی) دا هاتووە: (گۆورو gouru) واتە: گەورە، قوڕس، سەنگین، زل، بەڕێز، سەرۆك، مەزن، گران هاتووە. لە پارسی کۆندا بووە بە گرانە (grana) و لە پالەویشدا بووە بە گەران (garan) یان گیران (giran).

ڕاپەسەند و، زانا بە زانیارییە هاوچەرخەکان ناوبـانگی دەرکـردووە و، سـەرنجگای قوتابیان و خوێندکاران بووە و، لە هەموو ئێرانـدا لـە لایـەن خولیایـانی زانیـاری شوێنی چاوتێ بڕین بووە.

زەردەشت (٨) ساڵی ڕەبەقی لەگەڵ مامۆستاکەیدا بردە سەر و، لەم ماوەیـەدا ئەوەی بڕیارە زانستەکەی سەردەمی خۆی خوێند و، فێری خوێندنەوە و، نووسـینی فارسی بووە و، بڕوای گەلەکەی بە بنەما و لقەکانیەوە لەبەر کرد و، ئەنجا ئـەدەب و وێژەی سەردەمی خۆی لە هەڵبەست و پەخشان خوێند و، دوایی گواسـتیەوە بـۆ فێر بوونی هەندێ کاری پێویست وەك چـارە کردنـی نەخۆشـان و، ئامـادە کردنـی دەرمان و پەروەردەی ئاژەڵان و، کشتوکاڵ و، وورد بوونـەوەی تـەواو لـە ناویانـدا چونکە خەڵکی زۆر پێویستی پێ هەبوون[1].

بە تەواو کردنی خوێندن تەمەنی زەردەشـت گەیـشتە (١٥) سـاڵانە و، دوایـی گەڕاوە بۆ زێدی لە دایك بوونی، تا بە شێوەیەکی ڕەسمی بڕواتە نـاو دیـنی بـاب و باپیرەکانی و، بەپێی نەریتی ئاینی ئاری کۆن بە ئامادە بوونی خزم و کەس و کاری ئاهەنگی ئاینی بۆ دەکرێ و، پشتێنەی (کوستی)بە بەژنی دەبەستێ، بـەو مانایـە ڕوخسەتی پێ دراوە کە سەردەمەکی نوێ لە ژیانی دینی و دنیایی دا بکاتەوە.

فارسە کۆنەکان پشتێنەی پیرۆزیان وا سەیر دەکـرد، کـە پەیوەسـت بوونـە بـە پەرستنی خوای گەورە.ئەوان لە تەقەلا و نەریتی هاوبەش پەیدا کردنەکەیانـدا زۆر بە (تەعمید)ی مەسیحیەکان دەچن.بە دابـەزینی سـروش بـۆ سـەر زەردەشـت لـە دیاردەی بت پەرستی خۆی داڕنی و، مانایەکی تازەی لە شوێندا دانـاوە، کـە ئـەو مانایە دەدات زەردەشت لە (١٥)ساڵیدا گفتوگۆی لەمەڕ ئەرك سپاردن و تـەکلیف

[1] خاوەنی کتێبی (مزد هاروز/شێخ حسن الداسنی) وەکو لە کتێبی (امارة بهدینان/صدیق الـدملوجي) باسی کردووە: (زەردەشت نەخوێندەوار بووە و، خوێندنەوە و نووسینی نەزانیوە). (وەرگێڕ)

لەگەڵدا کراوە[1]. بۆیە پێویستە - وەك دەبینین - لەسەر منداڵ بە سیفەتێ ئەرك پێ سپێراو (المكلف) گەواهی بۆ خودا بدات و، بۆ زەردەشتیش بە سیفەتی ڕەوانە کراوی یان نێردراوی خوایی، دوای ئەوە منداڵ دەبێتە بەرپرسیار لە هەر کارو کردەوەیەك کە لەو ڕوودەدات و، مانای تازە پێکاو پێکی ئەوەیە ئیسلام بڕیاری لەسەر داوە کە تەمەنی پێ گەیشتنی (البلوغ) کردووە بەو تەمەنەی خودا هەموو موسڵمانەکی تێدا بانگ دەکات بە ئەرکەکان کە بیانخاتە سەر شان.

لەبەرئەوە دەقەکانی ئاڤێستا (الابتساق) بەڵێنی دا هەر کەسێ کە تەمەنی بگاتە ١٥ ساڵی لە پیاوو لە ئافرەت و لەسەر زەویدا بە بێ پشتێنە بڕوات و هەر کەسێ پشتێنەکە توونـد نەبەستێ لەناو قەدیدا ئەوە سزای توندی دەدات و، هەر کەسێ وا بکات بڕوای ناتەواوە، یارمەتی شەیاتین دەدات بۆ تێك دانی دنیای چاکە و، ئەوانە کێشەیەکن چاوپۆشیان تێدا نییە و، چەند تاوانێکن هیچ شتێ ناتوانێ لە بوونەوەردا بەتاڵیان بکاتەوە یان ڕەشیان بکاتەوە.

بێگومان لێرە پەیوەندییەکی توند هەیە لە نێوان مانای ڕووت لە دیاردەی هاوبەشی پەیدا کردن و، نێوان هەمان مانادا وەك لە ئاپۆڕەی چاولێکەری پشتێنەدا دەزانرێت. بە درێژایی ڕۆژگار مەسەلەکە لە زەردەشتیان تێکەڵ بوو، لە نێوان دوو ماناکەدا جیاوازییان نەکرد، لەمەوە نەریتی کۆنی بەر لە زەردەشت گەڕایەوە، زۆر شتی تری لێ زیاد بوو کە بەشی زۆری لە واتا سەرەکیەکەی نزیك

---

[1] پێشتر ئاماژەمان کرد کە زەردەشت نەیخوێندووە، ئەنجا هەم خاوەنی کتێبی (مزدها روز) ئاماژە دەکات کە لە (٤٠) ساڵیدا سروش بۆ سەر زەردەشت هاتووە. خاڵەکی تر کە جێگای سەرنجە ئەوەیە کە پێغەمبەران لە ڕۆژی لە دایك بوونیانەوە تا مردن نابێ بکەونە ژێر کاریگەری خوانەناسی و شیرك و نەریتی ژینگەوە، خوا لە سەر زمانی ئیبراهیم (ع) دەفەرمێ: (وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَنْ نَعْبُدَ الأَصْنَامَ). ابراهیم/٣٥. واتە: من و کوڕەکانم بپارێزێ لەوەی بت بپەرستین. یان دایکی مەریەم دەپاڕێتەوە: (وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ) آل عمران/٣٦. واتە: من مەریەم و وەچەکەی بە هۆی تۆوە پەنا دەبەم لە شەیتانی ڕەجم کراو. (وەرگێڕ)

بێ، لە هەموویان جیاتر و بڵاوتر لای زەردەشتییەکانی ئێستای هیند و ئێران لەبەر کردنی کراسی سپییە (سەدرە susreh)یە.

سەرباری ئەو هەموو شتانەش ئاپۆرە و مەڕاسیمی چاولێکەری پشتێنی پیرۆز هەواڵ لە ڕێنموینی خوا پەرستی پاکژی خۆی دەدات و، لە کەلەپورەکی پەیوەندیداری قوڵ بە ئاین و ئاین پەروەرییەوە - التدین - وەرگیراوە، ڕاستە مەسەلەی پەیوەستی ئاینەکە بە سروشی ئاسمانییەوە بە درێژایی ڕۆژگار لاواز و کز بووە و، واتای خواپەرستی لە سادەیی و شکۆی خۆی خاڵی بووە، بەڵام پەیوەندی ئەو بە گەردەن کەچکردنی ڕەهاوە لە مەبەستەکەد دەردەکەوێ، کە بریتی یە لە ڕوو کردنە پەرستراو بەهزرێکەوە تواناکەی لەسەر حاڵی بوون و پەی پێ بردن تەواو بوو بێت. وە تەواوکردنی هزر - وەك دەزانین - مەرجەکی بنەڕەتیە لە مەرجەکانی وەرگرتنی سیفەتی تەکلیف کراوو، بەشێکە لە دروستی تەکلیف و، تەواوی ئاینە ئاسمانیەکانیش لەسەر ئەوە کۆکن.

هەموو ئەو شتانە ئەوە پیشان دەدەن کە فارسەکان بە گیانی ئاین تێر دەبن و زەردەشت لە گەلێکدا گەشەی کرد کە دەست گرتن بە ڕێبازەکی ڕەفتارییەوە زاڵ بێ بەسەریدا کە جووڵەی ژیان ڕێك دەخات و، ئاراستەکەی بەرەو ئەو دەبات، هەر لە منداڵەتی زووەوەوە بە ڕەوشتەکانی ئاین و نموونەی باڵاوە تێر بوو، کاتێ قۆناغی منداڵەتی گوزەر کرد و، بووە لاوەکی عەقڵ کامڵ و، هۆش و پەی پێ بردنی تەواو بوو، ئەو سیفەتەی لە هاوەڵانی جیای بکاتەوە سیفەتی ئاین پەروەری بوو لەسەر ئەو پاشماوەیەی مابۆوە لە ئاینی باب و باپیران ئەو دووریە دینییەی لە ناویدا مابۆوە کۆمەکی کرد بە خاسیەتی باش و، پاکژی و بەرزکردنەوەی گیان و، لەسەرووی ئەمەشەوە پەیوەندی باش بە خوای حەقەوە کە سەرچاوەی هەموو چاکە و باشییەکە.

زەردەشت لەگەنجەتیدا بە سیفەتی پیاو چاکان وەسف کراوە، هەم بە دڵ ناسکی و سۆز و بەزەیی و، بەخشندەیی و، لێ بووردەیی و، ئازایی و هێمنی و سنگ

فراوانی، ئەم ڕەوشتانە لەو کاتەدا باو بوون و لەناو خەڵکدا و کراونەتە بناغـە بـۆ بە چاکتری دانانی یەکتری لەناو خۆیاندا، لە بەرگەکی ڕووناکیدا دایانڕشت و لەسەر ناوچەوانی دەرکەوت و، نرخ و بەها و درەخشانی زیـاتری پـێ داو، لـەناو تـەواوی خەڵکدا پایەی بەرز کردەوە.

لەبەرئەوە زەردەشتیە هاوچەرخەکان گەواهی ئەوەیان دا کە زەردەشت بێ هاوتا بووە، ئەدگارەکی جیاوازی هەبووە، تا وا خەیاڵ دەکەن لە قوڕێ دروست کراوە، کە جیایە لەو قوڕەی خەڵکی لێ دروست کراوە. ئەوەی لەو گەڕاوەتەوە بڵاو کردنەوەی ڕەوتی خێر بووە بۆ دەوروبەرەکەی، وە بە هۆی لە خۆوە کەوتنە بەردڵانی زەردەشت و ڕەزاسوکی و پاکژی زۆریەوە تۆوی دڵخۆشی لەناو هەر کەسێکدا دەچاند کە لێـی نزیك دەبۆوە، بەڵام بەزەیی هاتنەوەی بە هەژارەکاندا و، خـۆش ویـستنی گـەدایان لەودا بێ سنوور بوو، بەرگەی ئەوەی ناگرێ کە بیان بینێ لە ژیانێکی دژوار و پـڕ ئازاردا بژین و، خوای گەورە گوێچکەیەکی زۆر هەستیاری پێ دابوو کە لە قـوڵایی شەودا گوێی لە ئاخ و داخی ژێر دەستەکان و، خەم و خەفەتی بێ بەشان و، ئـاهۆ ئاهی نەخۆشان گرفتاران بێت.

لەگەڵ ئەوەشدا زەردەشت بەرگەی ئازاری گیاندارانی بـێ لـە مـرۆڤیش نـاگرێ وەکو ئاژەڵان و باڵندەکان و، چەند جار بینراوە خواردنی بـە گیانـداران و باڵنـدەی برسی داوە و، بۆ چارەکردنی بریندار ڕای کردووە و، ئازاری زۆری سووك کردووە و، مرۆڤی لەسەرە مەرگدا لە مردن قورتار کردووە.

ئەو ڕووناکیەی هەموو لایەکانی ئەوی لێوان لێـوان کـردووە هـەمان ڕووناکیـە دەبێتە هاندەری یەکەم بۆ زیاد کردنی زانست و، هەڵچواندنی گیـانی و، پێـی لـە حەقیقەتی ڕەها نزیك دەبێتەوە و، بە دوای قۆنـاغی فێربوونـدا لـە نـاو کـارزان و دانایان و زانایانی وڵاتدا دەگوازێتەوە و، کێشە و ئاستەنگەکان کە دێنـە ڕێگـای ئەو نیشانیان دەدات و، کارزانی و نهێنییەکانی ئەوان بۆ ئـەو زیـاد دەکـات، لـە

هەمان کاتدا لە شوێنی پێك گەیشتنی ڕێگا بازرگانەکان هاتووچۆ دەکات تا ئاخافتنی بۆ ئاسان ببێ لەگەڵ زانایان و گەشتیاران و بازرگانان و، ئەنجا سەرباری زانیاری خۆی زانیاری گەلانیشی بۆ زیاد دەبێت.

لە کاتێکدا زانی کێ لە ئاستی مامۆستای توند دایە خۆشەویستی زانیاری زۆرتر بوو، ئارەزووی زۆری بۆ زانیاری حەق پتر بوو، ئەوان بۆیان ڕوون کردەوە ئەو ئاینەی لە باوکان و باپیران بە میراتیان گرتووە، تەنیا ئەوە ڕاستە، ئەوەی بۆیان ماوەتەوە لە سروشی ئاسمان ئەوە بڕوا پێکراوە لە بڕوا و ڕەفتاردا، زەردەشت خۆی ئاگاداری ئاستی وشکی و ڕەقی ئەو ئاینە بوو کە لە چاخی ئەودا هەبووە، بەلاّم زانیاری ئاینی بە توندی بە ڕابردویەکی دورەوە بەسترا بۆوە گەیەنرا بوو ئاستی مردن و، هەموو پەیوەندییەکی بە ئێستاوە پچڕا بوو، لە کاتێکدا ئەو هەوڵی بۆ ئاینی زیندو دەدا ژیان بخاتە گەڕو بۆ پێشەوەی ببات و، داخوازیەکانی تازە پەی پێ ببات و ئایندەی دوور ئاشکرا بکا و پەردەی لەسەر هەڵماڵێت.

کەواتە زەردەشت خولیای زانستە کە هەمیشە بە توانایە و گەنجە و، بیری بەسەردا نایەت، وە زانستەکەی لەسەر گومان و توێژینەوە و، ووتووێژ و دەمەتەقێ و پرسیار کردن دانامەزرێ، بەم حاڵە زانیاریەك خاسیەتەکانی ئاوا بێ بە هەوڵدانی هێزی ڕووت دەست ناکەوێ، زەردەشتیش لە زانیاری خوایی دەکۆڵێتەوە، بەتامەزرۆوە سەیری هەواڵی ئاسمانی و سروش دەکات لێی.

لەم ماوەیەی تەمەنیدا تورانیەکان هەڵمەت دەبەنە سەر ئێران و، خراپەکاری تێدا بڵاو دەکەنەوە، دەست بەجێ خۆی دەکات بە جان فیدا و، زانیاری و شارەزایی لە خزمەت سوپای جەنگاوەر و ڕۆڵەکانی نیشتمانیدا ڕۆ دەنێت. نەخۆشەکانی چارە کردوو برینی پێچان و، ورەی جەنگاوەرانی بەرز دەکردەوە و، هەموانی هاندەدا بۆ خۆڕاگری ئارام گرتن و لادانی ئەو مەترسییەی چاوی بڕیوەتە نیشتمان، تا کۆتایی بە جەنگەکە هات و داگیرکەران تێشکان.

بەڵام کۆتاهاتنی جەنگ سنورەکی بۆ ئازارەکانی خەڵك دانە نا، بەڵکو برسیەتی لە هەموو وڵاتدا بڵاو بۆوە و، ناخۆشیەکان و کلۆڵییەکان توند بوون و، هەژاری زۆر لەوە زیاتر بوو کاتێ لە شەڕدا بوون، سەر لە نوێ زەردەشت گیانی خۆی کردە قوربانی بۆ ئەنجامدانی ڕۆڵەکەی لە خزمەت هەژاران و گەدایاندا و، پانزە ساڵ ڕابرد هەموو کاتی خۆی بۆ ئەو کارە نایابە تەرخان کرد.

دوای کەم بوونەوەی برسیەتی، زەردەشت گەڕاوە زێدی خۆی و لە سەر ویستی باوکی کچەکی بەناوی (هانەوی) کردە هاوسەری خۆی. زۆر لەگەڵ خێزانیدا نەمایەوە، کە ئارەزووی باوکی خستە ئەولاوە کە ئەو دابنیشێ و کشتوکاڵ بکات و، ئاژەڵداری بکات، جا بەردەوام بوو بە کاری کەم کردنەوەی ئازار لەسەر خەڵك و، لەو ماوە درێژەدا کە لە نێوان بریندارانی مەیدانی جەنگ بەسەری برد و، لەناو هەژاران و نەداراندا، دڵنیا بوو کە ئازار و خەمی خەڵکی کۆتایی یان پێ نایەت.

## سروش(الوحی)

وەك زانیمان زەردەشت گەیشتە ئاستەکی بەرزی دینداری و، بەشەکی فراوانی زانیاری بەدەست هێنا و، بەو ڕووناکیە تەواوی ژیانی خۆی پڕشنگدار کرد و، هەریەکەش لەم ئاین و لەم زانیارییە بناغەی سەرەتاییان و مەبەستە دوورەکانییان دوو پاشماوە بوون لە پەیوەندی گەلەکەیەوە، کە بە سروشی ئاسمانەوە مابوونەوە، گومانی تێدا نییە کە ئاین بۆ چەند شێوەیەکی بێ هودە لە خوا پەرستییەکان و نەریتەکان گۆڕا بوون و، خەڵکی دەستیان بە تەقوا و پارێزگاری ڕواڵەتی یەوە گرتبوو، هەروەها وەرعێك کە کۆڵەکەی خوێنی قوربانیەکان و خێر کردنەکان بوو، گومان و دڕدۆنگی و سەرگەردانی لە ناو خەڵکی زانا و شارەزا دا زۆر بووبوو، لە ناو خەڵکی تایبەتی و گشتی دا بڕوا بوون بە ئەفسانەکان بڵاو بوبۆوە، لە کۆتایی توانەوەی دینی حەقدا بتەکان پیرۆز کرابوون و، هەتا لەجیاتی خوادا پەرستران.

زەردەشتی هەستیار و دڵ پاك بەهۆی دوری خەڵك لە ڕاستی و حەق، هەردەم لەگەڵ ئاسەواری خراپدا بەرەو ڕوو دەبوو، ئەوەشی لە ستەمی دەسەڵاتداران و، هەژاری و نەبوونی و برسیەتی و، تاڵان و زەوت کردن و، درۆ و فرت فێڵ و، تاوان و خراپە و، کلۆڵی و شەکەتی و کەساسی دا بۆ ڕوون بۆوە، هەتا ژیان بێ سەرەو بەرەو خراپ بوو، مرۆڤی لەناودا بەرەو کەندەڵانەکی قوڵ و بێ بن لێژ کردەوە، کە هیچ کەسێ هەڵی ناگرێتەوە تەنیا ئەو ڕێنومایە نەبێ، کە لەو سەرچاوەیە پێی دەگات کە گشت ڕووناکی و چاکەکی لێوە دەردەچێت.

زەردەشت لەسەر کەناری ئەم ژیانەدا دەژیا کە توانای بەرگە گرتنی ئەوەی نەبو و، ڕۆژ بە ڕۆژ لەناو چەند خەمێکی پەیوەست بە یەکترە و بیر کردنەوەیەکی درێژدا دەژیا بۆ چاکسازی کردن بەڵام خەمەکانی دادی نەداو، هیچ هۆیەکی بە دەستەوە نەبو خراپکاری پێ چاك بکات و، گومڕا ڕێنوما بکات و، خواروخێچ ڕاست بکاتەوە، تا پێوانەکە پڕ بوو، تەواوی خولیای کارکردنی لە دەستدا و، ئارەزوو کردنی ژیانی کۆمەلایەتی نەماو، نەفس وا حاڵی بوو کە تەریکی و گۆشەگیری بکات بۆ ڕامان و خواپەرستی، جا لەیەکێ لە ئەشکەوتەکانی چیاکانی سابلان بارەگای خۆی خست و، ماڵی خۆی لە ئەشکەوتدا دانا و، بووە هاودەمی گیانداران و باڵندەکان.

ماوەی خلوە و دابڕان و تەنیایی لە ژیانی پێغەمبەران بە زۆری ماوەیەکە بۆ ئامادە باش کردنە بۆ پێشوازی کردن لە سروشی خوای گەورە، بۆیە سروشتی خۆدامالێن لە هەموو ئەو پەیوەندییانەی ڕەوانە کراوە کە بە دنیاوە دەبەستنەوە زاڵ دەبێ بەسەریدا، لەو ماوەیەدا دڵ خاوێن دەبێتەوە و، لە هەموو لێڵیە دەرونیەکان پاکژ دەبێتەوەو، بۆشاییەکی بۆ دروست دەبێ تەنیا ڕووناکی و سروشی خودا پڕی دەکاتەوە.

پاش دابڕانەکی درێژ لە خەڵکی، ڕۆژێ لە ڕۆژان بەرەبایەنەکی لەسەر لێواری ڕووباری دایتی daity لە کەرتی ئەزەربیجان دا ویستی مشتە ئاوێ هەڵبگرێ دەم

و چاوی پێ بشوات، چاوی بە پیاوەکی جل و بەرگ جوان و درەوشاوە و سپی کەوت کە گۆچانێکی پێ بوو ڕووناکی دەدا و بەرەو ڕووی ئەو دەهات، ئەویش لێی ڕاما بوو، هیچی تێدا بەدی نەکرد کە ئاسایی بێ، وردە وردە ئەو نزیك دەکەوتەوە و، زەردەشتیش لە شوێنی خۆی وەستا بوو، زۆر بە سەرنجەوە سەیری دەکرد، کاتێ گەیشتە ماوەیێ کە بتوانێ قسەکانی ببیستێ، دەست پێشخەری کرد لە قسە کردن لەگەڵیدا تاترسی یەکەم ژووانی لێ بڕەوێنێتەوە لە ناوچەیەکدا، کە کەسی تێدا بەرچاو نەکەوتووە، زەردەشت دڵنیا بوو سنگی بۆی کرایەوە، لەو ساتەدا هەواڵی دایە کە ئەو (ڤۆ هۆمانو vohomano)[1] ە گەورەی فریشتەکانە، بە تایبەتی بۆ ئەوە ڕەوانە کراوەتە لای ئەو، تا هاوڕێیەتی بکات بۆ ئاسمان و لەوێدا ڕێزی ئامادەبوون لەبەردەم خوای شکۆداری پێ ببڕێ. گورج زەردەشت وەڵامی فەرمانەکەی دایەوە و، فریشتەکە بۆ ئاسمانی هەڵگرت و لەبەردەم عەرشی خوادا داینا و، ئەنجا خۆی بۆ دواوە کشایەوە و ئەوی بەجێ هێشت و لە پەروەردگاری عەرشی مەزنەوە بە ڕووناکی داپۆشرا بوو کە قەت چاو شتی وای نەبینیبوو، وەکو سەرچاوەکانی پەهلەوی دەیگێڕنەوە. زەردەشت ئەرکی بەشکۆ دار دانان و بەگەورە دانانی لەبەردەم پەروەدگاری بەرزدا پێشکەش کرد و، خوای شکۆمەند هەواڵی دایە کە ئەو هەڵی بژاردووە بە ڕەوانە کراو و پێغەمبەر بۆ کەسانی تایبەتی گەلەکەی، ئەنجا زانیاری ئاینی لێ وەرگرت. لە دوایی دا گوێی لە فەرمانی خوا بوو کە شەریعەتی ئەو بە گەلەکەی ڕابگەیەنێ و مژدەی بەختەوەری هەردوو جیهانی پێ بدات.

---

[1] خۆی ئەم وشەیە (ڤۆ هومەنە) دەخوێنرێتەوە وەك لە فەرهەنگی ئیریەن ڤەج / محمد ئەمین هەورامی) هاتووە لە دوو وشە پێك دێت ڤەهو (vahu) واتە چاك و (مەنە mana) بە واتای (خوو)، (ڕەوت)، (ڕەوشت) هاتووە، بەهەردوکیان مانای (خوپاك)، (ڕەوشت باش)، (خوڕەوشت چاك) دەدەن، لە پەهلەویدا ئەم وشەیە بووە بە ڤوهومەن vahuman). بڕوانە (فەرهەنگی ئیریەن ڤەج/محمد ئەمین هەورامی). (وەرگێڕ)

زەردەشتیەکان هەر لەسەر یەك گێڕانەوە ڕێك نەکەوتوون سەبارەت بە ڕوودانی وەرگرتنی پێغەمبەرەکەیان لەکاروباری پێغەمبەرایەتی و چۆنیەتی پێشوازی کردن لە سروش (الوحی)، بەسەرهاتی ڕابردو پوختەی چەند گێڕانەوەیەك بوو، تەنیا ئەو گێڕانەوە پێ دەچێ و باوە لە چۆنیەتی وەرگرتنی سروش لە لایەن پێغەمبەرانی خوای گەورە و، وەرگرتنی کاروباری پێغەمبەرایەتییان.

فوهومانو (ڤۆهومەنە) فریشتەی سروشە بۆ ڕەوانە کراوانی، خوا جگە لەو کەسی تری ڕەوانە نەکردوە بۆ هیچ ڕەوانە کراوو پێغەمبەرێك، زەردەشت پەیامەکەی لە پەروەردگاری وەرگرت کە بەرۆشنایی خوایی لۆی داپۆشرابوو، بە بێ هیچ ناوەندێ (الواسطة)، ئەوەی من درێژەم پێدا سەرچاوەکان لەوە زیاتریان باس نەکردوە و، لە تەوەرە بنەڕەتەکانی پێغەمبەرایەتی پێش و پاش ناکەوێت.

بەپێی ڕۆژ ژمێر و ساڵنامەی زەردەشتی نوێ، ڕۆژی (٥)ی مانگی مایۆ ساڵی (٦٣٠پ.ز) کە ڕێکەوتی نیوەی مانگی ئورتافاحستۆیە، ئەوە ئەو ڕۆژەیە سروش بۆ زەردەشت و، بە پێغەمبەر و، ڕەوانەکراو هەڵبژێرراوە، کە تەمەنی گەیشتبویە (٣٠)ساڵی، تا ئێستاش مەجوسی هیند و ئێران بەو ساڵەی کە پێغەمبەرەکەیان بۆ خەڵکی مادا و فارسی ڕەوانە کراوە دەڵێن (ساڵی ئایین)، واتە ساڵی یەکەمی ئاین.

## بانگەوازی بۆ ئاینی خودا

زەردەشت دەستی کرد بە بانگەوازی کردنی گەلەکەی بۆ سێ کۆڵەگەی پێغەمبەرایەتی: (پەیام نێرو، پەیام بەرامبەرو، پەیام) و ڕونکردنەوەیان، تا ئەوەی لە لایەن پەروەردگاریەوە هێناویەتی ڕۆشنی بکاتەوە، پەیامنێر خودایە (ئەهورامزدا) کە کردگاری ئەرك پێ سپێرە، پەیامبەرەکە زەردەشتە[1] کە ڕەوانە

[1] دینی زەردەشت (مەجوسی) لە قورئانی پیرۆزدا لە ڕیزی نامە ئاسمانیەکانی تردا دانراوە و، لە بت پەرستان جیاکراوەتەوە وەکو قورئان دەفەرموێ: (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالصَّابِئِينَ وَالنَّصَارَى وَالْمَجُوسَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا... ) الحج/١٧. =

کراوە بۆ لایان و خۆشیان دەیناسن، بە سیفەتی ڕەوانە کراوو خاوەن پەیام و، بە هەڵبژاردنی خوا نەبێ لەوان جیا نابێتەوە. هەرچی پەیام و نامەکەیە سروشی خوایە و، ناوەڕۆکی کتێبەکەش هەموو ئەو مەسەلانەیە کە پەیوەندییان بە ئەرك پێ سپاردن و پەیوەندی ئەرك پێ سپاردنەوە هەیە.

پەیامی زەردەشت وەك هەموو پەیامەکانی تری خوایی بۆ خەڵك لەسەر ڕواڵەتی دەرەکی دانەمەزرا بوو بۆ ئاین - کە لەو سەردەمەدا باو بوو - بەڵکو لە بنچینەدا لەسەر بڕوای دڵ و دیاردە گەورەکانی دامەزرابوو، ئەم بڕوایەش بڕوایەکی جێگیر بوو کە گومان هەڵناگرێ و قسە و کردەوەیەکەهاوجوتی بیرو باوەڕەکەن.

زەردەشت ویستی بەم بانگەوازییە، ئاین هەمووی لەسەر تەقوایەك دابمەزرێنێ کە لە ناخی دڵەوە هەڵبقوڵێ و، لەسەر سەقامگیری (الأستقامة) کە لەسەر جڵەوێکی ڕەفتاری و جوڵەیی دابمەزرابێ، لەبەرئەوە بە ڕاستییەکەوە ڕووی لە خەڵکی کرد کە ژیانی ئەوانی بۆ لا دەگەڕێتەوە.ئەو سنوورەشی بۆ دەرخستن کە

---

= واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوە و، ئەوانەی یەهودین و صابئین و مەسیحین و مەجوسن و بت پەرستن. . . . ).

بە پێی فیقهی سوننە ئەوانە ئەهلی کیتابن و زۆر لە زانایان فتوای ئەم ڕاستییەیان داوە. لە (فقە السنە/السید سابق/ج٢/ل: ٢٩٩/ط١/١٩٧١)دا هاتووە: (هەیە لە فەقیهەکان زەردەشتییەت - المجوس - بە ئەهلی کیتاب دەزانن و نەسخ کراوەتەوە وەکو لە عەلی (کرم الله وجهە) گێڕاوەتەوە).

هەروا هاتووە: (پێغەمبەر (ﷺ) لە بارەیانەوە دەفەرمێ: (سنوا بهم سنة أهل الکتاب). واتە: یاسای ئەهلی کیتابیان لەگەڵدا پەیرەو بکەن. (ابن حزم) دەڵێ: مەجوسەکان ئەهلی کیتابن و حوکمی ئەوان وەك حوکمی ئەهلی کیتابە و، (ابو ثور) و (الظاهریة) هەمان بۆچوونیان هەیە). وە هەندێ بڕوایان وایە ئیبراهیم خەڵکی ئۆرفەر بووە و ئاگر پەرست بوون، ئەوەتا (مهد البشریە/دبلیو. ای. ویگرام/ل: ٢٥-٢٦) ئاماژە بەوە دەکات کە (موسڵمانان بڕوایان وایە کە (ئۆرفە) ئەوری کلدانیەکان بووە، نەك (ئەرخ) و (رتل المقبر)لە بابلدا. . . . وە ئیبراهیم بە قسەی نەمروودی نەکرد کە ئاگر بپەرستێ کاتێ فەرمانی پێدا، بۆیە خستیە ناو ئاگردانەوە). بەو پێیە بەر لە زەردەشت و ئیبراهیم گەلی دۆڵی دۆزی و میدییەکان ئاگریان پەرستووە. (وەرگێڕ)

ئەوانی گەیشتونێ لە دورکەوتنەوەیاندا لە بنـەما ڕاسـتەکانی ڕەفتـاری خـودایی. بەڵام ئەو ئاینەی ئەوانی لەسەر بوون بت پەرستی بـوو لـە دزێـوترین شـێوەیدا و، دروشمەکانیشیان هیچ واتایەکی خودا پەرستی تێدا نەبوو.

زەیوان (کاهن) و کەشیـشەکان و پیـاوانی دیـنی سـەرەتای بانگەوازیەکـە لـە بنەماکانی بانگەوازی بێزار و ناڕەحەت بوون، کە سەرەتا لەسـەر دامـاڵینی ڕەهـا (التجريد المطلق)و خوا پەرستی دڵ و ئەندامەکان دامەزرابوو، نەك لەبـەر نـامۆیی ئـەو پەیامـەی هێناویـەتی، ئـەوان پیـاوانی زانیـاری و زانـست بـوون، بـەڵکو لەبەرئەوەی ڕێبازەکی نوێ ی هێناوە لە بیروبڕوا و ڕەفتار و ڕەوشتدا، ئـەوەش بـەو واتایە دێ کە ڕاستەوخۆ ڕوکنەکانی کۆمـەڵگای کۆن دەشکێنێ، تا کۆمەڵگایـەکی تازە لە ڕێبازی داو لە ئامانجەکانیدا لە شوێنی ئەو دابنێت.

لێرەدا پیاوانی ئاینی هەوڵەکانیان چڕکردەوە بۆ دەورە دانی بانگەوازییە تازەکە و، لەناو بردنی بە بێ دەنگی و ژاوەژاو، سەرەتا بـە نـەرمی بـۆی چـوون و پێیـان ڕاگەیاند کە بانگەوازیەکەت مەترسی و هەڕەشەی هەیە بۆ سەر ئاسایش و ئاشتی کۆمـەڵگاکەیان، چونکە بیروباوەڕی بـاوك و بـاپیران دەشـێوێنێ و، ئـەو دروشـم و نەریتانەی ڕۆژگارەکی دوور و درێژە بەکاری دێنن بە نەفامی دەزانێـت، وا باشـترە بۆ ئەو و ئەوانیش دەست بەرداری ئەم بانگەوازییە ببێت.

زەردەشت ملی بۆ داخوازیەکانیان کەچ نەکرد، بەڵکو بەرەو ڕووی پڕوپاگەندە و بەڵگە و بەهانەکانیان بۆوە پوچ کردنەوە و نکۆڵی کردن، بۆیە ناچاربوون بەربەسـت و ئاستەنگ لە نێوان ئەو و خەڵکدا پەیدا بکەن.

هەتا لەوەش دا سەرنەکەوتن و دۆڕان کە کێشە و مـل بـە ملانەکـەی نێـوان و ئەوو ئەوانی گۆڕی بە جەنگەکی ئاشکرا.

زەردەشت توانی لە ماوەی جەنگە دوژمنکارانەکـەی لەگـەڵ پیـاوانی ئاینیـدا بانگەوازی خۆی وەکو خوا (هوزا مزدا) دەیەوێ بخاتـە ڕوو، هاوکـات تـوانی ئـەو

پەردەیە لاببات کە لە دیتنی ڕێگای ڕاست و ئاینی حەق قەدەغەی دەکردن و، بۆی ڕوون کردنەوە کە ئەو دینەی ئەوان دەستیان پێوە گرتووە دەستکاری کراوە و گۆڕاوە دوورە لە سروشتی ئاسمان، کاهین و پیاوانی کەشیش بۆیە لە سەر ئەمە سورن، چونکە ئەوان بە تەنیا سوود لەوەدا دەبینن.تەنیا چلێسی و ترسیان لە لە دەستدانی پایە و دەسەلاتیان لە کۆمەڵگادا هانیان دەدات، کە ئەوەی بۆی هێناون لە لایەن خواوە نەیانەوێت.

هەریەکە لە (پنڤدا penvda) و جریهما (grehma) کە زەردەشت بە دوو ڕوو، دوو ڕوین وەسفیان دەکات و بە دوو ڕوو ناویان دەبات، کە ئالای نەیاری و بەرهەڵستکارییان هەڵگرت، (پنڤدا) لەبەر ئاستی بەرزی پایەی لە کۆمەڵگادا لە هەمووان زیاتر دژ بوو بە بانگەوازی و زانیارییەکانی زەردەشت، بۆیە ئامۆژگاری دەسەلاتدارانی کرد بە شار بەدەر کردن و، ئاوارە کردنی بۆ پاراستن و چەپاڵەدانی بیروبڕوای خەڵك.

بە وەدەرنانی زەردەشت لە زێدی لە دایك بوون، زەردەشت نا ئومێد بوو لەوەی کە خەڵکی بانگەوازیەکەی پەسەند بکەن، جا بە دڵی شکاو و چاوی پڕ لە فرمێسك و ئەشك ماڵ ئاوایی لە نیشتمان کرد و، بە ناو شار و گوندەکاندا دەگەڕا، بەوە ناوی ڕۆیشتبوو کە بانگەوازی کەرو درۆزنە و، تێك دەری ڕیزی کۆمەڵە و جنێو بە خواکان دەدا و، پەرستنیان بە گەوجی و نەزانی دادەنێ، کەس نەیدەوێرا پێشوازی لێ بکات و گوێی لێ بگرێ جا دەرگاکان بە ڕوویدا داخرا.

زەردەشت لە بانگەوازی کردنی گەلەکەی بێ ماندوو بوون بەردەوام بوو، کە خوێن گەرمی و دڵنیاییەکی ڕەگ داکوتاو بەسەرخستنی ئەوو دینەکەی لە لایەن خواوە هانی دەدا و، ڕۆژ و مانگی تێ دەپەڕاند و مژدەی خێر و چاکەی دنیا و پەسلانی بە خەڵك دەدا، هیچ کەسێکی نەبینی گوێی بۆ بگرێ و، هیچ دڵەکی نەبینی بڕوای پێ بهێنێت، ڕۆژێك ڕاوەستا و بە پاڕانەوەیەکی جوان لە پەروەردگاری نزای کرد، کە حاڵەتی خۆی تێدا باس دەکات:

(ئەی خوای من بۆ لای کێ ڕابکەم و، بۆ کام شار و وڵات بڕۆم. پیاوە ماقوڵ و گەورەکان لێم تەکیونەوە و، خەڵکی ڕەشۆکیش گوێی بە قسەکان نادات، هەتا ئەو بوختان کەرە کاربەستە درۆزن و فێلبازانە لە وڵاتدا، ڕێنومان بکە چۆن ڕەزامەندی تۆ وەربگرم، چۆن بە ڕێنومایی تۆ زەفەر ببەم، من نهێنی بێ هیوا بوونی خۆم دەزانم، هۆی سەرنەکەوتنی هەوڵەکانم پەی پێ دەبەم، من پیاوەکی هەژارم، کەم کەس گوێم بۆ دەگرێ، خوای چاکە لە تۆ دەپاڕێمەوە، ڕەوانە کەری ڕووناکی، سکاڵا و هاوار بۆ تۆ دێنم، یارمەتی و سەرکەوتنم پێ بدە، وەك چۆن هاوڕێ یاریدەی هاوڕێ دەدات تۆش یاریدەم بدە و، ڕێگای ڕاستم نیشان بدە کە دەبێ بە هۆی بەدەست هێنانی بیرکردنەوەی ساغ.

پەروەردگارم کەی سپێدەی ڕێنومایی و ڕووناکی بۆ ئەم دنیایە هەڵدێ لە ڕێگای ئەو زانیارییانەتەوە کە دەبنە هۆی ڕزگاری؟ لە کوێن ئەوانەی لەوانە بە ئەو زانیارییانە بەختیارییان پێ بدات؟ ئەی خوای من هەموو متمانەم بە تۆیە تۆ یارمەتیم بدە بۆ سەرکەوتنی پەیامەکەت، یارمەتیم بدە بۆ ئەنجامدانی ئەوەی فەرمانت پێی کردوم).

حەوت جاران لە ماوەی بانگەوازیدا سروش بۆ زەردەشت دابەزی کە لە سەرچاوە ئیسلامیەکاندا بە (حەوت ئاخافتنەکان - المخاطبات السبع) ناویان هاتووە، لە سەرچاوەی نوێدا بە (حەوت خەونەکان - الرؤى السبع) ناوی هاتووە. ئەم حەوت ئاخاوتنە کۆمەڵە زانست و زانیارییەکیان بە دوای یەکدا تێدا بوو سەبارەت بە فەرزەکان و سوونەتەکان و سزاکان ڕۆژی پەسڵان و ئەوەی لە ناویدایە لە بەهرەکانی بەهەشت و دۆزەخ و شتی تر، وە لە ئاخافتنی دواییدا پەیامەکە تەواو بوو سروشی پچڕا[1].

---

[1] شایانی باسە وەحی و سروش دوو جۆرە، سروشی مەنهەجی کە یاسا و دەستوری تێدایە وە سروشی تایبەتی و ڕێنوما و کۆمەکی کە بەردەوام تا مردن لە پێغەمبەر جیانابێتەوە، بۆ نموونە مووسا بەر=

زەردەشت هەرچی وەحی بوو کە لـە لایـەن خـواوە پێـی گەیـشتبوو لـە (١٠) سـاڵەی تەمـەنی بانگەوازیـدا پێـی گەیـشت. وەکـو شەهرسـتانی گێڕاویـەوە فریشتەکانی خوا بۆیان هەڵدەگرت و، هـەمووی لـە وەرزی زسـتاندا لـە باشـوری خۆرئاوای ئێراندا تەواو بوو، لە کاتی هاویندا زەردەشت هەموو ساڵێ بەو وولاتـدا دەسوڕایەوە مژدەی پەیامەکەی بـە گەلەکـەی دەدا و، وەرزی زسـتانی لـە زێـدی خۆیدا لە ناو ژن و منداڵی خۆی دا بەسەر دەبرد.

بە درێژایی (١٠) ساڵ کەس بڕوای پێ نەهێنا، لـە سـاڵی یانزەمـدا پێـشڕەوی ڕێنومایی لە ئاسۆدا دەرکەوت و، هەم مژدەکانی پەسەند کردنی ئاین لای خـەڵك، یەکەم کەس کە بڕوای بە بانگەوازەکەی هێنا ئـامۆزای بـوو بـە نـاوی (میتیومـا metyomah) دوو ساڵ ڕابرد کەسـی تـر بـڕوای نـەهێنا، بـەلاّم لـە تێکۆشـاندا بەردەوام بوو، ویست و ورەی کز و لاواز نەبوو.

کاتێ زەردەشت تەمەنی گەیـشتە (٤٢) سـاڵی پەیامەکـەی تـەواو بـوو، لـەو کاتەدا خوا دەستوری پێ دا بڕواتە لای شای ئێران (گشتاسب)[1] کە پایتەختەکـەی

---

= لە وەرگرتنی تابلۆکانی تەورات و دوای ئەم تابلۆیانەش لە وەحـی دانـەبڕاوە. (وَلَمَّا سَكَتَ عَنْ مُوسَى الْغَضَبُ أَخَذَ الأَلْوَاحَ وَفِي نُسْخَتِهَا هُدًى وَرَحْمَةٌ لِلَّذِينَ هُمْ لِرَبِّهِمْ يَرْهَبُونَ(١٥٤)وَاخْتَارَ مُوسَى قَوْمَهُ سَبْعِينَ رَجُلاً لِمِيقَاتِنَا. . . . )الاعراف/١٥٤-١٥٥. واتە: کاتێ مووسـا تـوڕەیی هێـور بـۆوە تابلۆکانی دەستدایە و لە ناو نووسراوەکەدا ڕێنوما و بەزەیی هەبوو بۆ ئەوانـەی لـە پـەروەردگاریان دەترسن. موسا حەفتا پیاوی لە گەلەکەی هەڵبژارد بۆ ژوانی ئێمە. . . . ). (وەرگێڕ)

[1] عەللامە مەسعود محمدی خوا لێی خۆش بێ لە (لسان کرد)دا لەسەر ووشەی (گشتاسب) دەنووسـێ: (لێرەدا ناوی تری میدی هەیە کە لەگەڵ ئەو ناوانە وەکو یەکە لە ئاڤێستا دا هـاتوون لەوانـە نـاوی (کشتاسپ kushtaspi) کە لە نووسراوە بزماریەکانی هەندێ ناوچەی ئاسیای بچوکدا دۆزراونەتەوە و، لە شای ئاشورەوە (تیکلات بلیسەر)ەوە ماوەتەوە کە پەیوەندی بە ساڵی (٨٥٤ پ. ز)وە هەیـە. ئەمە هەمان ناوی (ڤستاسب - گشتاسب)ە کە پارێزەری ئاڤێـستا ناسـاندویەتی و، دەیداتـە پـاڵ (٧پ. ز) کەسانی تریش ناساندویانە لە هخامنـشینەکانی دوایـی لەوانـە داریـوش کـە لـە نێـوان (٥٢١-٤٨٥ پ. ز) دا حوکمی کردووە. (لسان کرد/ل٢١). وە ناوبراو لە (ل٢٧)ی هـەمان کتێبـدا دەنوسێ ئەم ووشەیە (ڤستاسب) کە گۆڕاوە بە (گشتاسب) لە زمانی فارسیدا نییە. (وەرگێڕ)

(بلخ) بوو، بانگێشە بکات بۆ ئاینی خودا.ڕەنگە کارزانی ئەم کارە دوای ئەوەی بانگەوازیەکە ماوەیێ نکۆڵی لێ کرا بۆ سروشتی ئەرك پێ سپاردنی خوایی (تەکلیف خوایی) بگەڕێتەوە، ئەوەش پێویستی بە جۆرێکی تایبەتی خەڵکە کە هزر و پەی پێ بردنی کامڵیان هەبێ، کە بتوانن بچنە ناو بنج و بناوانیەوە و بە مەبەستە دورو نزیکەکانی بگەن[1] ئەم جۆرە کەسانە لە سەردەمی زەردەشتدا تەنیا لەگەڵ پاشایەکە و دەستەکەی و زانایانی دەورەکەی دا کۆکردنەوەی پەیدا کرد، ئەوانە کاتێ توانیان شان بدەنە بەر داخوازییەکانی ئەرکە پێ سپێراوەکانی خوایی بە هەر دوو بەشەکانیەوە بیر و بڕوایی و، ڕەفتاری و، ئەوانەی لە هزر و زانست و زانیندا لە خوار ئاستی ئەواندا بوون بە هۆی فێر بوون لەوانەوە، یان لاسایی کردنەوەی ئەوان شوێنیان کەوتن.

زەردەشت هەر کە گەیشتە شاگشتاسب کتێبی ئاڤێستای کە بە سروش (الوحي) پێ گەیشتبوو پیشان دا، پوختەی ڕونکردنەوەی پەیامەکەی کە پێشکەشی کرد بەر لەم ئاخاوتنەیدا کورت دەکاتەوە: (من پێغەمبەری خوام بۆ لای تۆ هاتووم، پەروەدگاری عیززەتمەند داوای لێ کردویت ئاینی ئەو پەسەند بکەیت، بۆ تۆ جوان نییە بێ ئاین بیت و، جوان نییە موڵکەکەشت بێ شەریعەتەکی خوایی بێت).پاشان ئەوەندەی توانی کتێبی بۆ پاشا و دەستەکەی و زۆر لە زانایانی وڵات خوێندەوە تا ناوەڕۆکی مەبەستی پەیامەکەیان حاڵی بکات، پادشا زۆر بە دڵی بوو، کاری تێ کرد و، هەر کەس تێی دەڕوانی هەستی بەو مەترسییانە دەکرد کە هەڕەشە لە ئەوو بەرژەوەندی ئەو دەکرد، پاشان پلان و

[1] ئەم بەڕێ کردنە لە تەمەنی بانگەوازیدا وەکو قۆناغێ بەسەر پێغەمبەرانی تریشدا هاتووە و، تا دوای ئەم تەمەنە دەرنەکەوتوون وەك مووسا (ع) کە (١٠) ساڵ لای شوعەیب دەمێنێتەوە و شوانی دەکات. یان پێغەمبەرمان (محمد - صلى الله عليه وسلم) دوای (١٠) ساڵ لە تەمەنی بانگەوازیەکەی دەرکەوتن و جوڵەی دەردەکەوێت و، دەست بەکار دەبێ بۆ تێکۆشان و خەبات و دروست کردنی کیانێکی سیاسی و دەوڵەت، ئەمەش دوای کۆچەکەی بۆ شاری مەدینە. (وەرگێڕ)

نەخشە کێشرا بۆ دروست کردنی ئاستەنگ لە نێوان زەردەشت و نێوان پاشا و خەڵك و دینی نوێدا، کۆتایی بەوە هات کە شا بە ڕقەوە زیندانی بکات.

خودا ویستی ئاینی خۆی لە ڕێگایەکەوە سەربخات کە دوژمنەکانی پەی پێ نەبەن.پادشا گشتاسپ ئەسپەکی ڕەشی هەبوو، زۆر پێ دەکرایەوە، ڕۆژێ لە ڕۆژان کە زەردەشتی تێدا زیندانی کرابوو، مەیتەری ئەسپەکە چووە ئاخوڕە و، شتەکی سەیر و سەمەرەی بینی کە شتی وا ڕووی نەدابێ و نەبینرا بێ و، بینی پەلەکانی ئەسپەکە چوونە ناو یەك و، چوونە ناو سکیەوە و، تەنیا لاکانی یان بەدەرەوە ماوە.

دۆخی ئەسپەکە نوژدار و دکتۆر و دانایانی وڵات سەرسوڕماو کرد و هیچ هۆیەکی دیاریان نەبینی بۆ ئەم نەخۆشیە، لە چارەکردنی دا دەستە وەستان مان، لە گرتوخانەکەدا زەردەشت ڕووداوەکەی بیست، هەواڵی بە شادا کە ئەو توانای چارەکردنی ئەم نەخۆشیەی هەیە لە ئەسپە خۆشەویستەکەیدا، کە ئەم ڕێگایەی چارەی پێ دەکات بەڵگەیە لەسەر ڕاستی ئەوو، ڕاستی ئەو کەسەی هەواڵی پێ ڕاگەیاندووە.

زەردەشت بە ئەوەندەش وازی نەهێنا بەڵکو مل کەچ بوونی بۆ ووشەی حەق و بڕوا کردن بەوەی هێناویە لە لایەن خواوە بە مەرجی دانا، ئەگەر ئەو لە پەروەردگاری پاڕایەوە و پەلەکانی ئەسپەکەی لە ناو سك دەرهێنایەوە. پاشاش بەڵێنی دا بە وەرگرتنی ئاینەکە و بەرگری لێ کردنی و، کارکردن بۆ بڵاو کردنەوەی ئەگەر ئەو بتوانێ شیفای ئەسپەکەی بدات، زەردەشت بە پاڕانەوە و خۆ بە کەم زانی یەوە ڕووی کردە پەروەردگاری و، ئەویش گورج پەسەندی کرد و، گیرای کرد و، پەلەکانی ئەسپەکە هاتنەوە دەرو، چوونەوە شوێنی ئاسایی خۆیانەوە.

پادشا ملی بۆ بەڵگە و پەرجووی خوایی کەچ کرد، بەڵام داوای لە زەردەشت کرد موعجیزە و بەڵگەیەکی پیشان بدات کە ڕاستی پێغەمبەرایەتی ئەو بسەلمێنێ و، بێگومان لەبەرچاوی هەموان ئەمە ڕوویدا و، گورج لە حەوشەدا کۆمەڵێ فریشتە لە شێوەی ئەسپ سوار دەرکەوتن بەرگی سەوزیان کردبوە بەرو، خۆیان پڕ

چەك کردبوو، شا زۆر لەو سوار چاکانە ترسا، هەبوو غیرەت گرتی و لێیان نزیك بۆوە و، لەو کاتە کەوتنە قسە لە گەڵیاندا کە ناوەڕۆکەکەی ئەوەیە: (ئەم ئەسپ سوارانەنە هاتون زیانتان لێ بدەن، بەڵکو هاتون مژدە بە تەمەن درێژی ئەو دەدەن و لە ئایندەدا خوا زۆر بەهرەی پێ دەبەخشێ و، دەوڵەتەکەشی بەهێز و سەر بلند دەمێنێتەوە تا بەردەوام بێ لەسەر دەست گرتن بە ئایینی خوداوە، بەلام ئەگەر گومڕا بوو یان تاوان و فێڵ و سەختەیی و خۆ بە زلزانی کردو، لە دین پاشگەز بۆوە، یان دڵسۆز نەبوو لە بلاوکردنەوەی ئایندا، ئەوە کۆتایی بە ژیانی دێ و، لە کارەکەیدا ئابڕوی دەچێ و دەوڵەتەکەشی زوو وێران دەبێ و دەڕوخێت پادشا بڕوای بە خواو شەریعەتەکەی بۆ خەڵك هێنا و، بڕوای بە زەردەشت هێنا کە ڕەوانە کراو پەیامبەرە و، ئەنجا بانگی خێزانەکەی کرد بۆ بڕوا هێنان و، بڕوای هێنا، ئەنجا بانگی دارودەستەکەی کرد ئەوانیش بڕوایان هێنا و، لەوانەش ئینفندیاری برای و، فراسسترای وەزیری یەکەمی و، جامسپێی دانا.

هەر کە هەواڵی بڕوا هێنانی پادشا و دارودەستەکەی و هاتنیان بۆ ناو ئایینی نوێ و، واز هێنانیان لە بت پەرستی بلاو بۆوە خەڵکی لە وولات بە پەلە هاتنە ناو ئاینەوە وەك پەیرەوی کردن لە پادشا و، پیاوە تایبەتەکانی لە زانایان و فەیلەسوفان.

ئاڤێستا (الابتساق) لە شێوەی دواییدا لە بارەی شاگستاسپ قسە دەکات کە (پایەی شەریعەتی خوا و یارمەتی دەری گەورەی ئەو بوو، هاوڕێی چاك و، دەستی ڕاست و، یارمەتی دەری پاکژ بوو)، ئەمەش کاریگەری لە بەرزکردنەوەی دۆخی ئاین دا، ستایشی بە گوێرەی شایان بوون بە ئەو کردەوە و، بۆ نموونە لە (ئەلیسنا)دا هاتووە:

(ئەم پادشایە بووە دەستی ڕاست بۆ ئاینی خوا و، ئەو ئاینەکەی لە کۆت و زنجیر ڕزگار کرد و ئاین بەر لە ئەو هیچ یارمەتی دەرو سەرخەرێکی نەبوو، ئەو یاریدەی داو سەری خست، ئاین شکۆی نەبوو لە ناو خەڵکدا ئەو شکۆداری کرد و، پایە و شوێنەکی بەرز و گەورەی پێدا).

هەر لەو کاتەوە دان بە ئاینەکە نرا وەك ئاینەکی ڕەسمی بۆ دەوڵەت، دەسەلاٌتی ڕاستەقینە بۆ ئاین هاتە جێ و، ئاڤێستا کرا بە سەرچاوەی سەرەکی شەریعەت و یاسادانان لە تەواوی کۆمەڵگادا و، بوە تەوەری جووڵەی خەڵك لە ژیاندا، بە تەواوی چین و توێژەکانیانەوە و، زانایانی هاندا بە دەرس وتنەوە و، ڕاڤە کردن و لێکدانەوەی کاروبارەکانی ئاین. بەلاٌم پاراستنی کتێبەکە لە لادان و گۆڕین و خراپ حاڵی کردن و لێك دانەوە، کۆمەڵێ لە یاسازان و فەقیهەکان پێوەی هەڵسان و، بارەگایان لە پەرستگایەکی (ئیستەخر) دانا.

## (کۆتایی زەردەشت)

زەردەشت لەو ماوەیەی، کە دان بە ئاین دا هێنرا کە دەستوری ولاٌتی ئێرانی کۆن بێ لە تەواوی ناوچەکانی ولاٌتدا، وەکو مامۆستا و ڕاڤە کەرێ بۆ سروشی خوا ئەو ساڵانەی بەڕێ کرد و، خەڵکی بانگێشە دەکرد بۆ دەست گرتن بە ڕێنومایی خوایی و، گوێڕایەڵیکردنی تەواوی ئەوەی هێناویەتی بۆیان، لە کاتێدا جەنگ لە نێوان ئەوان و تورانیەکاندا سەری هەڵدا، زەردەشت گەیشتبووە تەمەنێ کە وای لێ بکات لە یەکێ لە پەرستگاکانی بەڵخی پایتەختدا بۆ خوا پەرستی لێ بڕێ.

شەڕ لەگەڵ تورانیەکان[1] بەردەوام نوێ دەبۆوە، زەردەشت لە کاتی لاویدا لە یەکێ لەو شەڕانەدا بەشداری کرد و، لەسەردەمی شاگستاسپدا وەك ڕابردو شەڕ ڕویدایەوە، بەلاٌم لەم شەڕەدا توانیان بەسەرکردایەتی ئەرجاسپ (arjasp) سوپای فارسی لە چەند شەڕێکدا تێك بشکێنن، کە هەموو جار پایتەختەکە دەست بەسەر دەکرا.

لە کاتی پەلاماری داگیرکەرانی کاول کەردا لە شەقامەکانی شاردا، زەردەشت وەك خۆی وابوو لە پەرستگادا نوێژی دەکرد، سێ کەس لە سوپاکە لە

[1] تورانیەکان: (تورکەکان). (وەرگێڕ)

پەرستگاکەدا بەلاّم هاتنە سەری نەترسا و نارەحەت نەبوو، بەلّکو بەخێر هاتنی لە شەهید بوون کرد و، شمشێرەکەی بەرەو رووی دوژمن هەلّکێشا و، بابای تورانی کە ناوی لە سەرچاوەکانی پەهلەویدا بە توریاداتور (turbaratur) هاتووە یان توری براتراریچ (bratraresh) چووە پێشی و شمشێرەکەی لێدا بە خێرایی و، پیری پێغەمبەر بەرگەی نەگرت، گورج گیانی سپارد.

زەردەشت بەپێی سالّنامەی نوێ کە لە ناو زەردەشتییەکانی هیند و ئێرانی نوێ کاری پێ دەکرێ، لە رۆژی (١١) سالّی (٤٨)ی بانگەوازیەکەیدا کوژرا، کە دەکاتە رێکەوتی (مانگی مایۆ سالّی (٥٨٣پ.ز)، لە تەمەنێکدا کە مەجوسی هیند لەم چاخەدا بە (٧٧) سالّ و چل رۆژ دەیخەملێنن.

شاکستاسپ لە کاتی گیرانی پایتەختەکەی بە دەستی داگیرکەران، لە شاری سیستان (seistitan) بوو، هەر کە هەوالّی شەهید بوونی زەردەشتی پێ گەیشت نیگەران بوو، سوێندی خوارد لەسەر خستنی ئاین و پتەو کردنی، تا لە ژیاندا مابێ، پاشان حەکیم جاماسفی کردە سەرپەرشتکار، کە حەواری و قوتابی نزیکی زەردەشت بوو، لە هەمووان زیاتر لە فیقهی زەردەشت شارەزا بوو، وە بۆ رابەرایەتی روحی لە بری زەردەشت لە ولاّتدا وەرگرت و بوەجێنشینی، کاری راڤە کردن و لێکدانەوە و، پاراستنی ئاڤێستا بەو سپێرا بوو[1]

---

[1] ئاڤێستا شەرحی بۆ کراوە بە ناوی زەند.

لای ئەندریاز لە (تۆیستە)وە هاتووە واتە (بنچینە) و لای بارثۆلۆمی ئاوێستازان بەشی کۆتاییەکەی (ئاڤێستا) مانای پەنا هەلّدەگرێ یان کۆمەك. بەو پێیە ئاڤێستا بە مانای زانین یان کۆمەکی دێت. لە پەهلەویدا بووە بە (ئەڤستاك - ئەپەستاك) (بڕوانە فەرهەنگی ئیریەن ڤەج/محمدامین هەورامی).

وە لە کتێبی (أمارة بهدینان/صدیق الدملوجي) دا هاتووە: هەموو کوردەکان کەمێ نەبێ چوونە ناو ئاینی زەردەشتیەوە، تا ئیسلام هات خۆرهەلاّت و خۆرئاوای گرتەوە، تەنیا ئیزیدییەکان نەبێ.

# بەندی دووەم:

## بنەماکانی ئاین

گەلانی ئاری کۆن لە هیند و فارسدا بە خوای گەورەیان ووتووە، واتە ڕووناکی و ڕۆشنایی، لەو ماوەیەدا کە دوور نەبووە لەو کاتەی سروش بۆ زەردەشت دابەزی بوو، هەمان ناو بە دیاردە سروشتیە جیاکان و بتەکان دەوترا، کاتێ زەردەشت بە پێغەمبەر و ڕەوانە کراو هەڵبژێرا بۆ تایبەتانی گەلەکەی ناوی حەقیقی خودای پێ دان کە (ئەهورا مزدا)یە و خوای ڕاستەقینەیە[1].

ناوەکە لە بنەمای زمانەوانیە کۆنەکەیدا بۆ پێغەمبەرەکەیان نامۆ و تازە نییە، بەڵکو لەئێران ناو هۆزەکانی ئاریدا هەبووە لە ئێراندا، لەگەڵ جیاوازی یەکی کەم لە پیتەکاندا کە گوێی پێ نادرێت، پێش خستن و دواخستنی دوو بڕگەکانی ناوەکە مانا و واتای زمانەوانیەکەی ناگۆڕێ، هەتا میدیەکان لە یەکێ لە بڕگەکانی دا (مزدا) ناوی (مازداکا mardaka) دروست دەکەن کە تا دوای (٧١٥پ.ز) لە ناویاندا بەکار هاتووە.

---

[1] جان ناس لە کتێبی (تاریخ جامع ادیان/ترجمە / علی اصغر حکمت/ل ٣٠٦) دا دەڵێ: (زەردەشت بە ڕوونی باسی کردووە ئەو (دێوە)ی تورانیەکان دەیپەرستن هەم مفان روحی چەپەڵ و زیانبەخشە و هەردەم لەگەڵ روحی خێر و بەسودا لە جەنگدایە و، ئەو باوکانی درۆ کردنن لەگەڵ روحە پاکەکاندا و فریو دانیان و، ئەوان چاوگی شەڕو خراپەن و، ئەوانن مرۆڤ لە پەرستنی ئاهورا مزدا قەدەغە دەکەن).
بەو پێیە پەرستنی دوو خوایی لە ناو گەلی ئاریدا باو بووە، شەیتان (ئەهریمەن) پیرۆز سەیر کراوە، ئەمەش لەگەڵ پەرستنی بت و دیاردەی سروشتیدا.
دوور نیە ئەم ئامۆژگاریەی ئیبراهیم (ع) ئاراستەی باوکی دەکات (يَاأَبَتِ لاَ تَعْبُدِ الشَّيْطَانَ إِنَّ لشَّيْطَانَ. . . . )مەبەست لە پەرستنی ڕاستەقینە بێ نەك گوێڕایەڵی بۆ شەیتان. (خوازا ناترە).
ئیمڕۆش لای یزیدیەکان شەیتان بە پیرۆز ڕاگرتن هەرماوە. (وەرگێڕ)

ئەو شتە نوێیەی زەردەشت هێنای ڕێنوێنی ئەو بوو بۆ خوای تاقانە، کـە بـە تـەنیا دروست کردن و بەدیهێنانی کردووە هاوشێوە، وێنەی نییە، سیفەتی دامالێن (التجریدیە) تەنیا ئەوە بوو لە بڕواکانی بت پەرستی گەلی مادد و فارسیدا باو نەبووە.

کارەکە لای فارس سنوری خواناسی ئاسایی دەبەزێنێ، تا دەگاتە ئاسـتی پـەی پێ بردنی قوڵ بۆ حەقیقەتی ئولوهییەتی ئەو، کە وای لێ کردن بگەنـە ئـەوە کـە ئەو خوایە تەنیا هی ئەوان نییە، یان هەر تـەنیا هـی خـەڵك نییـە بـەڵکو خـوای هەموو کەسە و خوای هەموو جیهانە، ئەمەش سەیر نییە ئاشوریەکان بـەر لـەوان خوایان بە ئەسارامازاس ناوبردووە (assaramasaz).ئەو خوایە لـە پێـك هاتنـدا هاوواتای (ئەهورا مزدا)یە کە مانای (خوای تاك و تەنیا و کارزان) دەبەخـشێ و، کە هەمان واتای هەیە کە ئاریەکان پێناسەیان بۆ کردوە[1].

زۆر لە مێژوو نوسە زەردەشتیەکان بۆ ئەوە دەچن کـە نـاوی (ئـەهورا مـزدا) لـە ووشەدا وێنە و هاوتای نییە و، داهێنراوی زەردەشـتیە و، ناچـار بـووە نـاوەکی ئـاوا دابێنێ کە لە ناوی خواکانی ئەوان جیا بێ کە لە ناو و کردەوەدا لە خوایان چواندوون.

وەڵام دانەوەی ڕاستەوخۆ بۆ بۆچوونی ئەوان، بوونی ئەم ناوە بووە بەر لە ڕەوانە کردنی زەردەشتدا و، خـەڵکی - وەك پێـشتر زانیمـان - بـەپێی جیـاوازی بـڕوا و جیاوازی زمانیان ناسیویانە و، لە قسە پێ کردندا لێك نزیـك بـووە و، لـە واتـادا وەکو یەك بووە، وە لە سیفاتیشیدا و، سەرباری بەڵگەی ئاشکرای لەوەدا کە خـودا تاك و گەورە و بەرزە.

---

[1] وەك لە (المنجد فی الاسلام) و سەرچاوەی تردا هاتووە ئاشوریەکان گەلەکی سامین (۲۰۰۰پ. ز) لـە دۆڵی دوزێدا نیشتەجێ بوون و، ماوەی (۱۰) سەدە حوکمی دنیایـان کـردووە، دەسـەڵاتیان بەسـەر دۆڵی دوزێ و کلدانی و ماد و بەنوئیسرائیلیەکاندا گرتووە، دوایی گەلی ماد و بابلیەکان، یان مـاد بە تەنیا لە (٦١٢-٦١٠ پ. ز) لە ناویان بردووە وە لـە (سـفر الأشـعیاء) دا ئامـاژە بـەم جەنگـە کراوە: (ها أنا أثیر علیهم المادیین. . . . . . . )۱۸/۳.

ڕوانە (الیهود فی القران) و (المنجد فی الاعلام) (کورد و کوردستان/ئارشاك سافراستیان). (وەرگێڕ)

ووشەی (الله) لە زمانی ئاڤێستای کۆندا لە سێ ووشە پێك دێ (ئاهو) و (را) و (مزدا). کە بە تەنیایی و لێکدراوی واتاکەیان سێ مانا دەدات (من - لە ئارادا - کردگار) . ئەم سێ ووشانە ناتوانرێ و ئاسان نییە بیانگێڕینەوە سەریەك و پێکیان بێنین، نەك لەبەر نادیارییەکەی لە ئسولّی فارسیدا، بەلّکو لەبەرئەوەی سێ ووشەکان ناوەڕۆکی قسە پێ دەدەن بە دەستەوە، بەلاّم بەسەریەکەوە هیچ ناوێ نابەخشن لە کاتی وەرگێڕانیانداو، ناوێك نادات کە ئاماژەیەکی بابەتی زاراوەیی ئاماژەی بۆ بکات.

کەواتە سێ ووشەکان لە بنەڕەتی کۆنیدا یەك پەیڤ و ووشە بووە و، وەکو دیارە لە دورەوە مانای شەهادەی (لا إله إلا الله - جگە لەخودا هیچ پەرستراوێك شایەنی پەرستن نیە) دەدات بە دەستەوە کە لە بیرو بڕوای ئیسلامیدا هەیە، بەلّگەش ئەوەیە کە (تقدیر)ی مانای (الشهادە) بریتییە لە (موجود)، واتە: (انا موجود) بە تەواوی نەفی هەر بونێکی جگە لە بوونی خوای گەورە دەکات بە بێ سنوری و، لە هەمان کاتدا تاکە سەلماندنی بوونی زاتی بەرزی ئەوە.

پێکهاتەی ووشەکە لە فارسی کۆنیشدا لەوە نزیکە و، بە پوختی ئاماژە بۆ خودی تاقانەیی تەنیایی ئەو دەکات لە بوونی زاتیدا، هەموو بونەکی تری جگە لە بوونی ئەو بونەکی بابەتی هەیە و لادەچێت و، تەنیا ئەو بوونی ڕاستەقینەی سەربەخۆی دەبێت. هەر چۆنەك بێ پەیوەست کردنی بوونی ڕەهای خوای گەورە بە (من الأنا)ەوە لە زەردەشتی یەت و ئیسلامدا، بونەکی زانستی بە بوونەکە دەدات بەو مانایەی (منی - الأنیة) بە شێوەیەکی زانستی بە بوونی ڕەهاوە بەند بووە، کە مانای بوونی ئەوی لێ کرد کە لە ئارادا بێ و، زانراو و ناسراو بێ و، مەبەستی ڕاستەقینەش لە دوای ئەوەوە مل کەچ نەکردنی خوای گەورەیە بۆ بڕیارەکانی هزری ڕووت.

وە لە بیروباوەڕی زەردەشتیدا - وەك دوایی دەبینین - هزری مرۆڤایەتی ناتوانێ پەی بە حەقیقەتی خوای بەرز ببات و، ئەندێشە ناتوانێ وێنەی بکات و،

گەیشتنیش بە ئاشنا بوون بە نهێنی حەقیقەتی خودەکەی ئەگەر نابێ و، هیچ هزرەکی هۆشیار و فامیدە نایتوانێ، هەموو ئەوەی کە دەتوانرێ ئەو سیفەتانەن کە خۆی پێ وەسف کردووە و ناویردووە، کە ئەم سیفەتانەن لە بڕوای ئیسلامدا بە ناوو سیفەتە تەواو و شیاوەکانی شایستە بە خوای گەورە ناسراون.

## خودا: ناوەکان و سیفەتەکان:

زۆر شتی ڕەچاو کراو حوکم دەدات لە پێناسە کردنی خوای گەورە بە خودی خۆی بۆ خەڵك، گرنگترین و دەرکەوتوترینی ئەو شتە ڕەچاو کراوانە تایبەتمەندی سروشە بە خودی چەند کەسێکەوە و، سنورداری کاتەکەیان و، ئەم مەبەستەی لە بەری هاتۆتە خوار، بە شێوەیەکی تریش پێناسە کردن و ڕوونکردنەوەکە پەیوەستە بە هێنانە دی ئەم مەبەستانە و، بە ناچارییەوە ئەوە تەنیا بۆ خودایە.

لە بابەتی زەردەشتێتی دا توێژەر تووشی کۆسپێ دەبێ کە ناکرێ خۆی لێ نەزان بکرێ، ئەویش ئەوەیە کە ئەو کەسەی پێناسەی خوا دەکات بەشی هەرە زۆری زەردەشتە و، لە پێناسە کردنی خواشدا دوو ڕێگا دەگرێت:

- یان ئەوەتا ڕاستەوخۆ پرسیار لە پەروەردگاری دەکات لە زات و ناوەکانی و سیفەتەکانی و، پەروەردگاریش لە سنووری ئەوەی کە پرسیاری لێ کردووە وەڵامی دەداتەوە.
- یان زەردەشت لە کاتی پاڕانەوە و ئاخاوتنەکانی دا دەیناسێنێ، وەکو لە زۆر لە پەڕاوەکانی (ڤەندیداد) و (ئەلیسنا)دا هەیە.

زۆربەی ئەوانەیلەزەردەشتیەتدا توشی بیری ئولوهیەت بوون لە توێژینەوەکانیاندا گرنگی پێناسە کردنی خوا بە خودی خۆی وەك ڕوکنەکی جەوهەری لە پەیوەندی تەکلیفی دا بەر کەنار کرد و لایان برد و، شوێن دەقە گۆڕاوەکان و دورەکان لە بناغەکانی دین کەوتن، هەتا دانانی زەردەشت بە یەکەم پێغەمبەر و ڕەوانە کراو لە مێژوودا، بۆ یەکەم جار خوای بە خەڵك ناساند بێت.

ئەوەی ئەوانە بۆی چوون کارێکە تا خودی پیشەکەی ڕەوانە کراو (المرسَل) بە درۆی دەخاتەوە کە بە زۆری لەو سنورەدا کورت دەبێتەوە کە سروشی خوای گەورە ڕادەگەیەنێ و خوای گەورەیان پێ دەناسێنێ و بەپێی پێویستیش بێ زیاد و کەمی ناساندن ئەنجام دەدرێت.

ئەوەی زەردەشتیش پێوەی هەڵسا ئەوەی بە ڕاست دادەنرێ بە زۆری لەوەدا چڕ دەبێتەوە، کە حەقیقەتی خوای وەك ویستویەتی بە خەڵك ناساندووە، بە ناوو سیفاتەوە و، بەپێی سنوری توانای هزریان، تا ئەو زانیارییە یارمەتیان بدات بۆ حاڵی بوون و وەرگرتنی ئەرکەکان و داخوازییەکانی پەیوەندی تەکلیفی و ئەرك پێ سپاردن.

لە ناساندنی خواشدا ئەو زمانەی بەکارهێناوە کە ئەو سەردەمە قسەی پێ کراوە و، بە شێوەیەکی هزری و ژیری و ماناکەی لە پەی پێ بردنیان نزیك خستۆتەوە، بە وێچواندن و ئەو پێوانانەی لە ژیانی ئەواندا باو بووە و، لە هەمان کاتیشدا خوای دانەبەزاندۆتە ئاستێکەوە کە زیان لە کەماڵی خوایی بدات و بیخاتە تایەی دروستکراوانیەوە.

لەم خستنە ڕووەماندا بۆ زاتی خودا و ناوو سیفەتەکانی، پشتمان بەوە بەستووە کە لە سەردەمی ساسانیدا کۆکراوەتەوە و نووسراوەتەوە و داڕێژراوەتەوە و، بەشی زۆری لە ئاڤێستادا دانراوە، تەنیا ئەوەندەشە جارێك لە ناوەڕۆکی بیروباوەڕی ئیسلامی نزیك دەبێتەوە و، جارێکی تریش یەك دەگرێتەوە، هەرچی شتی ڕیزپەڕ (شاذ)ە، زۆر بە کەمی نەبێ ئاوڕی لێ نادەینەوە.

بۆیە ئەو واتا و مانا و ئەندێشە و دیمەنە هزریانە، چۆنمان دەست کەوتووە ئاوا لەسەری ماوینەوە، نەك هەر لەبەر زۆر نزیکیەکەی لەوەی کە زەردەشت وتویەتی، بەڵکو لەبەرئەوەی ڕاسترین پێناسینن بۆ خودا لەو چاخە دورە دا و، بۆ ئەو خەڵکانەش بە تەنیا[1].

---

[1] بە بڕوای من ئەم وەسفانەی ئاڤێستا بۆ خوا سادە نین بەڵکو هەمان وەسفن کە لە قورئان و سووننەتدا هاتوون.

لــە ئاڤێــستادا هــاتووە: خــوا ڕووناکیــە و وەســف نــاکرێ، لــە درەوشــاوە و پڕشنگداری دا وێنــەی نییــە، ئــەو سەرچــاوەی ڕووناکیــەکانــە، بۆیــە هــیچ شــتێ نابینێ، بەڵکو ئەو هەموو شتەکان دەبینێ و، هیچ شتەکی نە لە زەویدا و نە لــە ئاسماندا لێ وون نابێت.

وە خوا تاك و تەنیایە و بێ هاویەشە لــە مــولکی دا و، کــەس نییــە کێــشەی لەگەڵ بکات لە ناویدا و، لە دەسەڵاتدا کەس پێشبرکێی ناکات و، ئەو کــە مــاڵی ڕەهایە و، ئەو گەورەترینە و کەس لەو گەورەتر ناناسێ و، ئەو ڕاگرە و وێنەی نییە لە بوونەوەردا و، ئەو پەروەردگاری جیهانەکانە و، هەڵسوڕێنەری هەموو شتەکانە.

خودا زەمان و کات کاری تێناکا و ئەو لەسەرووی کاتەوەیە، ئێستاو پێشتریش هەروەکو خۆیەتی و، سەرەتا و کۆتایی نییە، هیچ زەمان و کاتێ نییە ئــەوی تێــدا نەبووبێ و پاشان پەیدا بووبێ و، چۆن بووە ئاوەها دەمێنێتەوە، هیچ شتێ بەر لەو نەبووە و، دوای ئەو هیچ شتێ نییە، ئەو سەرەتایە و بڕانەوەی نییە، ئــەو کۆنــە و ئەزەلی و هەتا سەرە.

ئەو بەر لە جیهاندا هەبووە لە هەموو شتێکدا ئاشکرایە، بەڵام نــاتوانرێ پــەی پێ ببرێ و بزانرێ و، ئەو نادیارە و، ڕووناکیەکەی شــاراوەیە لــە هەســتیارەکان و، بەعەقڵ نەبێ ناناسرێت.

دوای پاك ڕاگرتنی خوا لــە هاوشــێوەیی و هــاو وێنــەیی لــە زات و بونــدا لــە ڕەوشتی بەجەستەکردن و (التجسم) و کەم و کوریەکانی ماددی بە پــاك ڕادەگــرێ، وە لە ڕواڵەتەکانی گۆڕین و کارتێکران و کاردانــەوە، بــەڵکو وەکــو لــە عەقیــدەی زەردەشتیدا هاتووە ئەگەر نییە بۆ زاتی خوای بەرز هەر سنور و هاوتایــەك، خــودا وەك زەردەشت وەسفی دەکات لە کەس نەبووە و، کەسی لێ نەبووە و، قەت نامرێ و، نانوێ و لە لایەکەوە نابینرێ و، هــیچ شــوێنێ نایگرێتــە خــۆی و، دەســتی لێ نادرێ و، زۆر شتی تر کە خوا بڵندە لەو شتانە.

لەگەڵ ئەو بێ گەرد ڕاگرتنە بێ سنورەدا، بە هیچ هێمایەك هێمای بۆ ناکرێ و، بە هیچ شتەکی ماددی ئاماژەی بۆ ناکرێ و، دروست نییە لە هیچ شێوەیێ دا وێنە بیر بکرێ، ماددی بێ یان گیانی، لە هەر کام لەو شتانەدا خوا لە ئاستی خوایەتی دادەبەزێنرێتە ئاستی شتەکی هەست پێ کراو و پەی براو.

وە پاك ڕاگرتن و بێ گەرد ڕاگرتنی خوا، مانای ئەوە نیە لە دروستکراوەکانی دوور بێت، کە بەندەکانی هاودەمی نەبن و، هەموو کەس هەست بە تەنیایی بکات لەو و، بەڵکو نزیکە و بەندە بە سۆراغ کردن لێی ماندو نابێ و، ناسراوە و مرۆڤ لێ دور ناکەوێتەوە وە هەست پێ کراوە و مرۆڤ دەتوانێ پەیوەندی گەرمی لەگەڵدا ببەستێ کە لە سەر هەست کردن بە هۆگری و هاودەمی و خۆشەویستی و بە گەورە دانان دامەزرابێت[1] بەڵام سیفاتی خودا لە پەڕەکانی ئاڤێستادا پەرش و بڵاو

---

[1] ئەم ناساندنەی لێرەدا سەبارەت خواناسی ئاڤێستا پێشکەشی کردووە، قورئان و سوننەت و ئیسلام و زانستی نوێش، هەتا فەلسەفەش هەمان بڕوایان هەیە و، بێ کەم و زیاد هەمان زانیاری لەمەڕ خودا ناسی پێشکەش دەکەن و، لەوە زیاتریان نەوتووە. قورئانی مەزن دەفەرمێ: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ(١)اللَّهُ الصَّمَدُ(٢)لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ(٣)وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ). واتە: بڵێ: خودا تەنیایە، خوا بێ نیازە، کەسی لێ نەبووە و، لە کەس نەبووە، وە هاوتای نییە.

(اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلاَ يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلاَّ بِمَا شَاءَ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَلاَ يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ) البقرة/

واتە: خوا ئەو خوایەیە جگە لەو خوای تر نییە و، زیندوە و ڕاگرە. سوکە خەو و نوستن نایگرێ و، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە بۆ ئەوە، کێ هەیە شەفاعەت بکات لای ئەو بە ڕێگادانی ئەو نەبێ، ئەوەی لە بەردەستیاندایە و ئەوەی لە دواوەیانە (نەهاتووە)، کەس ناتوانێ شتێ لە زانیاری ئەو بزانێ بە ویستی ئەو نەبێ، کورسی ئەو بە قەدە ئاسمانەکان و زەوی فراوانە و، پاراستنی ئەوانەش بەلایەوە دژوار نییە و، ئەو بەرزە و گەورەیە.

(هُوَ الأَوَّلُ وَالآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ).

واتە: ئەو سەرەتایە و کۆتایی نییە و، ئاشکرایە و پەنهانە.

(لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ).=

بوونەوە و، بە زۆری لە (ڤەندیداد) و (ئەلیسنا) دا هاتوون و، جاریٚ بە ئاشکرایی و جاریٚ سیفەتیٚ دیٚ لە ڕیزی گشتیدا و لەو نێوانەدا لێی حاڵی دەبێت، سیفاتەکان لە هەردوو دۆخدا ئەم مانایانە دەدات کە پەیوەندییان بە زاتی ئەوەوە هەیە، هەروەها ئەو دۆخانەی ئەوی لەسەرە، ئەو لە ڕێنووێنی خۆیدا چەند دیاردە و

---

= واتە: هاوشێوەی نییە و ئەو بیسەر و بینەرە.

(كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ(٢٦)وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالإِكْرَامِ).

واتە: هەرچی لە سەر زەویە دەمریٚ و خودی پەروەردگارت دەمێنێتەوە کە خاوەن شکۆ و ڕێزە. لە ڕووی زانستییەوە ئەگەر سەیر بکەین (ادوارد لوثر کیسل) لە کتێبی (الله يتجلى في عصر العلم) کە کۆمەڵێ پسپۆری ئەمریکی تازە نوسیویانە دەڵێ: (هەندێ زانا وا دەزانن ئەم گەردوونە دروستکەری خۆیەتی و، هەندێ وا دەزانن بڕوا بوون بە ئەزەلییەتی گەردون لە بڕوا بوون بە خوایەکی ئەزەلی دژوارتر نییە. بەڵام یاسای دینامیکی گەرمی هەڵەی ئەم ڕایەی دوای دەسەلمێنێ. زانست زۆر بە ئاشکرایی ئەوەی سەلماندووە کە ناشێ ئەم گەردوونە ئەزەلی بێ و، لێرەدا بەردەوام گەرمایی لە تەنە گەرمەکانەوە بۆ تەنە ساردەکان دەڕوات و، پێچەوانەش ڕوودەدات بە شێوەیێ بەهێزی خۆیی لە تەنە گەرمەکانەوە بۆ تەنە گەرمەکان بگەڕێتەوە، بەم مانایە گەردوون بۆ پلەیێ دەڕوات کە هەموو تەنەکان پلەی گەرمییان بگەڕێتەوە، بەم مانایە گەردون بۆ پلەیێ دەڕوات کە هەموو تەنەکان پلەی گەرمییان یەکسان دەبێ و، ئەو واتە وزەکە سەرچاوەکەی ووشك دەبێت. ئەو کاتە لێرەدا کرداری کیمیاوی و سروشتی نابێ و، هیچ شوێنەوارەکی ژیان لەم گەردوونەدا نابێت.

مادام ژیان هێشتا بەردەوامە و، کرداری کیمیاوی و سروشتی بە ڕێگای خۆیدا دەڕوات ئێمە دەتوانین لەمەدا بەم ئاکامە بگەین کە ئەم گەردونە ئەزەلی نییە، ئەگەر نا لە مێژبوو وزەکەی لە دەست دەدا و هەموو چالاکی یەك لە بوونەوەردا دەوەستا.

بەم شێوە زانیاری بێ مەبەست گەیشتە ئەوە کە ئەم گەردوونە سەرەتای هەیە. ئەمەش بوونی خوا دەسەلمێنێ، چونکە ئەوەی سەرەتای نەبێ ناشێ خۆی دەستی کردبێ بە دەست پێ کردن، بەڵکو دەبێ کەسێ هەبێ دەستی پێ کردبێ، یان دەبێ بزۆکەکی یەکەمین هەبێ، یان دروستکەرێ، کە خودایە).

وە هەتا لە ئینجیلدا لە هەندێ دەقی دەسکاری نەکراودا ئاماژەی بە تاقانەیی خودا کراوە، نەك سێ خوایی کە پۆڵس هێنایە ناو ئینجیلەوە. بۆ نموونە: (الرب الهنا هو رب الأحد). مرقس /١٢/ ٣٠.

واتە: پەروەردگار خوامانە و، ئەو پەروەدگاری تەنیایە. (وەرگێڕ)

حاڵەتەکی زوو پەرش بووە و نییە، بەڵکو ئەو (جەوهەری زاتی ئـەوە). پاشـان لـە خاسیەتەکانی زاتی خوایی پاك و بێ گەرد ڕاگرتن (التجرید والتنزیه) لە هاو وێنە و هاوشێوە وەرگیراوە.

ئەم ڕاستییە لە بارەی سـیفەتەکانی خـودا سـەرنجی ئـەو زانایانـەی ڕاکێـشا کـە پیشەیان بەراورد کردنی ئاینەکانە (مقارنە الادیـان) چـونکە سـیفەتی خـوا وەك لـە ئاڤێستادا هاتووە لە واتا و پەیوەست بووندا جیا نییە لەوەی ئاینی ئیسلام هێناویەتی وەك دوا پەیام، وە ئاینەکە لە بناغەی دروست بونیەوە وەك دەبینرێ لەسـەر بناغـەی دوانەیی (الثنائي) دا دادەمەزرێ کە کێـشە لـە نێـوان چـەند هێزەکـی دژ بـە یـەك دەسەڵاتی بەسەر دادەگرێ و، هەریەکە دەیەوێ دەسەڵات بەسەر دنیادا بگرێت.

سیفەتی ئەرك پێ سپێر (المکلّف) یەکەم سـیفەتە لـە بیروبـاوەڕی زەردەشـتیدا دەست نیشان کراوە، زەردەشـت حـەق خـودای بـە فەرمانـدەری یاسـاکان (الآمـر بالقوانین) یان (بەخشەری یاساکان) وەسف کردوە. ئەم وەسفەش کاتەکەی هـەر بـە سەردەمی ئەوەوە نەبەستراوەتەوە و، هەر بە نامەی ئەوەوە بەنـد نـەکراوە، بـەڵکو دەڵێ: (هەر لەو کاتەوە مرۆڤی دروست کردووە و جیهانی دروست کـردووە).واتـە: سیفەتەکە بە حوکمی خوایەتی بۆ ئەوە.

تەواوی سیفاتی ئەرك پێسپێر (المکلّف) پەیوەستە بەوەی کـە زەردەشـت نـاوی ناوە بە (یاساکانی سزا و پاداشت). واتە: پاداشت و تۆڵە بەو وەسـفەی بەرهـەمی سروشتی یە بۆ پەیوەندی تەکلیفی و، مەبەستی گەورە لە تەکلیف، ئەگـەر بابـای ئەرك پێ سپێراو (المکلّـف) ئەو ڕێگا و ڕەفتارە هەڵبژێرێ و هاوڕێکی ئەوە بێ کـە خوای گەورە دەیەوێ، پاداشـتی دەداتـەوە بـە بەهەشـت و، ئەگـەر لـە هـەڵس و کەوتەکەیدا لە هەڵبژاردنەکەیدا پێچەوانەی ئەوە بوو، کە خوا ویستی لەسـەرە بـە ئاگر سزا دەدرێت.

پاداشت و سزا لە زەردەشتدا وەکو حاڵەتی ئیـسلام لەسـەر دادگـەری و بـەزەیی دامەزراوە. خودا پاداشتی گوێڕایەڵ دەداتەوە و، پاداشتی کەمترین چاکەی دەداتـەوە

بە دادگەری و سۆزی خۆیەوە و، وا سەیری تاوانبار و گوناهکار دەکات کە یاساکانی خوای پەڕاوێز کردووە کە نەخۆشە و پێویستی بە چاك کردن و پاکژ کردنەوە هەیە و، جا خودای حەق شکۆدار بە دادگەری خۆی تۆڵەی ئەو تاوانەی کردونی لێی دەستێنێتەوە و، بە بەزەیی خۆی چاوپۆشی دەکات لەوەی سەبارەت بە ئەو تاوانی کردووە و، لە هەردوو دۆخ دا لە دادگەری و بەزەیی خوا خاڵی نییە.ئەگەر سیفەتی ئەرك سپێر (المكلّف) واتای بە خوا زانین و پەرستنی تێدا بوو بۆ خوا بێگومان سیفەتی بەدیهێنان و دروستکردن واتاکانی بەڕێوەبردن و، خاوەن موڵکی و دەسەڵات و بەهرە بەخشی دەگرێتە خۆی. سفری (ئەلیسنا) باس دەکات کە خوا بە تەنیا دروستکەرە و داهێنەری هەموو شتەکانە و، دروستکراوان بەر لە دروستکردنی خوایی هیچ شتەکی لەگەڵدا نەبووە و، پاشان بە هەڵبژاردنی خۆی دروستی کردوە و دایهێناوە بە بێ سوود وەرگرتن لە ڕابردوو، وە بۆ مەبەست و ئامانجەکی دیاریکراو و ئەنقەست نەك بە بێ هودەیی و گاڵتە و گەپ، لەبەرئەوە هەرچی حیکمەت و لێزانی و بە کەم زانینی تێدا بێ لە دروستکردنی خوادا دوری خستۆتەوە.

## دروستکراوانی خوای گەورەش دوو جۆرن:

- جۆرێکیان لە ژێر دەسەڵاتی ڕەهای ئەودا دروستکراوە و، دانانی کاروبارەکانی لە ژێر دەستی ئەو دایە وەکو تەنە ئاسمانیەکان و زەوی و چیاکان و خۆر و مانگ و شەو و ڕۆژ و ئاو و ئاگر و، ئەستێرەکان و هەسارەکان و باو و گیانداران و ڕووەك و تەنە ڕەقەکان.
- جۆرەکی تریان خوا تایبەتی کردووە بە هەرەی زانیاری پێداون وەکو جنۆکە و فریشتە و مرۆڤ. لە ناو ئەوانەشدا مرۆڤی تایبەت کردوە و لەسەرەوەی ئەوانی تری داناوە و، بە هۆی گیانەوە کە لە لایەن خواوە پێی دراوە ڕێزدار تر کراوە و، هزر و توانا و بیرو هەستیاری تێدا ڕیز کردوە و ڕێك خستووە تا لە ژیاندا

جووڵەیەکی خۆیی یان هەبێ و خاوەن ویست و سەرپشك بن و، ئەنجا خوا ڕێزی سروشتی خوایی و وتوویژی ئەرك پێ سپاردنی لێیان نابن بە نمایندە و بریکاری ئەو لە زەویدا و، بێن بە جێنشینی ئەو لە زەویدا بۆ دروستکراوانی ئەو.

سیفەتی کردگاری پەیوەندییە بە سیفەتی کارتێکردن هەیە لە زەردەشتیدا، سفری ئەلیسنا جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە خوا بە تەنیا کارتێکەری یەکەمە لە هەموو شتێك و، ئەو چاوگی ڕاستەقینەی هەموو شتێکە بە تەواوی و، هەموو جووڵە و خامۆشی یەك لە جیهاندا، چاك و خراپ، جوان و دزێو، بەختەوەری و بەدشانسی و، مردن و ژیان هەموویان سەرچاوەی گەڕانەوەیان بۆ خوایە. وە خوا خۆی (با) هەڵدەکات و، هەر ئەو باوکی لەسەر خۆشەویستی کورەکەی سروشت کرد و، ڕەمەکی سۆز و بەزەیی لە گیانداراندا داناوە بەرامبەر بە بێچووەکانیان و، هەر شتێ لە بوونەوەر و گەردووندا هەیە کەم و زۆری و، گەورە و بچووکی سەرچاوەی گەڕانەوەی هەر بۆ خودایە.

وەکو لە سفری (ئەلیسنا) داهاتووە بە بێ خوا هیچ شتێ نامێنێ و بە ئەو دروستکراومان دەبن بە خاوەن ژیان، ئەو بەوە ئاماژە بۆ سیفەتی پارێزە دوپاراستن دەکات، واتە خودا ژیان لە بەشی گیانداراندا دەهێڵێتەوە بۆ گێڕانی ڕۆڵیان لە بوونەوەردا و، هەر ئەویش دوای تەواو کردنی ئەرکەکەیان و ڕۆڵەکەیان لەو سنوورەدا کە بۆی دروست کراون دەیانمرێنێ و لە ناویان دەبات.

لە هەر دوو سیفەتی ئەرك سپێر و کردگاریدا (المكلّف و الخالق) زۆر سیفەت و ناوی تری لێوە پەیدا بووە کە لە ئاڤێستا و ڕاڤە کانیدا هاتووە لە سەردەمی ساسانیدا و لەوانەش کە باسیان دەکەین: (الواحد الاحد، القدوس، النور، الكريم، الازلي، رب الارباب، مالك الملوك، الكبير، الجميل، المنعم، نصير الاطهار، غافر الذنب، القوي، القهار، الغني، الكامل، الشريف، الشافي، المعافي، المانع، الجامع، الطيب، المنتقم، العطوف، السيد، الحسيب، شديد العقاب).

سیفەتە ئولوهییەتەکان و ربوبییەکانی خوا بۆ سێ سیفەت دەگەڕێنەوە کە لە عەقیدەی ئیسلامیدا هاتوون: زانست و ویست و توانایی (العلم- الارادة، القدرة) لێرەدا کورتە ڕوونکردنەوەیەك دەخەینە سەر زانیاری و توانا کە هەردوو سیفەت نە لە ئاڤێستا و نە سەرچاوەکانی زەردەشتی بەکار هێنراون.

تایبەتمەندی زانستی خوایی و شکۆیەکەی، وەرگێڕی دەقی پەهلەوی ئاڤێستای بە چەند دەربڕینێ دەری بڕیون و وردترینیان ئەو گوتنەیەتی: (خودا گشتییە لە زانست دا، زانستی زۆرە، زۆر زانا و زانایە بە هەموو شتێك و، دەوری هەموو شتەکی داوە).

لێرەدا دەردەکەوێ گشتگیریی زانستی خوایی، خودا وەکو لە دەستەواژەکانی وەرگێڕ لێی حاڵی دەبین، ڕابردوو، ئێستا و، ئاینده دەزانێ و، ئاگادارە بە چرپە و خەیاڵەکانی مرۆڤ کە نەفس (دەرون) دروستییان دەکات و، لە ناخی دڵەکان ئاگادارە و، ئاگاداری وورد و درشتی دروستکراوانیەتی و، نهێنی نییە، لێی شاراوە بێ و، هیچ ڕووداوەك نییە بێ ئاگای ئەو ڕوویدات.

هەر لە سیفەتی زانستەوە خوا بە دانا و لێزان (الحكيم) ناودەبرێ و، بە شارەزا (الخبير) و بە شارەزا ناودەبرێ و، بە بینین وەسف دەکرێ و، ناودەبرێ بە بینا (البصير) و، کە چاوەکان پەی پێ دەبات و، چاوەکان پەی پێ نابەن.[1].

---

[1] (سید سابق) لە کتێبی (العقائد الاسلامیه/ ل٧١) دا دەنووسێ: سیفەتی خوای گەورە دوو جۆرە، سیفاتی زاتی کە بە (الثبوتیة - المعاني) ناسراون وەك: (الحیاة والعلم، والقدرة والارادة والسمع والبصر والکلام).

وە سیفەتی کرداری (الافعال) وەکو: (الخلق - الرزق) دروستکەر و ڕۆزی دەریش دروست دەکات و ڕۆزییان دەدات. زانایان کۆکن لەسەر ئەوە کە سیفەتی کرداری، جیان لە سیفەتی زاتی و، لەو زیادەن. بەڵام لە سیفەتی زاتیدا جیاوازن، ئایا ئەو سیفاتانە خودی زاتن یان زیادەن لەو. . . . ).

لە سیفەتی خوا لە قورئاندا (٩٩) ناوە یان سیفەتە: (هُوَ اللَّهُ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلاَمُ الْمُؤْمِنُ. . . . ) لە زانایانی هاوچەرخ (ئەندروکۆنوای ئیفی /فسیۆلۆجی) لە (الله یتجلی في عصر العلم/ل: ١٤٤) دا دەنووسێ: (من سیفاتی خوام بە درێژی و لەسەر بنەمای شیکردنەوەی لۆژیکی لێ=

بەڵام توانای خوایی ماناکەی وا دارێژراوە کە (پێویستی بە هیچ شتێ نییە).

ئەم واتایەش هەمان واتای ئیسلامی هەیە کە دەوڵەمەندی بێ سنوور و، پێویستی بە هیچ شتێ نییە و، هەموو شتێ لە زاتی و سیفەتدا پێویستی بە ئەوە.

توانای خوایە ئەوەیە کە هەموو کەس ملی بۆ درێژ دەکات تا توانا و وزەیان زۆر بێ و، دەرونیان قایم بێ بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی تاقیکردنەوەکانی ژیان، لێرەدا زۆر سات هەیە لە ژیانی مرۆڤدا هەست بە کز و لاوازی هێزەکەی دەکات و، تووشی خەڵك لێ تەکانەوە سەر شۆڕ کردن دەبێ لە لایانەوە، بۆیە پێویستی بە هێزەکی بە توانا هەیە پشتی پێ ببەسترێ و، ئەو وزەیەی لێ وەربگرێ یاریدە و کۆمەکی دەکات لە ژیانیدا، خوا بە تەنیا توانا و یاریدەی هەر کەسێ دەدات پەنای بۆ ببات و، ئەوەی لێیەتی لە هێز و کۆمەکی دەیخاتە بەردەمی.

---

=کۆلیەوە کە فەیلەسوفان پێوەی هەڵساون. دەتوانرێ بە بەکارهێنانی لۆژیك بگەیە ئەوە کە خوا خاوەن زۆر سیفەتی دیاری کراوە، ئەوانە کۆمەڵێکن لەو سیفەتانە کە هەموو باس نەکراون: خوا ئەبەدییە - نەمرە - نادیارە (لطیف) و ماددی نییە و، پەیدا نەبووە، بێ گەردە (القدوس)ە پاکە (الطیب) و ئاگاداری خراپەیە بەڵام خراپە کار نییە و خراپەی ناوێ و، ڕقی نییە لە شتەکان - حەقە و، زانایە و، خۆشەویستە و، خاوەن ویستە و، پاکژە لە ئارەزووەکان و، بناغەی هەموو چاکەکانە. ئەم سیفاتانەش بە تەواوی وەك ئەو سیفەتانەن کە لە ئینجیلدا هاتوون بە تایبەتی لە (العهد الحدیث)دا. بەڵام زۆربەی سیفاتی خوا کە لە ئینجیلدا هاتوون حاشا هەڵناگرن و، لەسەر بنەمایەکی لۆژیکی پێشکەش نەکراون). بەم پێیە زانست و لۆژیکیش پاڵپشتی لە خوداناسی و سیفاتەکانی دەکەن.

وە هەموو نامە ئاسمانییەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە خوا تەنیایە و، ئەزەلی و ئەبەدییە و، زانیار و، بە توانایە و، هەموو شتێ دروستکراوی ئەوە.

هەرچی مەسەلەی سێ خواییە وەك ڕابردوو باسمان بە شاهیدی زۆر لە زانایانی خۆرئاوا (پۆلس) هێناویەتە ناو مەسیحییەتەوە، بۆ نموونە (ویلز) لە (موجز تاریخ العلم/ترجمة/عبدالعزیز توفیق جاوید) دا دەڵێ: (مەسیح مژدەی بە مەسیحییەتی ئیمڕۆ نەداوە، بەڵکو پۆڵس قوتابی ئەسکەندرونە هێنای و، لە ڕێ زانیاری بت پەرستی وەرگرت و خوا کۆنەکانی میسری (ئیزس) و، (هورس) و (سیزایس)ی گۆڕی بە باوك و کوڕ و گیانی پیرۆز). بۆ نموونە لە (انجیل مرقص/١٢)دا هاتووە: (الرب الهنا رب واحد). وە لە (یوحنا) دا هاتووە: (انت الاله الحقیقی وحدك). ئەم دەقانەش پێچەوانەی سێ خواییە. (وەرگێڕ)

خوا بەزەیی بەردەوامە لەگەڵ ئەوانەدا لە حاڵەتی خەم و پەرێشانی و، کارەسات و بەڵادا هاواری بۆ دەکات، جگە لە خواش کەس نییە مرۆڤ لە ئەشکەنجەی ئازارەکان بپارێزێت و، خەمی سەرگەردانەکان هەڵدەماڵێ و، فرمێسکی گریا و دەسڕێتەوە و، بەندە هەرچییەکی بیکات لە ڕەحمەتی خوا ناڕواتە دەر، چونکە بەپێی کردەوەکانی بەندە سەیری ناکات، بەڵکو لە ڕووی لاوازی و کەمی پلان و فێڵییەوە تەماشای دەکات. بۆیە ویستی خوداوەند لە ئاڤێستادا بە (ڕێسای چاکە) وەسف کراوە و، هەرچی لە خواوە دەردەچێ خێر و چاکەیە و خراپە و زیانی تێدا نییە و، چاکەکەشی سەرجەم خوا کرد و، دروستکراوان دەگرێتەوە لە بڕوادار و بێ بڕوا، مرۆڤی چالاك و خراپ و، گیاندار و ڕووەك، ئەو بەزەیی بە هەموو کەس دادێتەوە، کە پەنای بۆ ببات لە خۆشی و ناخۆشیدا[1].

---

[1] مرۆڤی موسڵمان ڕۆژانە پێنج جار وەك فەرز لە نوێژدا پەیوەندی بە خوایەوە دەکات و دەڵێ: (الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ(٣)مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ(٤)إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ (٥) اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ....) لێرەد هەست و نەستی خۆی تەڵقین دەکاتەوە و، هەرچی لە ناخیدایە لە خەم و پێداویستییەکان بۆ خوای خۆی هەڵدەڕێژێت و، ناخی پاکژ و پڕوزە دەکاتەوە و، چالاك و بە توانا دەبێتەوە. وەکو خوا دەفەرمێ: (أَلاَ بِذِكْرِ اللّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ). واتە: بێگومان بە یادی خوا دڵان ئارام دەبن. (ئەلیکس کارل) لە کتێبی (الإنسان ذلك المجهول) دا دەڵێ: (شایەد نوێژ گەورەترین سەرچاوەی گەرمی بۆ مرۆڤ و، وەك کانزای ڕادیۆمە بۆ چاوگی تیشکەکان و، خۆی چالاکی پەیدا دەکات و، خەڵکی بە نوێژ چالاکیان تیژ دەکەنەوە، ئەمەش لە کاتێکدا بە ملکەچییەوە داوا لەو هێزە دەکەن کە یاریدەریان بدات و، هەموو جار داوا خوازی لێ دەکەن. نەم دیو، کەس لە ژیانیدا لە خوا پاڕابێتەوە ئاکامەکی باشی نەبووبێت). ولیەم جێمس دەڵێ: (گەورەی چارەی خەم و دڵە ڕاوکێ بێ گومان بڕوایە). بۆ زانستی پتر بڕوانە (دع القلق و ابدء بالحياة/ دايل كارنيجي) (ل: ١٦٤-١٧٨).

دکتۆر (پول ئەرنست ئەدۆلف) لە کتێبی (الله يتجلى في عصر العلم)دا دەڵێ: (٨٠٪) جۆری نەخۆشیەکان کە شارە گەورەکانی ئەمریکای گرتۆتەوە هۆکانیان تا ڕاددەیەکی گەورە دەروونین).

دەڵێ: (زۆر حاڵەتی دەروونی هەیە ترس و دڵە ڕاوکێ - القلق - ڕۆڵی تێدا دەبینێ، ئەگەر ترس و دڵە ڕاوکێ لەسەر بنەمای بڕوا بوون بە خوا چارە بکرێ چارە و دروستی بە شێوەیێ بۆ مرۆڤ دەگەڕێتەوە لە زۆر دۆخدا وەك کارەکی لە ئاسایی بەرەو سەیر دەکرێت). =

پوختەی ئەوەی لە ئاینی زەردەشتدا بڕیار دراوە لە بارەی خواوە لە سیفەتی پەروەردگاری دروستکەر نەچۆتە دەر، کە سیفەتی ئەرك سپێرە و، سیفەتی بنەڕەتی هەموو سیفەت و ناوەکانی خوایە، زەردەشتیەت لەم پێناسەیەدا لەگەڵ سەرجەم ئاینە ئاسمانیەکان وەکو یەکە، چونکە لە ئاشکرایی ناسینیدا بە سیفەتی ئەرك پێ سپێریە پەیوەندی نێوان خۆی و مرۆڤ وەك ئەرك پێ سپێراو ئاشکرا دەکات و لە بازنەکی خوا پەرستی ڕاستدا دایدەنێت.

بۆ هەموو ئەو شتانە، زەردەشتییەت پێویستی کردووە لە سەر هەر کەسێ بە زمانی ئەرك پێ سپاردن قسەی لەگەڵ کراوە، دان بە سیفەتی ئەرك پێ سپێری بەدیهێنەر دان بە خوادا بنێت، واتە بڕوا بە خوا بێنێ بە سیفەتی ئولوهییەت وەك یەکەم هەنگاو لە بنیاتنانی پەیوەندیدا و، پێش مل کەچ کردن و خۆسپاردن بە داخوازییەکانی ئەرکبارییەکانی خوایی، وە دوای بڕوا هێنان بانگێشەی کردووە بۆ (پەرستنی خوای تاك و تەنها کە ئەڵلایە).لە هەمان کاتدا هانی داوە بۆ (واز هێنان لە بڕوا بت پەرستی یەکان)، کە خۆی لە پەرستنی بت پەرستی و هێزی سروشتیدا دەنوێنێ[1].

---

= (لەشی مرۆڤ لە چاکترین دۆخدا دەبێ ئەگەر لەگەڵ بەدیهێنەریدا ڕێك بێ بە بێ ئەوە تووشی تێك چوونی نەخۆشی دەبین).

بێگومان قورئان دەفەرمێ: (وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا) واتە: کێ پشت لە یاد و پەیامی من بکات ئەوە ژیانەکی پڕ ئازار و ئەشکەنجەی هەیە. بەم پێیە چارەی نەخۆشی و تاوانە دەرونیەکان و، چارەی نەخۆشیە دەرونی - جەستەییەکان و، چارەی کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان و، ئابوریەکان و، جیهانیەکان هەمووی لە دیندایە لەوانەش قورئان وەك پەیام بۆ جیهان.

[1] هەتا ئیمڕۆش مەسیحیەکان وەکو لە (قاموس كتاب المقدس/ل/١٠٧) دا هاتووە دەڵێن: (خوا باوکە، خوا کوڕە و، خوا گیانی پیرۆزە و، خوا بە هۆی کوڕ جیهانەکانی دروست کرد). وەکو (محمد طاهر) لە کتێبی (العقائد الوثنية في الديانة النصرانية) دا باسی کردووە و، (ول ديوارانت / قصة الحضارة كتاب ٥/المجلد ٣/ ل: ٢٧٥) دا باسی کردووە ئەم فکرانە لە یۆنانی و میسری و هیندی و ئاشوریەکانەوە=

ئاکامی سروشتی ئەوەی کە بە دڵسۆزی بڕوامان بە تاکە خوا هەیە و، تەنیا بۆ پەرستن ڕوو لەو دەکەین ئەوەیە کە ئاین هەمووی لەسەر یەکتاپەرستی پاك دادەمەزرێ و، لە پاکژترین و سادەترین دیمەندا. وەك ڕابردوو دیتمان لێرەدا هیچ گەواهی دانێ نییە بە خوای تاك و تەنیا نەبێ، کە بێ هاوبەش و بێ هاوتاو وێنە، نە لە زاتدا و، نە لە هیچ کام لە سیفەتەکانیدا و، ئەو دروستکەری هەموو شتێکە و، هەر جاڕ دان و بانگێشە کردنێ بۆ هەر هێزەکی تر کە بەشداری بکات لە دروست کردن و کارتێکردندا بە تاڵە و، بەڵگە نەویستەکانی عەقڵ و خاڵە نەگۆڕەکانی عەقیدە و بڕوای ڕاستەقینە پوچەڵ دەکاتەوە.

لەبەرئەوە زەردەشتییەکان بە ئاینەکەیان ووتووە (ئاینی مزدیسنا mazdayasna). واتە: ئەو ئاینەی خودا بە تاك و تەنیا دەزانێ. دوای ئەوان ئیسلامیەکان بە (دین مارسیان) ناویان بردووە، یان بانگێشەی ئاینی مارسیان) واتە ئەو ئاینەی بانگ بۆ بە خوا زانینی خوای حەق دەکات. بۆیە کاتێ بە ئاشکرایی بیری یەکتاپەرستی لە ئاینیاندا تێبینی کراوە سەیر نییە کە خەڵکی کۆن و تازە بە مزدەییەکان یان مزدایسنین ناویان ببات، واتە: ئەو کەسانەی خوا بە تاك دەپەرستن و هاوبەشی بۆ بڕیار نادەن.

---

=هاتووە تێکەڵ بە مەسیحییەت بووە. یان کاتێ مرۆڤ خۆر و مانگ و بتی پەرستووە بە خواو پەروەردگاریان زانیون و، وەك خوا پەرستونیان و سەیریان کردون و بە هاوبەشی خوایان داناون و، وەکو خوا لێیان پاڕاونەوە و، پەرستونیان و، داوای شەفاعەت و شیفا و، باران و، بەزەیی و. . . هتد لەوان کردووە کەچی خوا تەنیایە و بێ هاوبەشە و لەم پاڕانانەوەشدا قەت هیچیان دەست نەکەوتووە: (فَمَا أَغْنَتْ عَنْهُمْ آلِهَتُهُمُ الَّتِي يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ). هود/١٠١. (وەرگێڕ)

## دوانەیی لە بیروبڕوای زەردەشتی دا:

یەکتاپەرستی (التوحيد) لە چەمکی سادە و پاکی خۆیدا بریتییە لە بە تاك دانانی خودا لە خوایەتیدا. ئەم یەکتاپەرستییەش سادەیی و پاکی خۆی لە دەست نادات، مەگەر خوا پەرست بڕوای خۆی لە بارەی خواوە دانەمەزرێنێ، ئەمەش لە کاتێکدا یەکتاپەرستی ڕاستەقینە و پوخت و پاك تێکەڵ بە چەند چەمکی نامۆ کرا کە خاوەن بڕوا دروستی کردووە و، پاکی و سادەیی بیرەکەی شێواندووە، چونکە ئەو بیروبڕوایەی کە لە یەکتاپەرستی هەڵدەقوڵێ مانای خۆسپاردنە بە یەکتاپەرستی بۆ خوای گەورە، واتە بەو شێوزەی کە خوا هەیەتی کە تاکە و تەنیایە. ئەو یەکتاپەرستییەی پێشوو کە باسمان کرد زەردەشتییەت لەسەر ئەوە دامەزرا بوو. بەڵام زۆر لە نووسەران و لێکۆڵەران و مێژوونووسان لە بنەماکانی ئاین بە هەڵە حاڵی بوون کە بڕوایەکەی لەسەر دامەزراوە. خراپ حاڵی بونیان لەو تێ ڕوانینەوە پەیدا بووە کە لەمەڕ کێشە و ئەو جەنگە سامناکە هەمیشەییەوە هەیانە کە لە نێوان دوو هێزدایە و، هەریەکە لەو هێزەیە دەیەوێ بە تەنیا تاسەر دەسەڵات بەسەر ئەوی دیکەدا بگرێ، ئەو دوو هێزەیەش هێزی ڕووناکی و تاریکییە، هێزی چاکە و خراپەیە، وە حەق و بەتاڵە و، پاکی و پیسییە، لەمەوە بۆ ئەوە چوون کە بناغەی ئاینی زەردەشتی لەسەر دوانەیی دامەزراوە نەك تاك خودایی[1].

---

[1] بێگومان لەسەرجەم ئاینە ئاسمانیەکاندا باس لە روناکی و تاریکی و، ڕێنوما و گومڕایی و حەق و ناحەق و کێشە و مل ملانەیان کراوە بەڵام نەك لەسەر بنەمای فرە خوایی و، دوو دەسەڵاتی جیا و سەربەخۆ لە یەکتر لە بوونەوەردا. بەڵکو لە سەر بنەمای پێ شێل کردنی فەرمانەکانی خوایە کە هێزی چاکە و روناکی لێوە دەردەچێ لە کاتێکدا خوا تەکلیفی سەر پشکی دا بە جنۆکە و مرۆڤ و، ئەوە بوو شەیتان (ئەهریمەن) کە یەکێ بوو لە جنۆکەکانی پەسەندی نەکرد. وەکو قورئان دەفەرموێ: (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ). واتە: مرۆڤ و جنۆکەم تەنیا بۆ پەرستن دروستکردووە. (اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِن الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُم الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُمْ مِن النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ). البقرە/ واتە: خوا دۆستی بڕوادارانە لە تاریکییەوە دەریان دێنێ بۆ ڕووناکی، ئەوانەی بێ بڕوان دۆستی ئەوان تاغوتەکانە لە ڕووناکیەوە بۆ تاریکاییەکان دەریان دێنێ، ئەوانە دۆزەخین و بۆ هەتا هەتایی دەمێننەوە. ( وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُوا لآدَمَ فَسَجَدُوا إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنْ الْكَافِرِينَ) البقرە/٣٤. واتە: کاتێ وتمان بە فریشتەکان کوڕنوش بۆ ئادەم ببەن، هەموو کوڕنوشیان برد تەنیا شەیتان نەبێ ، یاخی بوو و خۆی بە زل زانی و بوو بە یەکێ لە بێ بڕوایان. =

= ئەنجا شەیتان ووتی دوای وەرگرتنی مۆڵەتی تەمەن درێژی: (فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ(٨٢)إِلاَّ عِبَادَكَ مِنْهُم الْمُخْلَصِينَ(٨٣)قَالَ فَالْحَقُّ وَالْحَقَّ أَقُولُ(٨٤)لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنْكَ وَمِمَّنْ تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ) ص/٨٢-٨٥. بە عیززەتی تۆ هەموویان فریو دەدەم تەنها بەندەکانی تۆ نەبێ لەوانەی کە دڵسۆزن. فەرمووی: سوێند بە حەق حەق دەڵێم دۆزەخ لە تۆ و هەموو شوێن کەوتوانت پڕ دەکەم.

جان ناسی لە کتێبی (تاریخ ادیان/ترجمه علی اصغر حکمت)دا هاتووە: (لە دێرینـدا زەردەشـتی یـەکان لـە پاڕانەوەکانیان دا دەیان ووت من دوژمنایەتی شەیتان (دیو) دەکەم مزدا دەپەرستم و، شوێن زەردەشت دەکەوم کە ڕەسولی خوایە. . . . ).

(دومزیل) لە (تاریخ تمدن ایرانی/بقلم جمع من المستشرقین) دا دەڵێ: (بیر و زانیارییەکانی زەردەشت پەرسەند و ئازایـا نەبوو، بەڵام ئایینی ئەویش چارەنووسی بە چارەنووسی ئاین و مەزهەبەکانی تـر گەیـشت). وە دەڵـێ: (یـەکتا پەرسـتی تێکەڵی جۆری لە شیرك و دوانەیی بوو، ناوی فریشتە نزیکەکان نزیك خرایەوە لە خوای گەورە...).

وە لە هەمان کتێبدا (خۆرهەڵاتناس پ. ژ. دومنانە) دەڵێ: (ئایینی خوڕامی و بەسـەرهاتی ئەفسانەیی کـۆن جارەکی تر گەڕایەوە، سەرباری چاکسازییە بنەڕەتـیەکانی زەردەشت، بـەڵکو کاتـێ دەرکـەوت ڕایگەیانـد کـە زەردەشت لە ئەوەو پەیڕەوی ئەوە!

ئەوەی ڕاستی بێ گاتها (سرودی دینی زەردەشتی) بەستراوەتە بە ئەریتی (هنومە) هەر چەند زۆر لـە یـەکتر جیان و دورن، بەم چەشنە ئەهورا مزدا (خوای گەورە) خرایە ڕیزی خوا ئەمرەکانی تر کە دینی مزدا لـە ڕیـزی یەك خوایی فڕێی دابوون).

بەو پێیە ئاریەکان بەر لە ئیبراهیم و زەردەشت، بڕوایان بە هێزی خێر و شەڕ بووە و پاشـان گـۆڕاوە بـە دوو هێـزی لەیـەك ئاسـتدا و وەك دوو خـوا سـەیر کـراون. دکتـۆر (محمـد معـین) لـە کتـێبی (فردیـسنا و ادب فارسی/ط٢/ل٣٤) دا دەڵێ: (ئێرانیەکان هەر لە کۆندا بڕوایـان بـە بـڕوای خێـر و خراپـە بـووە و، بـە خـوا و شەیتانیان ووتووە خوا و، کارە چاکەکانیان وەکو روناکی و بـاران داوەتـە پـاڵ خـودا و، کـاری خراپـەش وەك تاریکی و بێ بارانی داوەتە پاڵ ئەهەریمەن).

وە دەڵێ: (زۆر لە بڕوایەکانی هیندی و بوزی هاتە ناو ئایینی زەردەشتەوە). وە جان ناس لە کتێبی (تـاریخ جـامع ادیان/ل: ٣٠٦) زۆر خاڵ لە بانگەوازی زەردەشت باس دەکات وەکو: (بانگـەوازی کـردن بـۆ پێغەمبەرایـەتی و، دان هێنان بە تەنها و خوای سوود بەخش ئەهورا مزدا. وە بە سیفەتەکانی وەکو ویست و بێ هاوەڵی و شەریك).

بەو پێیە دوو خوایی و فرە خوایی لە بۆچوونەکانی مرۆڤەوە سەری هەڵداوە و پەیدا بووە، بەڵام بـیری یـەکتا پەرستی بیرەکی ڕاستەقینەیە و، نامەی ئاسمانی و پێغەمبەران لەسەر ئەم پـڕە نـسیپە دامـەزراون، هـەر لـەم فکرەیەش لە دەستی مرۆڤەوە گوازراوەتەوە ناو پەیامی پێغەمەمبەران و گۆڕانی تێـدا کـراوە. (جـان ناسـی) دەڵێ: (بڕوا بوون بە پڕە نسیپی شەڕ و خراپەکار بە درێژایی ڕۆژگار گەشـەی کـرد، تـا ئـایینی زەردەشـتی لـە ڕەوشت و خواناسیدا گۆڕی بە دوانە خوایی (ئەنگرامنیو) بە درێژایی ڕۆژگـار بـووە ئیبلیـسەکی بـەهێز کـە بەرهەڵستی ئەهورامزدا بکات، تا لە شەڕدا یەکسان کران. لە ئاڤێستای سەدەکانی دوایـی دا وا دادەنـێ کـە ئەنگرامنیو و ئەهورا مزدا لە خوایەتی و شکۆدا وەکو یەکن). بەم پێیە بیری هاوبەشـی پەیـدا کـردن و فـرە خوایی هزری مرۆڤ دایهێناوە و وەسوەسەی شـەیتان پلانی بۆ کێشاوە و، هەر بە دەستی مرۆڤ خزاوەتە ناو نامە ئاسمانیەکانەوە جگە لە قورئان. (وەرگێڕ)

ئەگەر ئەم زەردەشتییەی ئیمڕۆ تێکەڵی حەق و ناحەق نەبوایـە ئـەم کەسـانەش ئاوا بەم شێوە دوورە لە ڕاستی ئەمەیان پێشنیار نەدەکرد. کە هەڵـساوە خوایـەتی خوای گەورە و هێزی ڕووناکی و چاکەی ئاوێتە بە یەکتر کردووە کردویەتی بە یـەك هێز لە کار تێ کردن و کاریگەریدا و، وە هەرچی لەم جیهانەدایە لەکاری چـاکە و پاکی و ڕاستی لەو هێزەوە دەردەچێ، لـە بەرامبـەر ئەوەشـدا بیرۆکـەی شـەیتانی (ئەنگرا مئنیو - ئەهریمەن)ی لەگەڵ هێزی تاریکی و زیانبەخش و خراپـە تێکـەڵ بەیەکتر کرد وەك هێزی دژ و نەیار بە هێزی یەکەم و، هەرچـی لـە جیهاندایـە لـە شەڕ و تاوان و، خراپە لەوەوە دەردەچێ.

بە ناچاریشەوە ئەم یەکتاپەرستییە کە دوو هێز کاری تێ کردووە دەبێ بە هۆی بیرکردنەوە لە بوونی دوو هێزی هاوتەریب لـە دەسـەڵاتدا لـە بوونـەوەردا کـە لـە دروستکردن و بەدیهێنان و لە ناو بردندا وەك یـەکتر بـن. کەواتـە ئاسـاییە ئـەم بڕیارە باوە لەسەر فکرەی یەکتاپەرسـتی زەردەشـتی بـدرێ، کـە لەسـەر دوو دوو بیروبڕوا دامەزراوە، ڕووناکی و تاریکی، خێر و شەڕ، ئەنجا هەموو بڕواکـان و ئـەو لقانەی لێیان دەبنەوە بڕوا و بە ڕاست زانینەکە کـە لەسـەر دوانـەیی دامـەزراوە. لێرەدا دوو ڕاستی هەیـە کـە لـە زۆربـەی مێـژوونووس و لێکۆڵـەران شـاراوەیە و هەریەکەش لەو دووانە پشتگیری لە تاك و تەنیایی خوا دەکات و، لە هەمان کاتدا هـەردوو لا بیرۆکـەی دوو خـوایی ڕەتدەکەنـەوە کـە وەکـو بناغەیـەك بـۆ بـڕوا گوماناویەکان دانراوە. ئەمەش هەردوو ڕاستییەکانن:

- ئەم دوو هێزەی کار لە بوونەوەر دەکەن، بە هۆی ململانێ و جەنگی نێوانیان هەردووکیان لە ژێر دەسەڵاتی خوادان و لە ژێر گوێڕایەڵی ئەو دان و، هێزی چـاکە کە بەسوودە و، هێزی شەڕ و خراپە کـە زیانبەخـشە هـەردووکیان فـەرمانی خـوا ئەنجام دەدەن و، لە هێز و دەسەڵاتی ئەو ناچنە دەر و، هەمووش یەك مانای هەیـە

کە ئەهورا مزدا بە تەنیا کار لە هەردوو هێز دەکات، بێ ئەوەی کەس هاوبەشی لە گەڵیدا بکات لە کارتێکردندا[1].

- بێگومان ململانێی بەردەوام لە نێوان ئەو هێزە بەگژ یەکدا چووانەدا هەیە لە کۆتایی دا زاڵ بوون و سەرکەوتن بە قازانجی هێزی چاکە و ڕووناکی تەواو دەبێت و، هێزی شەڕ و تاریکی دەکەوێتە ناو چاڵەکی بێ ئارامەوە و لە ناو دەچێت و، ماوەی کێشەکە لای زەردەشتییەکان بە (١٢) هەزار ساڵ خەملێنراوە، کە ئەمە کاتێکە بۆ جیهان دانراوە، دوای ئەوە چاکە کاران دەچنە بەهەشتەوە و، خراپە کاران دەچنە دۆزەخەوە و، مانەوە تەنیا بۆ خوا دەبێت.

کەواتە بیری یەکتا پەرستی، بیرەکی بەهێزە لە ئایندا و لە کەس شاراوە نیە، دوانەیی خوایی کە زۆر کەس فریویان پێ خواردووە لە بنەڕەتدا لە یەکتاپەرستییەوە سەری هەڵنەداوە، بەڵکو لە بیرۆکەی کێشە و پێشبرکێی نێوان ئەو هێزانەیە کە خەیاڵیان بۆ کراوە، شایەد بۆیە وای لە هەندێ لە لێکۆڵەران کردووە کە جارێ خۆپارێزن و جارێك ڕاست کردنەوە بکەن لە بناغەی بڕوای زەردەشتی دا و، هەیە لەوانە وتوویەتی دوانەیی (خوا) لە ئاینەکەدا تیۆری و بیردۆزەیە و، هەیانە بۆ ئەوە چوون کە دوانەیی تەنیا لە ڕواڵەتدایە.

---

[1] لێرەدا مانای ئەوە نییە کە خوا فەرمان بە خراپە و زیان گەیاندن دەکات بەڵکو مانای ئەوەیە خوا مۆڵەتی هێزی شەڕی داوە و، خوا ئیرادەی سەرپشکی پێ داون لە مرۆڤ و لە ئەجننە وەکو قورئان دەفەرمێ: (إِنَّ اللَّهَ لاَ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ) الاعراف/٢٨ واتە: خوا فەرمان بە خراپە کردن ناکات. لێرەدا موعتەزیلەکان دەڵێن: خوا شەڕی دروست نەکردووە کەچی زانای تر هەیە دەڵێن: لێرەدا جیاوازی هەیە لە نێوان دروست کردن و کردندا، خوا دروستکەری هەموو شتێکە بەڵام مرۆڤ و ئەجننە بکەری کارەنن لە خراپە و لە چاکە بۆیە بەرپرسیارن. (وەرگێڕ)

بەهەر حاڵ بیروبڕوای زەردەشتی - وەك زەردەشت بۆ گەلەکەی ڕوونی کردۆتەوە - باسی دوو خوای هاو هێزی نەکردووە کە لە بوونەوەردا کێبەرکێ بکەن، بەڵکو بە ڕوونی تەنیا باسی لە بوونی یەك خوا کردووە کە لە دروستکردن و کارتێکردندا تاك بێ و، کەس لە مۆڵکی دا کێشەی لە گەڵدا نەکات و، هاوبەشی نییە لە خوایەتی دا، بەڵام بوونی هێزی وەکو ڕووناکی و تاریکی و، چاکە و خراپە و، حەق و بەتاڵ لە بناغەی دروستکردنیاندا دژ بە یەکترن و، لە جووڵەیاندا کێشەیان پێکەوە هەیە و، لە بووندا ئاوێتە بوون، ئەمە وەکو زەردەشت دەڵێ پڕە نسیپی بوونەوەرەکانی جیهانە و لەم ئاوێتە بوون و کێشەیە جیهان دروست بووە وەك ئێستا لە سەریەتی و، ئەگەر ئەم کێشە و ملبەملانە و ئاوێتەییە نەبوایە جیهان نەدەبوو دروستکراوان بوونیان بێ مانا دەبوو. خودا خۆی چەند هێزەکی سەربەخۆی لە کردار و جووڵەدا هێناوەتە بوون بۆ کار بەجێیەك و مەبەستێك کە لە تێکەڵاوی و پێك هێنانی و ململانەیاندا بەباشی زانیوە.

سەرباری ئەوەش زەردەشت لەوە بێ ئاگا نەبووە کە بوونی ڕاستەقینە بۆ هێزی چاکە و ڕووناکی و ڕاستییە و، شوێن کەوتنی تاریکی و خراپەی بۆ ڕووناکی و چاکە بە سێبەری چواندووە بۆ مرۆڤ، وەکو دەبینی مرۆڤ کە دەیبینێ وا دەزانێ لە ئارادایە و کەچی بوونی نییە و، لە ئارادا نییە، وە خوا ڕووناکی و چاکەی دروست کردووە و، تاریکی و شەڕ و خراپەی وەکو سێبەرێ بۆ ئەوان بنیات ناوە، لە کاتێکدا بینی بە بێ ناکۆکی و دژایەتی بوونەوەر ڕاناوەستێ و، بە دژایەتی جووڵە لە بوونەوەردا و گونجاو دەبێ و دەسازێ وە تۆخمەکانی ژیان تەواو دەبن.

ئەگەر پێویستی ژیان و بونگەری (الوجودی) داوای دژایەتی کردبێ دووبارە پێویستی تەکلیفی داخوازی بوونی خۆی بە خود کردووە نەك بە شوێن کەوتن تا

هێزەکی بێ شوماری لە بەرامبەردا بوەستێ کە خوا لە مرۆڤدا دروستی کردووە کە زەردەشت ناوی ناوە هێزی ویستی ئازاد، کە خوا هەموو ئەو واتایانەی تێدا کۆکردۆتەوە کە مرۆڤ بەپێی ئەوانە بووە بە مرۆڤ وەك هزر و زانیاری و هۆش و ئارەزوو ڕامان و جیاکردنەوە و بڕیار و پێویستی و هیوا و شتی تر تا مرۆڤ ئازادی تەواو وەربگرێ لەسەر پشکی و جوڵەدا، تا هەر جوولەیەکی دەیکات دەربڕینەکی ڕاستەقینەی تێدا بێ لە خوودی خۆیەوە، بە تەواوی حەواڵەی ئەو پاڵ بدرێتە لای ئەو و هیچی لێ کەم نەکرێتەوە.

تەنیا بە ویست مرۆڤی ئەرك پێ سپێراو کامڵ دەبێ و، وە بە ئازادی ویست لە سەرپشکیدا زاتییەکی تایبەتی لە مرۆڤدا دەردەکەوێ کە سەروەری پێ بەدەست هێناوە لە بوونەوەردا و، ئەو واتایانە پێکەوە بۆ سەروی دژایەتی و ناکۆکی و کێشەیان بەرز کردوەوە و هەڵچواند، ئەو مەبەستەی مرۆڤ لە پێناویدا دروستکراوە و ئەرکی پێ سپێراوە زۆر لەو بەستنەوە و کورت کردنەوەیە بەرزتر و گەورەترە - کە زەردەشتییەت لە قۆناغەکانی هەرەس هێنان و لادانی دا بۆی چووە - کە مرۆڤ لە بەرامبەر یەك هێزی ناکۆکدا دەوەستێنێ و، لەمەوە لە ئاستی ئەرك پێ سپێراوی بەرز بۆ ئاستی نزم تر دایدەبەزێنێ و، لە توانا و گرنگی دا لە گەڵ ئەو هێزەی یەکسان دەکات کە ڕام بووە بۆ خوا و کەوتۆتە ژێر رکێفی ئەوەوە و، بێ ویست و جیاکردنەوە بۆی دەستەمۆ بووە.

## (فریشتەکان)[1]

فریشتەکان لە زەردەشتیدا وەکو لە ئیسلامدا هاتووە چەند جەستەیەکی ڕووناکین . ئەوان لە سەر شێوازەکی باو و ئاسایی نەبێ نابینرێن.[2]

ئەوان چاکە کار و خاوەن ژیان و هزر و هۆش و کارزانین و، نەمرن و، لەناو ناچن و، گۆڕانیان بەسەردا نایەت و، ناخۆن و ناخۆنەوە و، کرداری زۆربوون و، نیشتمانیان ئاسمانە و لەژێر چاودێری خودان.

---

[1] ئاماژە بۆ ئەم فەرموودەیە دەکات: (خلقت الملائكة من نور، وخلق الجان من مارج من النار، وخلق آدم مما وصف لكم) رواه الحاكم و مسلم و حسن في الجامع الصغير للسيوطي. واتە: فریشتەکان لە ڕووناکی دروست کراون و، جنۆکە لە بڵێسەی ئاگر دروست کراون و، ئادەم لەوە دروست کراوە کە بۆتان وەسف کراوە (کە قوڕە).

بەڵام ئەم جۆرە ڕووناکیان کە جنۆکە و فریشتەی لێوە دروست کراوە هەستیارە ماددییەکانی مرۆڤ ناتوانێ پەیان پێ ببات و بیانبینێت.

بە پێی زانستی فیزیایی نوێ لە سەرووی ڕووناکی بینراودا تیشکە کەهرو موگناتیسییەکانیش هەن وەك سەربنەوشەیی و ژێر سورو، ئێکس و هی تریش کە چاوی مرۆڤ پەیان پێ نابات، ئەمەش لەبەر خێرایی لەرەلەرەکانیان.

وە تەنیا ئەو دەنگانە نەدەبیستێ کە لەرەکانیان لە نێوان (١٩-٢٠٠٠٠) لەرە دایە لە چرکەیەکدا، لە ملیار پلەی گەرمی بوونەوەر هەستی بەرکەوتنی مرۆڤ هەست بە (١٥-٢٠م) دەکات. وە مرۆڤ ئیمڕۆ باس لە ئەتیر دەکات کە شەپۆڵ و لەرەلەرەکانیان لە سەروی شەپۆڵی موگناتیسییەوەو، تەواوی ئەم بوونەوەرەیان پڕ کردووە. وە ئیمڕۆ زۆر دیاردەی نائاسایی هەیە لە مرۆڤدا وەکو خەون و تلباتی و سایکۆکینیزیا و هی تریش کە زانستی ماددی ناتوانێ پێناسەیان بۆ بکات. تا ئیمڕۆ فیزیا نازانێ گەردیلە و پێکهاتەکانی چییە؟ هێزی کێشکردن چییە و،. . . هتد!! بۆیە دەتوانین بڵێین هێشتا زانستی مرۆڤ لە قۆناغی ساوایی دایە هەر چەندە مرۆڤی نەزان وەك منداڵی نەزان لاسارە و گوێ ناگرێ و، وا دەزانێ پەی بە هەموو شتێ بردووە! (وەرگێڕ)

[2] قورئانی مەزن دەفەرمێ: (فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا). واتە جبریلمان (گیانمان) ناردە لای مەریەم خۆی لە شێوەی پیاوەکی تەواودا بۆ بەرجەستە کرد.

بەو پێیە ئەم دۆخە روناکییانە بۆ پەیوەندی کردن بە جیهانی ماددیەوە دەبێ لەرەلەرزیان هێواش بکەنەوە تا لەگەڵ ئاستی لەرەلەرەکانی دنیای زەمینیدا خۆیان بسازێنن و، لە لایەن کەسانی شایستەوە ببینرێن کە چاوی دڵیان کراوەیە. (وەرگێڕ)

**وە لە ڕووی ئەرك و بەرپرسیاری خوایی یەوە کارە بەرپرسیارییەکانیان جۆراوجۆرە:**

- هەیانە ناوەندێکن لە نێوان خوا و مرۆڤدا و، ئەوانەش ڕەوانە کراوی خواین (سروش)ی خوا هەڵدەگرن بۆ هەڵبژاردە و پاڵاوتەکان لە ڕەوانە کراوانی خۆی و لەوانەش کە ناودارن و، زەردەشت بینیونی و سروشی خوا و زانیاری ئاینی لێ وەرگرتوون ئەوانەن: (بەهمەن و، ئۆردی بەهەشت و، ئیسفندار مرز و، خوردارد و، مورداد و، شەهر پور)[1].
- هەیانە چاودێرە بەسەر بڕوادارە و، ئەگەر بینیان ڕووە و گوێڕایەڵییە زۆرتریان خۆش دەوێ و وشیاری دەدەنێ کە نەکەوێتە گوناهەوە و ئەگەر بینیان لە فەرمانی خوا لادەدات و، کردارە یاساغەکانی ئەو ئەنجام دەدات سەر زنشتەی دەکەن و هانی دەدەن بۆ گەڕانەوە بۆ گوێڕایەڵی خوای گەورەیە.
- هەیانە پاراستن و پاسەوانی و چاودێری دروستکراوەکانی ڕو لێ نەنراویان خراوەتە سەر شان وەکو: گیانداران و ڕووەکەکان و تەنە بێ گیانەکان و، کانزاکان و خۆر و مانگ و ئەستێرەکان و باو و هەور و شتی تر.
- هەیانە لەو فریشتانە (مرۆڤیان خۆش دەوێ) و کاری ئەوانە داواکردنی لێ خۆش بوون و لێ بووردنە بۆ تاوانبارانی بڕوادار لە خودا.

---

[1] ئەو فریشتانەی ناویان لە قورئاندا هاتووەو، بەرپرسیاری سروش بوون بە (جبریل) و (روح القدس) و ((الروح) ناویان هاتووە. هەیانە لە زانایان (الروح) و (روح القدس) بە جبریلی دەزانن. هەروەها لە قورئاندا ناوی (میکیال) هاتووە. لە قورئانی مەزندا هاتووە" (مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ).
واتە: کێ دوژمنی جبریل بێ ئەوە خوا دایبەزاندۆتە سەر دڵی تۆ. (تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ). القدر/ ١
واتە: فریشتەکان و گیان دادەبەزن.
(فَالْمُلْقِيَاتِ ذِكْرًا). المرسلات/ ٥
واتە: سوێند بەو فریشتانەی سروش ئیلهام دەکەن.
(مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِلَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِلْكَافِرِينَ) البقرە/٩٨. واتە: کێ دوژمنی خوا و فریشتەکان و ڕەوانە کراوانی و جبریل و میکائیل بێ ئەوە خوا دوژمنی بێ بڕوایانە. (وەرگێڕ)

- هەیانە چاودێری ئەو بڕوادارانە دەکەن کە بەسەر پەرستگاکاندا دەگەڕێن و، هەیانە لە نوێژدا و لە یاد و نزادا بەشداریان لەگەڵدا دەکەن، دیسان لە بۆنەی جەژنەکان و، حاڵەتەکانی زەکات و خێر کردن دا بەشداریان دەکات. فریشتەکان ژمارەیان دیاری کراو نییە و، بەسەدان و هەزاران دەژمێردرێن[1]، بەڵام ئەوانەی ناویان لە ئاڤێستادا هاتووە و، ڕۆڵی گرنگیان پێ سپێراوە کە بە ئەوانی تر نەسپێراوە و، ژمارەی ئەوانە شەشە: (ڤاهومانو، ئیستا و هستیا(ئیسفا هیشتا) و، هوخشترا(کشترا نایریا)، سبیتا ئوهیتی(ئارمایتی)، هورتان(ئەهوراناتان)، ئەمیرتات(ئەمیرتیات).

لە قۆناغەکانی تێك چوونی ئاین و تێکەڵ بوونی بە بت پەرستی و ئاگر پەرستی کۆندا، ئەرکی فریشتەکان وەك ڕابردوو لایەنەکمان لێ باسکرد بە چەند ڕواڵەت و دیاردە و جیاکارییەکی خوای گەورە دانران. کە بە هۆی ئەوەوە بۆ خەڵکی دەردەکەوێ ەك بیناسن، چونکە ئەوانە لە بوونەوەردا لەو جیاوازن و ناوی زاتی جیاجیای پێ دان بە کردار و بە جووڵە، بەڵام لە هەموو دۆخەکاندا کەسایەتییەکی ڕاستەقینە نین کە لە دروستکردن و کارتێکردن هاوبەشی خوا بکەن، پاشان ئەوانە لە بوونەوەردا بە تەواوی وەکو سیفەتەکانی خوایی بەپێی داخوازیەکانیان نەبێ دەرناکەون.

بەو پایە خوای شکۆدار زاتی بەرزی لە شەش سیفەتی بەرزی خواییدا خۆی دەنوێنێ و، ناوو داخوازیەکانی لەو بۆچوونە لادەرو چەوتەوە هاتووە کە دەربارەی فریشتەکانەوە هاتووە، بەم شێوەی خوارەوە:

- **ڤاهومانو:** ئولوهییەتی خوایی بە تەواوی تێدا دەردەکەوێ، وە هورامزدای خوداش بە زاتی خۆی لەودا دەردەکەوێ و، بۆیە ئەو نوێنەرایەتی خوا دەکات بە تەواوی و، ئەو فکرەی پاکژ و باشە لە قسە و کردەوەدا.

---

[1] قورئانی پیرۆز دەفەرمێ: (وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلاَّ هُوَ). /واتە: تەنیا پەروەردگارت ژمارەی سەربازانی دەزانێت.

- **ئیستاوەستیا:** ئەو خوایەتیەی تێدا دەردەکەوێ کە دەستوور و یاسا (باشترین ڕاستیەکان) دەدات بە خەڵك، کە کارزانی و، ڕاستگۆیی و، سەقامگیری (الاستقامه) و چاکی و ساغی و تەقوا لە ناسینی ئەو دایە.
- **هوخشترا:** موڵکی خوای تێدا دەردەکەوێ، هەروەها دەسەڵات و سەربڵندی و زەبر و توانا و دەوڵەمەندی و بێنیازی ئەوی بە تەواوی تێدا ئاشکرا دەبێت.
- **سبیتا ئەرمینی:** خۆشەویستی و گوێڕایەڵی و ملکەچی و خۆبەکەم زانین و خودا پەرستی تێدا دەردەکەوێت.
- **هورتان:** کەماڵی خوایی کە گۆڕانی بەسەردا نایەت لەودا دەردەکەوێ و، دیسان کەماڵی لە جووڵە ڕژێی گەردونی و دروستکراواندا لەودا دەردەکەوێت.
- **ئەمیرتان:** نەمری خوایی و ئەزەلییەت و ئەبەدی خوایی لەودا دەردەکەوێت.

ئەوەی ڕاستی بێ ئەو لێ تێکەڵ بوونە ناشیرینە لە نێوان داخوازییە خواییەکان و کاری فریشتەکان دەقەکانی ئاڤێستا بە درۆی دەخاتەوە کە دەقی داوە لە سەر فریشتەکان بە ناو و سیفەتەوە، بەڵکو دەست نیشان کردنەکەی لە ناو ئەواندا کردووە بە دوو بەشەوە:

- پۆلێ لەوانە فریشتە نزیکەکانن لە خوا و بە یارمەتی دەری ئاسمانی و، موقەدەسە نەمرەکان و، هێزە نەمرەکان ناوبردووە و، ئەوانە ناوناوێن بە (ئەمش سنبد)[1] واتە: فریشتە سەرکردە و نزیکەکان.
- **پۆلی دووەم:** لە پلەی دووەمدان و، وە لە پیشەی تەکیلیفی دا لە خوار ئەوانەن، ئەوانە ناوبراون بە (یەزاتا yazata) و لە سەرچاوەی ئیسلامیدا بە (یەزتا) هاتووە، واتە: فریشتەکانی خوا ئەرکی پێ سپاردن جگە لەوەی بە فریشتە نزیکەکان (المقربون) سپێراوە.

[1] ئەمشە: لە فەرهەنگی نیریەن ڤەج (محمد امین هەورامی)دا بە (ئەمسە amsa) هاتووە واتە: نزیك، دراوسێ، هاوسێ، (هامسێ = هامسا) هاتووە کە زمانی ئاڤێستایە. (وەرگێڕ)

## ژیانی دووەمین(پەسلان)

جموجوڵی خواپەرستی مرۆڤ لە بیروبـاوەڕی زەردەشـتیدا بـۆ مەبەسـتی ژیـانی دنیای کاتی نییە کە بە مردنی خاوەنەکەی نەمێنێ، بەڵکو بـۆ مەبەسـتی ژیـانی مانەوەیە کە تا سەر لە ناویدا بەختەوەر و کامەران یـان بـەد بـەخت دەبێـت. لـە ئاڤێستادا هاتووە کـە زەردەشـت بـۆ تـەواوی خـەڵکی وتـار دەدات و لـە بـارەی پەروەردگاری دەگێڕێتەوە: (ئەی ئەو مرۆڤەی دەمرێت خوداوەندە کە بەختـەوەری و بەد شانسی دروست کردووە، ئەگەر تۆ فەرمانەکانی ئەوت ئەنجام دا و، خـۆت لـە قەدەغە کراوەکانی ئەو پاراست مسۆگەر بە بەختەوەری هەمیشەیی سەردەکەویت، بەڵام ئەشکەنجە و سزای درێژ خایەن بەشی خراپکارانی سەرپێچی کارە).

لە دەقەکی تردا شوێنی بەختـەوەران و بـەد بەختـەکان و خـاوەن ئەشـکەنجەکان دیاری دەکات: (ئەوانەی ڕێگای ڕاست دەگرن لەبەر ڕەزامەندی خودا مسۆگەر دەچنە ناو فیردەوسی بەهرەدارەوە کە لەوێ مانەوە و دروستی تەواو، بـەڵام گومڕایـانی بـێ بڕوا کە شوێن شەیتان کەوتوون شوێنیان دۆزەخە کە لەوایە سزا و ئازار).

ژیانی دووەم (واتە پەسلان لەڕوانگەی بیروباوەڕی زەردەشـتیەوە) تـەواو کـەری ژیانی ئەم جیهانەیەو هیچ واتایەك بۆژیانی دونیا نیە بەبێ بوونی ژیـانێکی دیکـە کە قیامەتە، مرۆڤ بۆ ئەوە دروستکراوە و لە دنیادا ئەرکی خراوەتـە سەرشـان بـۆ وەرگرتنی بەروبووم و بێ ئەو ئەرك پێ سپاردنەش دەستی ناکەوێ، وە لە ژیانەکەدا کە بە تایبەتی ئامادەکراوە بۆ مەبەستی دروسـتکردن و تـەکلیف پێکـەوە، بـەڵام درێژەی ئەو ژیانە ی پەسلان کە لە بیروباوەڕی زەردەشتیدا هەیە زۆر جیاوازی هەیە لە هێڵە گشتیەکانی ئیسلام کـە دەربـارەی ڕۆژی پەسـلان هەیـە، بـەجۆرێك ئـەو بیروباوەڕە لە ئاینە ئاسمانیەکانی تردا دەگمەنە.

ژیانی دووەمین لە زەردەشتیدا ڕاسـتەوخۆ دوای دەرچـوونی گیـان دەسـت پـێ دەکات، بەڵام گەشتەکە دەست بەجێ بۆ جیهانەکەی تر دەست پێ ناکات، چـونکە

جیابوونەوەی گیان و جیابوونەوەی لە لەش و ڕۆیشتنی چەند تەقەلایەکی دەوێ تا بە تەواوی گیان لە شوێنەوارەکانی ماددی دەربازی دەبێت و لە ژێر دەستەیی ئەو ڕزگاری دەبێت و، وە لە هەر سڵتەیەکی دنیایی تر، ئازاد بوونی بە تەواوی لە لەش سێ شەو و سێ ڕۆژ دەخایەنێ و، گیان بەسەر سەری لەشی مردووە دەبێت، یان ووردتر بەر لە هەڵگرتنی تەرمەکەی بۆ ناشتن لە کن سەریەوە دەبێت، لەو کاتەدا ڕابردووی مردووەکە و کردەوەکانی بە دەوری دا دەسوڕێتەوە لە شریتەکی درێژدا.

ئەگەر مردووەکە چاکە کار و تەقوا کار بێ و، ژیانی لە ڕێگای بڕوا و حەق و چاکە و باشیدا بەسەر بردبێ، ئەو کاتە گیانەکەی بە درێژایی سێ ڕۆژەکە بەهرەوەر دەبێ بە هۆی بۆن و بەرامەکەی خۆش کە لێی دەدرێت و، تا ئاستی دڵی شاد و خۆش دەکات خولیای ئەو ژیانە دەبێ کە دوای ئەم کاتە دیاری کراوە چاوەڕوانی دەکات.

بەڵام ئەگەر گیانەکە خراپە کار و یاخی بێ لاپەڕەی کردەوەکانی پڕ بووە لە کرداری خراپە و کە بۆنێ بە گیانەکەی دەدات کە وەکو بۆنگە نیوەی لاشەی مرد و ناخۆشە و، گیانەکەی بەسەرگەردانی و دڵەڕاوکێ و شێواوی دەسوڕێتەوە لە ترسی ئەو چارەنووسە ترسناکەی دوای سێ ڕۆژەکە چاوەڕوانی دەکات.

دوای (٤) ڕۆژ گەشتی کرداری بۆ جیهانەکەی تر دەست پێ دەکات و، گیانی پاکژ لە گەشتە سەرکەوتوەکەیدا بۆ ئاسمان لە ناو بۆن و بەرامەکەیدا دەبێ کە قەت لە زەویدا هەڵی نەمژیوە، بە پێچەوانەوە گیانی خراپکار بیری چارەنووسە مەترسیدارەکە کە چاوەڕوانی دەکات دەیڕوخێنێ و شەکەتی دەکات و، ڕابردووەکەی بە خەم و پەژارە باری قورس دەکات و، ئاساییە کە ڕێگایەکەی بۆ ئاسمان لە ناوەندەکی پەست و ترس و بێزاریدا و لە ناو بۆنەکی بۆنگەندا کە مرۆڤ خۆی بۆ ناگرێ ڕێگای لێ دەبڕێت، کە هەرگیز بۆنی ئاوای لە زەویدا نەکردووە.

گیانی چاك و خراپە کار بەو بۆنەوە کە باسکرا لە گەشتەکەیدا بۆ ئاسمان بەردەوام دەبێ تا دەگاتە ئەو سنوورەی دنیا و پەسڵان لە یەکتر جیا

دەکاتەوە، خوداوەند لەوێدا پردی چینڤات (chinvat)[1]ی دامەزراندووە، واتـە پردی جیاکردنەوە و لەوێوە گیانەکان هەموویان ڕادەوەستن و چاوەڕوانی ڕێگـا پێدان و ڕوخسـەت دەکەن بۆ پەڕینەوە، یان بـۆ بەهرەیـەکی هەمیـشەیی یـان سزایەکی هەمیشەیی[2].

گیانــەکان زۆر لای پــر دەکەنــەوە ناوەســتن و، هەریەکــەیان لــەو گیانانــە پێـشەوازییان لێ دەکـرێ لەسـەر وێنـەی هێمـایی ئـەو کردەوانـەی لـە جیهانـدا کردونیان، گیانی تەقوا کار و چاك کچێکی زۆر جوان و شۆخ کە وێنەی نـەبێ لـە جوانی دا لە جیهاندا پێشەوازی دەکات، کە بەرگەکی سپی پاکی پۆشیوە و، بەژنی مام ناوەندە و، سیمای شکۆداری و ڕەسەنی پێوە دیارە و، گیان کە لەم جوانیە کە قەت بەرچاوی نەکـەوتووە سـەری سـوڕ دەمێنـێ و، کـچەکە لـە گیانەکـە نزیـك دەبێتەوە و زۆر سوپاسی و ستایشی دەکات کە سەقام گیری ئەو لە جیهاندا لەسەر گوێڕایەڵی خودا ئـەو ئـاوای جـوان و قەشـەنگ و خۆشەویـست کـردووە، لێـرەدا گیانەکە پرسیار دەکات: تۆ کێی؟ کیژەکە وەڵام دەداتـەوە: (مـن کـردەوە چـاکە و وەرگیراوەکانی تۆم لای خوا، من خۆش و ویستراو بـووم، خـەڵکت زیـاتر کـرد لـە خۆش ویستی مندا، من جوان بـووم جـوانترت کـردم و، شـان و شـەوکەتت بـەرز کردمەوە).ئەنجا هەموو کردەوە چاك و جوانەکان کـە گیـان بـە درێـژایی تەمـەنی کردونی قسەی لەگەڵدا دەکەن.

---

[1] لە فەرهەنگی ئیریەن ڤەچدا: (چڤەند - cvant) و، (چەڤەند = cavant) هاتووە واتە چەند کە بـۆ زانینی ژمارە بەکار هاتووە، و جا نازانم ئایا ئەم ووشەیە هەمان ووشەیە یان ووشەیەکی ترە.

[2] قورئانی مەزن دەفەرمێ: (كَلاَّ إِذَا بَلَغَتِ التَّرَاقِيَ(٢٦)وَقِيلَ مَنْ رَاقٍ(٢٧)وَظَنَّ أَنَّهُ الْفِرَاقُ(٢٨)وَالْتَفَّتِ السَّاقُ بِالسَّاقِ). واتـە: کاتـێ گیـان گەیـشتە گـەر و، وە وتزاکـێ دەیگێڕێتـەوە؟! زانـی ئەمـە جیابوونەوەیی (لە نێوان گیان و لاشەدا)، وە قاچی تێك ئالآ، ئـەو ڕۆژە شـوێنی گەڕانـەوە بـۆ لای پەروەردگارتە. (وەرگێڕ)

دوای ئەوە گیانی باش ڕێگەی پێ دەدرێ کە بە سەر پردەکەدا بپەڕێتەوە بە هاوڕێیەتی کچەکەکە و ڕێنومای ئەو و، لە هەنگاوی یەکەمدا لەسەر پردەکە ڕێگاکەی بۆ فراوان دەبێ، گیانەکە بە ئاسانی و بێ ترس و دڵە ڕاوکێ و تێك چوون دەپەڕێتەوە، تا دەگاتە ڕووناکی بێ سنوور لەماڵی مانەوە (بەهەشت) دا و، بە مانەوەی هەمیشەیی بەهرەوەر دەبێ لە وێدا و، تا ڕۆژی زیندووبوونەوە و وەرگرتنی پەڕاوەکان تەسبیحات و سوپاس و ستایش بۆ خوا دەکات.

بەڵام گیانی خراپەکار پیرەژنێکی سەرماش و برنج و ناشیرین پێشەوازی لێ دەکات کە مرۆڤ لەبەری ڕادەکات و، بۆنگەنیوە و، ڕەق و ڕووت و نارەسەنە و، بێ ئابڕویی و بێ شەرمی پێوە دیارە و، گیان لەبەر ناشیرین و نارەسەنیەکەی ڕادەکات و، بە بیز لێ کردنەوە و سوکی و، ڕقەوە سەیری گیان دەکات و، گیانیش دەست پێشخەری دەکات و دەپرسێ: تۆ کێی؟ پیرەژنەکە بە تاوانبارکردنەکی ئاشکراوە دەڵێ: (من کار و ڕەفتارە خراپ و ناشیرینەکانی تۆم و، لای خەڵکی ناشیرین بووم تۆش خەڵکت پتر کرد کە ڕقیان لێم بێ و، ناشیرین بووم و تۆ ناشیرین ترت کردم، لە پایە و شکۆی منت دابەزاند تا وام لێ هات قیزە وون و، بێزار بم).

ئەنجا پیرەژنەکە بە توند و تیژیەکەی زیاتر دەکات و سەرزنشتی دەکات کە بەهۆی گوێڕایەڵی نەکردنی خوا وای لێکردوە بەشێوەیەك کە لەتوانای مرۆڤدا نیە، ئەنجا هەموو ئەو تاوان و گوناهانەی بۆ دەگێڕێتەوە کە لە زەویدا ئەنجامی داون.

کاتێ گیان بە هاوڕێیەتی پیرەژنەکە پردی جیاکردنەوە دەبڕێ وورده وورده ئەم پردەیە تەنگە بە روو تەسك دەبێتەوە و، باریك دەبێ تا لە کۆتاییدا وەکو تاڵە مووەکی بەسەر دێ و، گیانی تووشی تۆقین و شپرزە بوون دێ و، هەنگاو هەڵدەنێ و ڕاستە و چەپە لارەلارەی دەکات و هیچ شوێنەکی تریش لە پردەکە شك نابات و، ئەنجا دەکەوێتە قوڵایی چاڵە تاریك و شەوە زەنگەکەوە، کە نزیکە ئەو ئەنگوستە چاوو تاریکی یە چڕو پڕە لە ناوی ببات و، گیانەکە لەناو ئەو دەشتە کاکی بە کاکیەدا لێژ دەبێتەوە کە نازانێ کوێ کوایە و، تا پەسڵان سزا و ئەشکەنجە دەچێژێت.

لەڕاستیدا ئەئەو کچە شۆخ و شەنگە ئەئــەو پیرەژنــە کەسـایەتی واقعــی نــین، بەڵکو وێنەی هێماین بۆ کارەکانی دنیایی، یان بە دەستەواژەیەکی وودتــر دیــاری کردنەکی بەرجەستەیی کارەکانی مرۆڤــە لــە ژیــانی دنیــادا، وە ئــەم هێماکردنــە کرداری قیامەتی ئیسلامی لە بەرامبەردا هەیــە، وەك گەڕاوەتــەوە: (بــڕوادار لــە کاتی دەرچونیدا لە گۆڕیدا کارەکانی لە جوانترین دیمەنیــدا و لــە خۆشــترین بۆنــدا پێشوازی لیّ دەکات و دەڵێ: (ئایا دەمـناسی؟ دەڵێ: نەخێر بەڵام خوا بۆنی خــۆش کردوویت و وێنەی جوانکردویت.

دەڵێ: من لە دنیاش ئاوا بووم و، من کردەوەی باشی تۆم و چۆن لە دنیادا مــن سواری تۆ بووم ئیمڕۆ تۆ سواری من ببە، ئەوەش فەرمایشتی ئەوە: (وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَى ظُهُورِهِمْ).

ئەو گیانەی کردەوە چاك و خراپەکانیان وەکو یەکە لە پێوانەدا لە تــەك پردەکــەدا دەمێنێتەوە و بوار بە پەڕینەوەیان نادرێ و، شوێنەکی تریش نییە و، خراپکار نینە کە حوکمی خراپکارییان بە سەردا بدرێ و، چاکەکاریش نین حوکمی چاکەکارییان بەسەردا بدرێت و، بەڵکو لەو نێوانەدا دادەبن و، بۆیە بۆ جیهانەك دەگوازرێنەوە لە نێوان بەهرە و سزادا بێت، لەوێدا دەکەوێتە چاوەڕوانییەوە لە نێوان هیوا بــوون لــە ڕزگــار بــوون و ترسان لە چارەنووسی هەتا ئەو ڕۆژەی فو دەکرێ بە (صور)دا.

وە هەڵوێستی دواڕۆژی ئەو زەردەشتییانەی کە چاکەو خراپەکانیان یەکسانن تا ڕادەیەکی زۆر بە هەڵوێستی (ئەعرافیەکان) دەچێ کە قورئان سەبارەت بــە ئــەوان دەفەرمێ: (وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ وَعَلَى الاعْـرَافِ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلاًّ بِسِيمَاهُمْ وَنَادَوْاْ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ أَنْ سَلاَمٌ عَلَيْكُمْ لَمْ يَدْخُلُوهَا وَهُمْ يَطْمَعُونَ) واتە: لە نێــوان هــەردوو لادا پــەردەیێ هەیــە (واتــە: نێــوان بەهەشــتیەکان و دۆزەخیــەکان دا) وە لەســەر ئەعراف پیاوانێ هەیە بە دەم و چــاویان دەیانناســن،بــانگی خــاوەن بەهەشــتەکان دەکەن سەلامتان لیّ بێ و، نەچوونە ناویەوە و ئــەوان بــە تــەمای ئــەوەن). وە لــە

بارەیان دەفەرمێ: (وَنَادَى أَصْحَابُ الاعْرَافِ رِجَالاً يَعْرِفُونَهُمْ بِسِيمَاهُمْ قَالُوا مَا أَغْنَى عَنْكُمْ جَمْعُكُمْ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ) الاعراف/٤٨. واتە: خاوەن ئەعرافەکان پیاوانەکیان بانگ کرد (لە دۆزەخدا) بە سیمایەکەیان دەیانناسینەوە و، ووتیان: کۆمەڵیتان و خۆ بە زلزانیتان بێ نیازی نەکردن.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بارەیان دەفەرمێ: (ترازووەکان لە دوا ڕۆژدا دادەنرێن خراپەکان و چاکەکان دەکێشرێن، کێ چاکەکانی بە قەد ئەسکوایەك (صوابە) زیاتر بێ لە خراپەکانی ئەوە دەڕواتە بەهەشتەوە و، کێ خراپەکانی بەقەد ئەسکوایەك لە چاکەکانی پتر بێ دەڕواتە ئاگرەوە.

نەفەرێ پرسیاری کرد ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر چاکە و خراپەی یەکسان بوون؟ فەرمووی: (أولئك أصحاب الأعراف لم يدخلوها وهم يطمعون) یارانی ئەعراف - وەکو زانراوە ئەوانە (گەلێکن کە چاکەکانیان لە ئاگر دوری خستونەوە و، وە خراپەکانیان لە بەهەشت قەدەغەی کردووە). ئەوانە لە بەرزایی یەك دەوەستن لەسەر پردەکە و، لەودیوە سەیری بەهەشت و دۆزەخ دەکەن و، ئەوانە نە ئەهلی بەهەشتن نە ئەهلی دۆزەخن تا خودا حوکمیان لە نێواندا دەکات.

## پەسڵان و زیندوو بوونەوە و لێ پرسینەوە):

سفری ئەلیسنا بە ئاشکرایی ئاماژە بە هاتنی ڕۆژگارێ دەکات کە ڕۆڵی گرنگی مرۆڤ لەو ڕۆژەدا لەسەر زەوی کۆتایی پێدێت و هەروەها جوڵەی ژیانیش دەوەستێت بەهۆی ئەو پەیوەندیە بەهێزەی کە لەگەڵ مرۆڤی بەرپرسیار هەیەتی لەلایەك ئەنجا لە لایەکی تریشەوە دەگاتە ئەو ئاستە کە ماڵیەی بۆ دیاری کراوە، ئەو کاتە قیامەت دادێ و زەوی بەو مرۆڤانەی لە سەری ماونەوە دەکەوێتە جووڵە و تەکان و، چیاکان پەرش و بڵاو دەبنەوە و، کانزاکان لە ناو جەرگەی زەویدا دەردەپەڕن و، ئاگر لە هەموو شوێنەکی زەوی بەرز دەبێتەوە و سەرجەم ژیان لەناو دەچێت. ئەوەی لە سفری ئەلیسنادا هاتووە نزیکە لەوەی لە مەسەلەکانی

ئاخیرەتی ئیسلامی بڕیاری لەسەردراوە، کە گەیشتنی مرۆڤ بەو تەمەنە دیاری کراوە کە بۆ تەواو کردنی ڕۆڵی لە زەویدا دانراوە پەیوەست کراوە بە کۆتایی جیهان و پێچانەوەی زەوی و، ئەنجا هەموویان بۆ لێ پرسینەوە زیندوو دەبنەوە[1].

وە لە ڕۆژی زیندوو بوونەوە (البعث)دا وەکو لە چاوگەکانی بیروباوەڕی زەردەشتیدا هاتووە گیان بۆ مرۆڤ دەگەڕێتەوە و، (نامەی ژیانی) لە گەڵدایە ئەو

---

[1] بۆ نموونە قورئانی پیرۆز سەبارەت بە کۆتایی زەوی و کۆمەڵەی خۆر و، گەردوون دەفەرمێ: (إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ(١)وَإِذَا النُّجُومُ انكَدَرَتْ(٢)وَإِذَا الْجِبَالُ سُيِّرَتْ(٣)وَإِذَا الْعِشَارُ عُطِّلَتْ(٤)وَإِذَا الْوُحُوشُ حُشِرَتْ(٥)وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ(٦)وَإِذَا النُّفُوسُ زُوِّجَتْ(٧)وَإِذَا الْمَوْءُودَةُ سُئِلَتْ(٨)بِأَيِّ ذَنْبٍ قُتِلَتْ) التكوير/١- واتە: کاتێ خۆر پێچرایەوە کاتێ ئەستێرەکان تاریك داهاتن. کاتێ چیاکان چوون بە هەوادا و بوونە تۆز. کاتێ هەورەکان پەکیان کەوت. کاتێ دڕندەکان زیندوکرانەوە. کاتێ دەریاکان بوون بە ئاگر. کاتێ زیندە بەچاڵان زیندوو کرانەوە. بە کام تاوانە کوژران.

لە ڕووی زانستی فیزیاشەوە هەموو سەرچاوە گەردونناسیەکان باس لە لەناو چوونی گەردوون و تێك چوونی ژیان دەکەن کە لە ڕاستییەکی زانستی مسۆگەرە و، ئەو کاتە خۆ هایدرۆجینی نامێنێ و، ئەستێرەکان سووتەمەنییان تەواو دەبێ. و تا پرۆفیسۆر (جورج گاموف) دەڵێ: (دوای چەند ملیۆن ساڵێ خۆر دەکشێ تا دەگاتە خولگەی زوهرە و زیاتریش و، ڕووناکی بۆ (١٠-٣٠) میلۆن جار زیاتر پتر دەبێ و، ئەو کاتە زەریاکان لە زەویدا بە توندی دەکوڵن). کتێبی (مادده زەمین و ئاسمان/ ل ٥٣٣) بە فارسی. وە لە (الکون العمیق/د: علی الامیر/ل٢٦)دا هاتووە کە خۆر لە چرکەیەکدا (٦٧٤ ملیۆن تەن هایدرۆجین دەگۆڕێ بۆ ٦٧٠ ملیۆن تەن هیلیۆم) بەو پێیە خۆر لەهەر چرکەیەکدا (٤) ملیۆن تەنی لێ کەم دەبێتەوە. کەواتە ڕۆژێ دێ خۆر و ئەستێرەکان بکوژێنەوە. وە بڕوایە خۆر و کۆمەڵەکەی تەمەنی یان (٤. ٥-٥) هەزار ملیۆن ساڵ بێت. وە لە لاپەڕە (١٢٨) بابەتێ دەنوسێ بە ناوی (موت النجوم- مردنی ئەستێرەکان) و لەوێدا دەڵێ: (ئەستێرەکان کە وەکو ئاگردانێکی گەرمی ئەتۆمین لە کاتێکدا کەرەستەکانیان تەواو بوو دەکوژێتەوە. وە لە کاتێکدا ١٠٪ یان زیاتر کۆگای هایدرۆجینی لە دەست دا هاوسەنگی ئەستێرەکە تێك دەچێ و سەردەمی پیری دەست پێ دەکات).

وە قورئانی مەزن دەفەرمێ: (إِذَا زُلْزِلَتْ الأَرْضُ زِلْزَالَهَا(١)وَأَخْرَجَت الأَرْضُ أَثْقَالَهَا). الزلزلە/١- واتە: کاتێ زەوی کەوتە جوولە چۆن جوڵانێ. وە زەوی تەنە قورسەکانی ناردە دەرەوە.

(بیریت ستانلی کونجدن/سروشت ناس و فەیلەسوف) لە کتێبی (الله یتجلی في عصر العلم/ ل ١٧) دا دەنووسێ: (ئەو گەردوونەی لە ناویدا دەژین ناشێ هەر ماددەیەکی ڕووت بێ بەڵکو مادده و گیانە، یان مادده و نا ماددەیە و، ئێمە ناتوانین شتی نا ماددی تەنیا بە شتی ماددی وەسف بکەین).

لە هەمان کتێبدا (جون کلیفلاند کوثران/ کیمیا زان و متماتیکی زان/ل (٢٥) دا دەڵێ: کیمیا پێمان دەڵێ کە مادده هەندێکی خەریکی لەناوچوونە، بەڵام هەندەکی بە خێرایی و هەندەکی بە هێواشی بەرەو لەناو چوون دەڕوات. بەو پێیە مادده ئەبەدی نییە؛ دیسان ئەزەلی نییە، کەواتە سەرەتای هەیە. . . ).

بەو پێیە هەموو نامە ئاسمانیەکان و زانست کۆکن لەسەر سەرەتای گەردون و لەناو چوونی و، بوونی تەمەنەکی دیاری کراو بۆ ماددەکان. (وەرگێڕ)

نامەی کە فریشتەکان هەموو کرداروو گفتارەکانی مرۆڤیان لەڕۆژی بەرپرسیاریەتیەوە تارۆژی مردن لەو نامە تۆمار کردووە. نامەکە دوو بەشە، بەشی یەکەم بۆ کرداری چاك و باشە و، بەشی دووەم کردەوە خراپ و تاوانەکانی تێدایە و، دوای مردن و بەرز بوونەوەی گیان بۆ ئاسمان لە گەشتی یەکەمیدا بۆ جیهانەکەی تر نامەکەی دەپێچرێتەوە و، بە فریشتەی تایبەتی دەسپێردرێ بۆ پاراستن و هەڵگرتنی تا ئەو ڕۆژەی هەموو کردەوەکانی تێدا پیشان دەدەرێ کە لەوێدا تۆمار کراون بۆ لێ پرسینەوە و کێشانە و تەرازوو.

لەو ڕۆژەدا کردەوەی بەندەکان دەکێشرێت و، کێ کردەوە چاکەکان قورس تر بوون لە کارە خراپەکانی ئەوە تایەی کردەوەی چاکەکانی گران ترە و، ئەو کەسە سەر بە بەختەوەرەکانە، کێ کردەوە خراپەکانی قورس تر بوو لە کردەوە چاکەکانی ئەوە تایەی تەرازوەکەی سووك بووە و، ئەو سەر بە بەدبەختەکان و کەسانی ئەشکەنجەدارە و، کێ کردەوەی چاك و خراپی وەکو یەك بوو لە نێوان بەختەوەر و بەد حاڵدایە تا حەق شکۆدار بڕیاری تێدا دەدات.

دوای ئەوە خودا ئەهورا مزدا فەرمان بە پەڕینەوەی هەموویان دەکات بە سەر پردەکەدا بەسەر دۆزەخدا رایەڵراوە و، بەختیارەکان بەسەریدا ڕەت دەبن و، بڵێسەی دۆزەخیان بەرناکەوێ و، هەتا بەسەری دابڕۆن جێگاکە فراوان دەبێ تا دەگەنە ئارامگای بەختەوەرەکان، کە بەهەشتە و کە لە ناویدا کامەران و خۆشحاڵ دەبن و قەت دوای ئەوە ناخۆشی نابیننەوە بەڵام خراپەکاران کە بەسەر پردا دەپەڕنەوە دەبینن لە پێشەوەیاندا وەکو تاڵی موو یان تیژایی شەمشێر وایە، بەڵام بە پەڕینەوە بەسەریدا تووشی سزا دەبن و، بۆیە قاچەکانیان دەخلیسکێ وهەتا هەتایە لە دۆزەخ دەمیننەوە، یان وەك ئەلیسنا دەڵێ بۆ ماوەیەکی درێژ [1].

---

[1] قورئانی مەزن لە سورەتی (القارعة)دا دەفەرمێ: (فَأَمَّا مَنْ ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ(٦) فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَاضِيَةٍ(٧) وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُه(٨) فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ(٩) وَمَا أَدْرَاكَ مَا هِيَهْ(١٠) نَارٌ حَامِيَةٌ(١١)) واتە: ئەنجا کێ کێشەی کردەوەکانی قورس بوو ئەوە لە ژیانەکی خۆش نود دایە. کێ ترازوی کردەوەکانی سوك بێ ئەوە زێدی ئەو هاوییەیە؟ چوزانی هاوییە چییە؟ ئاگرەکی گەرمە. (وەرگێڕ)

## بەندی سێیەم: لقەکانی ئاین:

ئازادی مرۆڤ لە پەسەند کردنی ئەرك پێ سپاردنی خوایی (التکلیف)دا [1] پەیوەستە بەو جێ بەجێ کردنەی بە تەواوترین شێوە دەیگرێتەوە خۆی، دەبێ مەبەستیش لەمەدا بۆ خوا بێت. لەبەر ئەوە بەر لە هەموو شتێ داوا لە مرۆڤ ئەرك پێ سپێراو دەکرێ کە بڕوا بە خوا بێنێ وەك لە ئەرك پێ سپێر کە سیفەتێکی تایبەتی ترە لە کردگار (الخالق)دەدرێتە پاڵ دروست کەر و، ئەگەر بڕوای هێنا بڕواکەی بە ئەرك پێ سپاردنەوە دەبەسترێتەوە و، بڕواش لە سەر سێ بنچینە دەمەزرێ: (بڕوا بوون بە دڵ و دان هێنان بە زمان و، کردار بە ئەندامەکان و، هەموویان کرداری خواپەرستین لەسەری لە بازنەی ئەرك پێ سپاردندا.

لە چەمکی ئیسلامی سادەی زەردەشتی دا بە هەمان پاڵ دەوترێ (سەرچاوەکانی ئەرك پێ سپاردن) کە مەبەستی پێ لە واتای بڕوایە و، بە بڕوا و ئیمان پەیوەندی بە خوا دێتە دی بەو سیفەتەی لە سەر بنکەکانی پەیوەندی ئەرك پێ سپاردن دادەمەزرێت، سەیر نییە کە لەسەر هەمان ئەو بنچینانە دامەزرێ کە ئیسلامی لەسەر دامەزراوە کە ئەمانەن: هوماتا (هومت humata) و هوخاتا (هوخت hukkhata) و هڤارشتا (هورشت hrarshta) کە مەبەستی بە دوای یەکدا لە بڕوا و قسە و کردەوەیە و بە هەموویان تەکلیف تەواو دەبێت[2].

وە ئاڤێستا بە دەق ڕایگەیاندووە کە ئەو مانایە بە تەنیا مرۆڤ لە پیسی بێ بڕوایی و هاوبەشی پەیدا کردن و تەواوی بڕوا بەتاڵەکان پاکژ دەکاتەوە.

خوای گەورە لە قسە کردنیدا لەگەڵ زەردەشتدا دەفەرمێ: (پاکژی دوای لە دایك بوون باشترین شتە و، باشترین چاکەیە لە دوای ژیاندا پاکژی ئەی زەردەشت لە ئاینی خوادا ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی پاکژ بکاتەوە بە بڕوای باش و قسەی باش و کرداری باش).

---

[1] بۆ ووشەی (تکلیف) لە زمانی کوردیدا زۆر واتا دانراوە، وەکو: ڕوو لێ نان - سەپاندن - پێ سپاردن - ئەرك پێ سپاردن - داوا کردن - ناچارکردن.

[2] ووشەی (هومەت) لە هیمەتەوە هاتووە واتە: نیاز و مەبەست و وورە: (هورشت) ڕەوشت دەبەخشێ. (هوخت) واتە (وتن). (وەرگێڕ)

هیچ ڕێگایەکیش نییە بۆ پاکژی دەروون و چاك کردنی بە بڕوا نەبێ و، خوای گـەورە لەسەر زمانی زەردەشت بۆ خەڵکی دەدوێت و دەفەرمێت: (ئەی ئادەمیزاد دەرونت پاکژ بکەوە لە هەر پیسی و چڵکەکی دەرون و، هەموو مرۆڤەکی زیندوو لەم دنیایە ماددیەدا دەتوانێ دەرونی پاکژ بکاتەوە بە بڕوای باش و قسەی باش و کرداری باش).

بەڵام ئەو کەسەی بەند نییە بە خواوە بە هۆی بڕواوە و بێ ئاین و شەریعەتە ئەوە بێ بڕوایە وەکو ئاڤێستا پێناسەی دەکات عەقیـدە خـراپ و، هـەناو پـیس و دەرون چڵکنە و خەڵکی دەوری خۆشی پـیس دەکـات و، بەنـدەکانی خـوای نزیکـی پـیس دەکات و، قەدەغەیان دەکات لە خۆشی وەرگرتن و سوود وەرگرتن و سوود وەرگـرتن لە خواردن و جل و بەرگ و بەهرەکانی تری ژیان. دیسان بە سـتەمەکەی کاردەکاتـە سەر ئاوو خراپی دەکات و کار کشتوکاڵ و گیانلەبەران و لەناویان دەبات و، خـەڵکی لەبەر دەستیدا ئاسودە نابێ و، خراپە بە مردنی ئەو نەبێ بنەبڕ نابێت.

لێرەدا لەمەولاوەدا زەردەشتییەت لەگەڵ ئیسلامدا یەك قـسەیان هەیـە، نـەك هەر لەمەدا کە بڕوا بوون بە خوا بناغەی پەیوەندی و خۆ حەواڵە دانـە بـە خـوای گەورە بەڵکو لەوەشدا کە جێ نشینی و نماینەدەیی بۆ خـوا لـە زەویـدا بـۆ کەسـێ شایستە دەبێ کە دەرون پاك بێ لە هاوبەشی پەیدا کردن و پیسیەکانی و، پاکـژی دەرون بە بڕوا نەبێ نایەتە دی و، ئەگەر ئەرك پێ سپاردن سەقامگیری بێ لەسـەر ویستی خودا لە ژیاندا جێنشینی و نوێنەرایەتی تەنیا شوێن گرەویی خوای گـەورە دەبێ تا ئەو کارە بکات کە خوای گـەورە دەیکـات و، هـەر کەسـێك پـاك نـەبێ ناتوانێ گرنگی بەم دوو ڕۆڵە گرنگە بدات.

وە لە زەردەشتی دا ڕاگەیاندنی بڕوا بە ئاشکرایی بە خوای گـەورە و پەیوەنـدی داری ئەو تەواو نابێ وەکو ئەرك پێ سپێراو تا ئەو کاتەی زەردەشتی نەگاتە ئاستی لەسەرخۆیی و هێمنی و، پشتێنەی پیرۆز نەبەستێ و، ئەو کاتـە داوای لێ دەکـرێ بە زمان گەواهی بۆ ئاینەکە بدات کە ئەمە دەقەکەیەتی: (من گەواهی دەدەم کـە بڕوام هەیە بە خوای چاکە و دەوڵەمەند و، ئەو دەپەرستم زەردەشـتی پێغەمبـەری

بەرێز گوێڕایەڵی دەکەم و، دوژمنی شەیتان و یارمەتی دەرانی ئەوم و، دیسان شاهیدی دەدەم من موسڵمانم و بە ڕاست دانەری عەقیدەی زەردەشتیم و، ستایشی فریشتەکانی خوا دەکەم و، هەموو چاکە و، هەموو شتێ لە بوونەوەردا بۆ خوای گەورە دەگێڕمەوە).

وە لە سەر هەموو بڕوا دارێك پێویستە بە درێژایی تەمەنی شەهادەی ئاینی بدات تا خەڵکی بزانن کە پەیوەندیدارە بە خوای گەورە وە سەر بە ئەوەو، وە بە دان هێنان و گوێڕایەڵی بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا هێناویەتی، وە گەواهی دان لە زەردەشتیدا بەو پایە دەرخستنی سێ بنەماکانی بڕوایە، بە بڕوا بوون و گوفتار و، کردەوە و، ئەمە مانای تەواوی یەکتاپەرستییە.

بە شایەتمان بۆ خوا کە پەروەردگار و ئەرك سپێرە و، دان هێنان بە زەردەشت کە ڕەوانە کراوە و پێغەمبەرە مرۆڤ پاکێ دەبێتەوە و پەیوەندی بە ڕابردویی و نەزانیەکەیەوە هەرچییەك بێ دەپچڕێ، خوای گەورە بە زەردەشت دەفەرموێ: (ئەی زەردەشت ئاینی خوا هەموو کەسێك کە دان بنێ پێی لە هەموو بیرێکی خراپ پاکژی دەکاتەوە، وە لە هەموو قسە و کارەکی خراپ، وەکو چۆن با لە ئاسماندا هەور و تەم و مژ ڕادەماڵێت و، ئەگەر مرۆڤ لەو ساتەوە کە بڕوا دێنێ و تەنیا کاری چاکە دەکات خوا هەموو تاوانەکانی دادەپۆشێ و گوناهەکانی ڕەش دەکاتەوە).

دوای بڕوا هێنانیش حەرامە موسڵمان لە ئاینەکەی پاشگەز بێتەوە و، هەڵگەڕانەوە و لە دین دەرچوون بە کوفرەکی ڕوون و تاوانەکی گەورە و، لوتکەی تاوانەکان لە قەڵەم دەدرێت و، هەر هەڵگەڕاوەیەك بێ دواکەوتن دەبێ لە سێدارە بردێت، تا گاڵتە بە ئاینی خوا نەکرێت و، قودسییەت و پیرۆزی شەهادە و ڕێزەکەی بپارێزێت.

وە لە چەرخی ساسانیدا دەقەکانی ئاڤێستا دوای کۆکردنەوە و ڕێکخستنیدا ڕێگای چاوپۆشی بۆ هەڵگەڕاوە (المرتد) دانا و، دەقەکە لەسەر ئەوە دانرا کە

یەکەمجار بخرێتە زیندانەوە و، پیاوانی ئاینیش ساڵەکی حوکمی شەریعەتیان بۆ بخوێنێتەوە و، ئامۆژگاری دەکەن و ڕاستی سروشتی دابەزیو بۆ سەر زەردەشتیان بە بەڵگەی دەم کوتکەر ڕوون دەکەنەوە و، هەموو گومانەکی لێ دوور دەخەنەوە کە لە ڕاستی دووری خستبۆوە، ئەنجا ئەگەر پەشیمان بۆوە و داوای لێ بووردنی کرد لە زیندان ئازاد دەکرێ و، ئەگەر سوور بوون و خۆ بە زلزانی هانی دا بۆ هەڵگەڕانەوە ئەو کاتە گورج فەرمانی کوشتنی دەدرێت.

وە هەر کەسێ بانگ بۆ هەر ئاینەکی تری جگە لە ئاینی زەردەشت بکات، یان بڕوایەکی ناحەق فێری خەڵکی بکات و، بیەوێ موسڵمان لە خشتە بەرێ و لە ئاینی خوا هەڵیان گێڕێتەوە کە گەورەترین و جوانترین ئاین و بڕوایە و، باشترین ڕێبازە، ئەوە لە ڕوانگەی شەریعەتەوە هێنانی کاول کارییەکی نادیارە بەسەر ئایندا و، هێنانی بە فەتارەتدانەکی ئاشکرایە بەسەر ئایندەدا، هەر کەس ئەوە بکات ئەوە بە هۆی تاوانکردنەکەی سەبارەت بە مافی خوا و مافی بڕواداران بە دوو سەد دار سزا دەدرێت).

زۆر لە لێکۆڵەران لە سەرچاوەکانی ئەرك پێ سپاردن لە زەردەشتیدا بە پێچەوانەی سروشتی خۆی لێی حاڵی بوون، لەوانەش وایان پێناسە کردووە کە زانیارییەکانی زەردەشتی تەنیا ڕەوشتییە، یان پوختەی ژیانی ڕەوشتییە کە وەکو دەبینرێ زۆر لە کارە باشەکان لەگەڵ کورتەی زۆریشیدا لە خۆ دەگرێ کە شوێن ئەو دەقە ئاڤێستایانە دەکەون کە لەسەری وەستاوە و لە سەردەمی ساسانیەکاندا دەستکاری کراوە.

لە چاخی ساسانیدا ئەم سەرچاوانەی تەکلیفەکان و ڕوو لێ نانەکان بە هاندەری نیاز ڕاستی و، ڕاستگۆیی و ڕاست کرداری دادەنرا، تا جمۆجۆڵی مرۆڤ لە ژیاندا بەرەو ئاراستەی بیر و قسە و کرداری باش بچێت و، لەسەر مرۆڤ پێویستە لە بەرامبەر ئەوەدا لە سێ بیر دوور بکەوێتەوە بیری خراپ و، قسەی خراپ و کرداری

خراپ، لە پاشان ئەمە لە ڕوانگەی یاسا دانەری ساسانیدا لە ئاستی ئەو یاسایە دانرا کە ژیانی دنیایی بڕواداران ڕێك دەخات.[1]

هەموو ئەمانە هەستیان بە چەمکی بڕوا نەکرد، مەگەر لایەنە جوڵەییەکەی نەبێ کە مرۆڤ پاکژو خاوێنی لێ بەدەست دێنێ. ئەمەش بە بیر کردنەوەی باش و، قسە و پەیڤی باش و کردەوەی باش. وە سەرچاوە و ڕێژنەکانی ئەرك پێ سپاردن و تەکلیف - وەکو باسمان کرد - ئەوانە بنچینەکانی بڕوان لە ڕیز کردنە سروشتییەکەیدا، کە چەند مانایەکی دەرونی دەگرێتەوە کە لە بووندا دوو ڕواڵەتی هەیە، زانین و کردەوە هەردووکیان لە دەربڕینی شەهادەدا دروست دەبن کە مانای دان پیاهێنان و مل کەچ کردن و، پەسەند کردن لە خۆ دەگرێت و، بەمە مرۆڤ وا بەستە دەکرێ بە خوداوە و بە بڕوادار و موسڵمان و بەرپرسیار ناوەزەد دەکرێت و، لەو ڕۆشناییەشەوە لەگەڵ دەوروبەری دەرەوەدا هەڵس و کەوت دەکات.

وە کرداری ئاینی زەردەشتی یان لقەکانی وەکو حاڵەتی ئیسلام لەسەر بڕوای دڵی دادەمەزرێ کە بناغەی هەرە گەورەی بڕوایە و، ئەو پەڕی خۆسپاردن و گەردن کەچییە لەوەی خوای گەورە کردویە بە ئەرك بەسەریەوە، ئەگەر بابای ئەرك پێ سپێراو ڕووی لەو ئەرکانە کرد کە خوا پێی سپاردون و هەموو جووڵە و سەودایەکی

---

[1] وەك لە کتێبی (مزدیسنا وا دب پارسی/ل: ١٨٥)دا هاتووە هەندێ لە "خۆرهەڵاتناسان بڕوایان وایە ئاڤێستا بە هەڵمەتی ئەسکەندەر بۆ سەر ئێران لە ناو چووە و، لە چاخی ئەشکانیدا جارەکی تر نووسراوەتەوە". بەڵام هەندێ دەڵێن: لەسەردەمی ساسانیدا ئەردەشێری ساسانی فەرمانی بە پیاوەکی ئاینی زەردەشتی کر ئاڤێستا سەر لە نوێ بنوسێتەوە.

بێگومان ئەم ئاڤێستایەش زۆر جیا بوو لە ئاڤێستای کۆن، دیسان ئەم ئاینە لە دەوڵەتی ساسانیدا یاسای ڕەسمی بوو، دوای نەمانی ئەم دەوڵەتە زیاتر ئاڤێستا کەوتە بەر دەنو قەڵەمی دەسکاری کەرانەوە. هەتا زانایان باس لە کتێبێکی کوردی دەکەن بە ناوی (دین کرد) کە لە چەرخی سێ‌ی کۆچی دا نووسراوە و نیمچە بەرگرییەك لە دوا خوایی دەکات لە دینی زەردەشتیدا وە بڕوا وایە ئەردەشێر کوڕی بابك لە تیرەی شوانکارە بووە و، (٢٥) ساڵ پاشایەتی کردووە بە سەر کوردستان و فارسدا و، بەو پێیە ئەردەشێر کورد بووە نەك فارس، تا هەندێ مێژوو نووس دەوڵەتی ساسانی بە دەوڵەتەکی کوردی دادەنێن. (خوا زاناترە)، (وەرگێڕ).

بەپێی داخوازی و قەدەغە کراوەکانی فەرمانـەکانی خـوایی کـرد، ئـەوە حـوکمی گوێڕایەڵی بۆ دەدرێ و، ئەگەر لە داخوازیـە خواییـەکان کـەم تەرخـەمی کـرد و، بەپێی قەدەغە کراوەکانی نەڕۆیشت ئـەوە لـە سـنوری گوێڕایـەڵی دابـەزیوە نـەك سنووری بیرو بڕوا و، حوکمی سەرپێچی و تاوانباری بەسەردا دەدرێت.

لەم وتووێژەماندا کە دێ چەند لایەنەکی لقە ئاینیەکان و کرداەکانی و سەرجەم دروشمەکانی دەخەینە ڕوو، کە لەم ڕوانگەوە چـەمکی خـوا پەرسـتی و بەندایـەتی لێوە دەردەکەوێ وەکو ڕواڵەتەکی دەرەکی ئەم بیروبڕوایە، بە شێوەیێ کە لە واتـادا زۆر جیا نەبێ لەوەی کە لە ئیسلامدایە.

## یەکەم: پاکژی (الطهارة):

تەنها بەهۆی ئیمانەوەیە کە مرۆڤ ئەو پاکژیـە بەدەسـت دێنـێ و دەرونـی لـە چڵکی بێ باوەڕی و بت پەرستی و هاوبەشی پەیدا کردن بـۆ خـوا پـاك دەکاتـەوە، ئینجا دوابەدوای ئەو پاککردنەوەیەکیتر دێـت بـۆ پاڵفتـە کردنـی دەرون و لاشـە بەیەکەوە و، لەسەر ئاستی بەرپرسیاریەتی و پارێزگـاری لـەپاکی دەرون و هـەموو ئەو شتانەی کە تەڵخ و لێڵی دەکەن و ئەو خاوێنییـەش لـە نـاو چـەند ئـەرك پـێ سپاردنەکی ئاسایی دێت تـا بـڕوادار وەك خواپەرسـتییەکی پالاوتـە و بـێ گـەرد بەکاربێنێ، تا بەردەوام دەروون لەسەر پاکژی سەرەتایی بێنێتەوە و، وە تا بەو خوا پەرستییە پاکژە ژیانـەکی خـاوێنی بـێ گـەرد لـە خڵتـەی مـاددی و شـوێنەوارە زیانبەخشەکانی بە دەست بێنێ. وە پاکژی فەرز وەکو ئەرك و بەرپرسیاری دەبێ بە دوو بەشەوە: پاکژی لەش و، پاکژی دەروون:

### أ- پاکژی لەش:

پێویسـتە لەسـەر هـەموو موسـڵمانەکی زەردەشـتی ڕۆژی یـەك جـار بـە لای کەمەوەخۆی پاکـژ بکاتـەوە، ئەمـەش بـە شوشـتنی دەم و چـاو دەسـتەکانی، وە شوشتنی دەم و چاو و هەردوو دەستەکانیشی لە ئاستی خاوێن کردنـەوەی هـەموو

لەشدایە و پەیوەندی بە لەش پیسی و ئەو پیسیەوە نییە کە بە لەشەوە دەنوسێت، چونکە خوا بە دروشمێکی خوا پەرستی دادەنێ بە مەبەستی زیاتر خاوێن ڕاگرتنی ئەو ئەندامانەی زیاتر بەکار دێنرێن لەگەڵ بزوتنەوەی ژیاندا. وە ئاوی خاوێنی تێدا بەکار دێ بەو ئەندازەیەی ئەو کەسەی لە کاتی خۆشوشتنی واجبدا لێی دڵنیا دەبێت. وە ئەوەی واجبە و ئەرکە لەگەڵ شوشتنی لەشدا خاوێن بکرێتەوە کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە لەشەوە نییە جل و بەرگە کە پێویستە لە چڵك و پیسایی باش خاوێن بکرێتەوە و، پۆشینی جل و بەرگی پیس و گوێ نەدان بە خاوێنییەکی، یان پۆشینی جل و بەرگی شڕەکە و خراپ لەم ئاینەدا پەسەند نییە و، واجبە موسڵمان بەپێی توانا خۆی لێ بپارێزێت[1].

---

[1] پاکژی لەش لە ئیسلامدا بە نیوەی بڕوا دانراوە و، بەشداری کردووە لە عیبادەت و خوا پەرستییەکاندا وەکو دەست نوێژ گرتن و، پاکژ کردنەوەی لەش لە کاتی لەش پیسیدا و، پاکژ ڕاگرتنی لەش و جل و بەرگی لە پیسییەکان کە شەرع بە پیسی داناون. ئەوەتا قورئان دەفەرمێ: (فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ وَإِنْ كُنْتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا) المائده/٦.

واتە: دەم و چاو دەستەکانتان بشۆن تا ئانیشکەکانیش و، دەستی تەڕ بێنن بەسەر سەرتاندا، وە قاچەکانتان تا هەردوو گوێزنگەکان و، ئەگەر لەشتان پیس بوو خۆ پاکژ بکەنەوە. . . ).

وە پاکژی لەش و دڵی پێکەوە گرێداوە: (وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ(٤)وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ). المدثر. واتە: بەرگت خاوێن بکەوە و لە پیسی بت پەرستی دوور بکەوەوە. لە فەرموودەدا هاتووە: (الطهور شطر الايمان) رواه الحاكم ومسلم. واتە: پاکژی نیوەی بڕوایە.

وە لە فەرموودەدا هاتووە: (الطهارات أربع: قص الشارب، و حلق العانة، وتقليم الأظافر، والسواك). رواه الطبراني/ضعيف. واتە: (پاکژی چوار شتە: کورت کردنەوەی سمێڵ و، تاشینی مووەکانی دەوری عەورەت و، کورت کردنەوەی نینۆك و، سیواك).

(طيبوا ساحاتكم. . . )رواه الطيالسي/حسن. واتە: کۆڵان و شەقامەکانتان پاك بکەنەوە. (الغسل يوم الجمعة سنة) رواه الطبراني/صحيح. واتە: هەفتانە خۆشوشتن سوونەتە. (غسل يوم الجمعة واجب على كل محتلم) رواه الحاكم و النسائي/صحيح. واتە: خۆشوشتن هەینییەکان لەسەر بابای پێ گەیشتوو واجبە. (غسل الاناء وطهارة الفناء يورثان الغنى) رواه الخطيب/صحيح. واتە: شوشتنی قاپەکان و پاکژی وەسەرانگۆیلکەکانتان دەوڵەمەندی پەیدا دەکات.

لە ڕووی زانستییەوە پاك و خاوێنی تەندروستی بە لەش و دەروون و هێز دەکات و، مرۆڤ لە نەخۆشیە درونیەکان و نەخۆشیە درەمەکان پەنا دەدات، سەرباری بۆنی ناخۆش پرۆفیسۆر (کنیب) دەڵێ: (چارە کردن بە=

بەکار هێنانی ئاو بۆ لابردنی پیسیەکانی لەش و ئەوەی پەیوەندی پێوە هەیە و، ڕاستەوخۆ هێنانی وەکو توخمەکی سەرەکی بۆ ناو خوا پەرستی و دروشمە ئاینیەکان زەردەشتی وا لێ کرد ئامۆژگاری پەیڕەوانی بکات کە ڕێزی بگرن، وە پاکژی و پاراستنی لەشی بە خاوێنی و بێ گەردی فەرز کرد و، بەڵام ئەوەی ناتوانێ پاکژی بکاتەوە ناخرێتە ناو ئەمەوە.

دوای زەردەشت و پاش تێپەڕ بوونی زەمەنێك فارسەکان ئاویان زۆر بەگەورە دادەنا، تا گەیشتە ئاستی پیرۆز ڕاگرتن کە پیسایی و شتی قێزەونی بە ئاو لانەبری تەنیا بەو پاشەڕۆکانە نەبێ کە لە درەخت و ئاژەڵەکان دێنە دەرەوە و، ڕۆژانەش بۆ شوشتنی دەست دوای خواردن و، ئاو لە دەم و لووت وەرکردن بەکار نەیەت چونکە بەلایانەوە سوکایەتی کردنی تێدایە بە ئاوو، تەنیا لێویان پێتەڕ دەکرد[1].

= ئاو بەم چەشنەیە، لابردن و تواندنەوە و بەهێز کردن. دوپاتی دەکەینەوە ئاو توانای چارە کردنی هەموو نەخۆشیەکی هەیەکە شیاوی چاك بوونەوە دەبێ و، ئەگەر چاك ڕەچاو بکرێ هێرش دەکاتە سەر مەڵبەندی شەڕ و خراپە و، ئەمە ئاکامەکانیەتی: ١- میکرۆبەکان کە لە ناو خوێندایە دەتوێنێتەوە ٢- میکرۆب لە کۆئەندامەکە دوور دەخاتەوە. خوێن پاکژ دەکاتەوە و، ٣- لەشی لاواز و بێ تاقەت بەهێز و گورج دەکاتەوە بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی).

(کن طبیب نفسك/ترجمة: امیل خلیل بیرس/ دار الافاق الجدیدة/ ل: ٩٣). دکتور (عبدالحسین بیرم) لە (في صحة المجتمع)دا دەڵێ: (پاکژی دروستی بۆ تاك بەڵگەی خولیاییە بۆ ژیانەکی باشتر بۆ خۆپاراستن لە بەلاکانی نەخۆشیەکان و هۆکارە دەرونیەکان و، دیسان ئەمە زۆر لە چارە پزیشکیەکان باشترە). (ل/٢٠). (وەرگێڕ)

[1] بۆ زانین: پەرستنی ئاو بەر لە ئاینی ئیبراهیم و زەردەشت هەبووە لە دۆڵی دوو زێدا و، لای بابلیەکان ئاو بە خوا زانراوە کە ئەزەلی و ئەبەدییە و، دروست کەری ماددەیە و، میسریە کۆنەکان و، هیندیەکان هەمان بڕوایان هەبووە. وەکو لە کتێبی (الطبیعة في القران الکریم/د: کاصد یاسر الزیدي/ل: ٢٨)دا باس کراوە. وە هاتووە کە شاعیری بابلی دەڵێ: (کاتێ لە بەرزایی دا ئاسمان ئاوی نەبوو، لە نزماییدا زەوی ناوی نەبوو، کاتێ لەسەرەتادا جگە لە (ئابسو)ی باوکیان و دایکە (تیامە) نەبوو، کە هەموو ئەو شتانەی لێوە پەیدا بوون، هیچ ووشکانی و تەنکاوێ نەبوو ببینرێ هێشتا هیچ خوایەك پەیدا نەبوو بوو، وە ناویشیان نەهێنرا بوو، وە کارەکانیان نەنووسرا بوو، پاشان خواکان لە ناوەندی ئەودا پەیدا بوون).

تا شاعیرەکی تری بابلی بە فورات دەڵێ: (ئەی ڕووبار ئەی کردگاری هەموو شتێ).

بەم پێیە پیرۆز ڕاگرتن و بە خوازانینی ئاو لە فکرەی شارستانی کۆندا باو بووە و، لەمەوە هاتۆتە ناو نامە ئاسمانیەکانەوە. =

وە جگە لە شوشتنی لەش ئەوەی ئێمە پێمان زانی بێ شوشتنی لەش پیس بوون و دەست بە ئاو گەیاندن و شتی تر فەرز نەکراوە، بەڵکو پێویستە بابای زەردەشتی لە کاتێکدا لێ دەگەڕێ میز بەسەر ڕانەکانیدا بێتە خوارەوە تا دەگاتە جومگەی قاچەکانی و ئینجا هەندێ لە شوێنی میزەکە دور کەوێتەوە و، پاشان چەند نزایەك بخوێنێ لەو لەش پیس بوونە پاکژی دەکاتەوە، لە کاتی شەیتانی بونیشدا هەمان کار دەکات و ئەو نزایە دەبێ بخوێنێ بۆ پاکژ کردنەوە کە تایبەتە بە شەیتانی بونەوە و، لە هەموو حاڵەتەکاندا بەکارهێنانی ئاوی بۆ پاکژکردنەوە لەسەر نییە .

---

= هەرچی قورئانە دەفەرمێ: بوونەوەر لە دووکەڵ و گاز دروست بووە و ژیانیش لە ئاودا پەیدا بووە و، ئەمەش دەقی زانستی فیزیا و بیۆلۆجی و نوێیە. (ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ).

واتە: پاشان کاتێ خوا ویستی ئاسمان دروست بکات دوکەڵی بوو.

(أَوَلَمْ يَرَى الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلاَ يُؤْمِنُونَ). واتە: ئایا بێ باوەڕان نابینن کە ئاسمانەکان و زەوی یەك پارچە بوون و جیامان کردونەتەوە و، هەموو ژیانەکی زیندومان لە ئاو دروست کرد. وە لە زانایانی خۆرئاوا (کامۆ و تولمان درۆ بەرت دك) پەیان بەوە برد کە گەردوون سەرەتا وەکو تۆپەکی ئاگری گەورەی پڕ لە تیشك و ماددە دەستی پێ کردووە و، تەقیوەتەوە کە بە (تەقینەوەی گەورە - the big bangtheory) ناسراوە و بەسەدیی گازی و دوکەڵی ناوبراوە. وە بە پێی تیوری ئۆپارین (operin) یەکەم خانەی زیندوو لە ئاودا پەیدا بووە: (علم الفلك/ د: فياض النجم/ل: ٤٠٤و٤٢٣) سەیر بکە وە ئەم گەردوون و ژیانەش خوا دروستی کردووە نەك سروشت وەکو بت پەرستانی کۆن و ماددی یەکانی ئیمڕۆ بڕوایان وایە، وەکو (جون لکیفلاند کوثران/کیمیا زان و ماتماتیکی زان) لە (الله يتجلى في عصر العلم)دا دەڵێ: (ئەگەر دنیای ماددی نەتوانێ خۆی دروست بکات و یاسایەك دابنێ کە ملی بۆ کەچ بکات پێویستە ئەم خوا کردەیە بە دەستی کەسێکی نا ماددی دروست بوو بێ. هەموو بەڵگەکان ئەوە دەردەخەن کە کردگارەکە پێویستە هۆشیار و کارزان بێت). وە لە هەمان کتێبدا هاتووە ئەگەری دروست بونییەك گەردی پرۆتینی بۆ دروست کردنی خانەیەکی زیندو لە ڕێگەی ڕێکەوتەوە (١-١٠^١٦٠) ئەمەش بە خەملاندنی زانای سویسری تشارلز یوجینە. دیارە ئەمەش ئەگەر و ڕێتێ چوو نابێت. بۆیە دروست کردن و یاسا دانان بۆ ئەو خوایەیە کە لە نامە ئاسمانیەکاندا و، لە ناو دڵی ئێمەدا و، لە ناو سروشتدا خۆی بە ئێمە ناساندووە. دکتۆر (دواخات. کیش) لە کتێبی (هل تعرضت لغسل الدماغ)دا دەڵێ: (زانایانی پەرەسەندن وا دەبینن ژیان لە خانەیەکەوە وورده وورده گەشەی کردووە و، ئەویش لە خانەیەکی نا ماددیەوە. بەڵام زانایانی فکرەی دروست بوون دەڵێن: ئێمە و هەموو شێوەکانی دروست بوون لە ڕێگای کرداری دروست کەرەوە هاتوین). (وەرگێڕ)

وەکو شەریعەت پاکژ کردنەوەی لەشی واجب کردووە، کورت کردنـەوەی مـووی لەش و ڕیش و بڕینی نینۆکی وەکو پاکژی و خاوێنییەك واجب کردووە، وە واجـبی کردووە لەسەر هەموو موسڵمانێ ئەو قژ و مـوو نینۆکـە کراوانـە کۆبکاتـەوە بـۆ دەرەوەی ماڵیان ببات و چاڵەکیان بۆ هەڵکەنێ و بیخاتـە نـاوەوە و، بـە ئاشـکرا چەند ئایەت و پاڕانەوەیێ بخوێنێ کە سوپاس و ستایشی بۆ ئەو خوایە تێدایـە کـە ڕووەکەکانی مووی مرۆڤی دروست کردووە، پاشان دوعایەکی درێـژ دەخوێنـێ کـە داوا لە پەروەردگاری دەکات کە پاکژی بکاتەوە لە هەموو پیسییەك و دروسـتی و تەمەن درێژی پێ بدات و، کورت کردنەوەی مووەکانی و نینۆکەکانی بۆ بگۆڕی بە تیروکەوانەکی باڵدار لە دژی شەیتانەکانی دوژمنانی خوا و دوژمنانی بڕواداران.

هەر کەسێ مووی سەر و قژ و نینۆکی بخاتە سەر زەوی و گوێیان پێ نـەدات و بەم ڕەنگەی ئاین فەرمانی پێداوە پێوەی هەڵناستێ، بـێ گومـان لـەو کەسـانەیە چاودێری ڕێزی لەشی بڕواداری نەکردووە لـە کـاتی زیندوەتیـدا و، لـە ڕێـزی ئـەو کەسانە دادەنرێ کە شەریعەت بە سووك سەیر دەکەن و، هەر کار و شتێ دەیکـات سەرشۆڕییەکە کردەوەکانی شەیتانی تێدا بەرجەستە دەبێ و، کەس ئـەو غیرەتـەی نییە ئەو بیکات مەگەر کەسێك بێ ئاین و بێ شەریعەت بێت.

زەردەشتیەکان شوێن سوننەتی پێغەمبەرەکەیان کەوتن لە قـژ کـورت کردنـەوە و هێشتنەوەی ڕیش و هێشتنەوەی سمێڵ تا ئاینی ئیسلام سەری هەڵـداو، ئـەوان وایـان دەزانی کە کەم کردنەوەی ڕیش و هێشتنەوەی سمێڵ سیمای پیاوەتی پێوەیە کە مانای خۆراگری و قایمی دەگەیەنێ لە کاتی دژوارییەکان و ناخۆشییەکاندا، پێغەمبەریش لەو کاتەدا فەرمانی دا و فەرمووی: (بنەماڵەی کیسرا ڕیشیان دەتاشـی و سمێڵیـان درێـژ دەکرد، ئێمەی ئالی محمد سمێڵمان کورت دەکەینەوە ڕیش درێژ دەکـەین).، مەبەسـتی پێغەمبـەر (ﷺ) ئەوەیـە کـە زەردەشـتییەکان، سمێڵیـان کـورت دەکـرد و، ڕیـشیان دەهێشتەوە بەڵام نەك بۆ خوا پەرستی بەڵکو بۆ توندی و خۆ بە زل زانی و، سەرکەشی

و، هەرچی ئەوە فەرمانی کرد کە بە پێچەوانەی ئەوان بکەن کە ڕواڵەتی ملکەچی و خوا پەرستی بۆ خوای گەورەی تێدا دەربکەوێت.

لە ژیانیدا دەیگێڕێت و، قەدەغە کردنەکەش بە ڕاست و ڕەوانی لە ئاڤێستادا هاتووە، هەندێ لەوانەش کە باسیان دەکەین ئەمانەن: (خواردنەوەی شەڕاب و، خواردنی لاشەی مردار و، خواردنی هەر شتێ لە هەر کونەکی لەشی مرۆڤەوە بێتە دەرەوە، سوود و، زینا و دزی و، نێربازی و، درۆ و، خۆ کوشتن و شتی تر کە لێرەدا بە کورتی هەندێ لەوانە دەخەینە ڕوو:

## أ.زینا:

زینا لە شەریعەتی زەردەشتیدا هەمان ئەو پێناسەیەی هەیە کە لە ئیسلامدا بۆی کراوە کە بریتییە لە کرداری سێکسی لەگەڵ ئافرەتێکدا کە مارەبڕی شەرعی نەبێت، ئەو دەستەواژەیەی ئەو سنوور و پێناسەیەی دەخاتە هزرەوە ئەو دەقە سزایەیە کە خراوەتە سەر زینا و، لە وێدا هاتووە: (ئەگەر پیاوێ لای دایك و باوکی زینای لەگەڵ کچێکدا کرد، یان ئەگەر کچیش نەبێ و، سکی پڕ بێ یان نا و، بە شودار بێت یان بەشوو نەدرابێت....). لێرەدا کرداری سێکسی و جیماعی حەرام و ناڕەوای دیاری کردووە کە دەکەوێتە ناو ئەو بازنەیەوە و، جگە لەمەش لە ڕووی شەرعەوە ڕەوایە و، پەیوەستە بە ڕێساکانی شەریعەتەوە.

ئەو سزا توندوتیژە پیاو و ئافرەتی زیناکەر لە پیسی تاوانەکە پاکژ دەکاتەوە وە بریتییە لە (التمثیل) واتە: دەست بڕین و بە پەنگ کردن تا ببێ بە پەند و ئامۆژگاری بۆ خەڵکی تر.

لە کاتێکدا ئەو ئافرەتە مێردی کردبێ و، پیاوەکەش ژنی هاوردبێت. بۆ کەسانی تر سزاکە لێدانی داربووە و، غەرامە و پێ ژماردنیشی (٣٠٠) ئیستار[1] زیو بووە. لە چاخی ساسانیدا ئەم یاسایە شەرعەی ڕابردوی هەڵگرتەوە و، گۆڕا بە

[1] (استار) لە (مختار الصحاح)دا بە ٤. ٥ میسقال.

سزای لووت بڕینی هەردوو زیناکەرەکە و، نابێ ئەندامەکیان ببڕەڕێ کە لە تەواو هێزیان کەم بکاتەوە وەکو (تنسر) دەڵێ دەکرێن بە پەند بەڵام کار دەکەن و هێزی کارکردن یان هەیە لە ناو کۆمەڵگادا.[1]

## ب- دزی:

دز کەسێکە شتێ تاو دەداتێ کە هی خۆی نییە، یان هی کەسانی ترە و بە دزییەوە یان بە ئاشکرایی دەستی بەسەردا دەگرێ، وەکو ڕێگری و چەتەیی دەست بەسەرداگرتنی سامانیان بە بەهێز، بەڵکو کەسێ بە دز و تاڵانکار دادەنرێ کە (قەرزەکە ناداتەوە بە قەرز دەر لە کاتێ داواکردنەوەیدا).

سزای پاکژ کەرەوە بۆ دزی کردن یان بە پەنگ کردنی دزەیان دەست بڕینیەتی، ئەمەش بەپێی جۆری دزی و بڕی دزیەکەیە، پاشان لە سەردەمی ئەردەشێردا لە کاتی دوبارە کردنەوەی سزا خواییەکەدا ئەم سزایە گۆڕا بە برینداز کردن و، غەرامە و، بابای یاسا گۆڕەکە ئەم بیانو و پاساوانە دەهێنێتەوە بۆ گۆڕینی ئەم حوکمە خواییە: (کاتێ دەستی دزێ دەبڕین دادی کەس نادات بەڵکو کەم و کوڕیەکی دزێو ڕوو دەدات، بۆیە هەر کەسێ دزی بکات و سێ گەواهی دەری دادگەری لەسەر هەبێ یان خۆی دانی پێدا بێنێ حوکمی لووت بڕینی بۆ دەدرێ یان

---

[1] ئاشکرایە لە ئیسلامدا سزای پیاوو ئافرەتی زیناکەر ئەگەر خاوەن هاوسەر بن ڕەجم دەکرێن تا مردن و، ئەگەر بێ هاوسەر بن هەریەکەیان سەد داریان لێ دەدرێت. هۆی توندی سزاکەش دەگەڕێتەوە بۆ گەورەیی تاوانەکە و، کاریگەریە خراپەکەی بۆ سەر دەروون و، جەستە و، کۆمەڵگا و شارستانی و تێك دانی خێزان و وەچە. بۆ نموونە ئیمڕۆ بە هۆی بەرەڵایی سێکسییەوە هەر لە (١٩٨٠ز)وە تا ئێستا کە زیاتر لە (٢٠) ملیۆن کەس بە ئایدز مردووە و، (٤٠) ملیۆن کەسیش ئێستا تووشی ئەم ڤایرۆسە بووە و چاوەڕوانی مردنن. کەواتە: سزای خوایی بۆ نەهێشتنی ئەم جۆرە نەخۆشیانە و، دەیان نەخۆشی و تاوان کە خێزان و کۆمەڵگا بەرەو ڕمان دەبات و، زیناکەری لە پشتی پەیدا بونیانەوەیە. لە کتێبی (سێکس لە ژیانی هەموو کەسێکدا/ کە هێشتا چاپمان نەکردووە) بە تەسەلی ڕووغان کردۆتەوە. (وەرگێڕ)

لووت کون کردن و، بە ئەندازەی نرخی دزیەکە غەرامە دەکرێ و، هیچ ئەندامەکی لە لەش نابڕەرێ کە لە توانای ئەو کەم بکاتەوە و، ئاوەها نەنگی تـووش دەبـێ و، بەڵام کار دەکات و، هێزی کار کردنی لە دەست نەداوە).

ئەگەر دزەکە گەڕایەوە سەر تـاوان و، دزی کـردەوە و دوو شـاهیدی دادگـەری دەوێـت و نیـشانەی یەکـەمی شـوێنی شـاهیدەکەی تـر دەگرێتـەوە و، لـووت و گوێـچکەی لـە شـوێنەکی تـرەوە کـون دەکـرێن و، هـەمان غەرامـەی کـۆنی لێ دەسەنرێتەوە و، ئەگەر سێ کردەوە یەك شاهیدی بەسە و لـووت و گوێـچکەی لـە شوێنەکی تردا دەبڕێتەوە و، هەمان غەرامەی ڕابردوی لێ دەسەنرێتەوە و، ئەگـەر چوارەمجار دزی کـردەوە شـاهیدی نـاوێ و، دزەکـەی چـی بڵـێ ئەوەنـدە غەرامـە دەکرێت).بەڵام ڕێگر و چەتە (قاطع الطریـق) و، ئەو کەسـەی کاروانـچی یـەکان و گەشتیاران دەترسێنێ و، ئەو کەسەی بە زەبری چەك ماڵی خـەڵکی زەوت دەکـات ئەو خراپکارە لە زەویدا و، سزاکەی وەك خۆی ماوەتەوە لە شـەریعەتی زەردەشـتی کۆندا کە کوشتنە بە بێ بەزەییانەوە ئەنجا چوار هەندەی ئەوەندەی سـتاندویەتی و زەوتی کردووە غەرامە دەکرێت).

(تنسر) فەقیهی شـەریعەتی زەردەشـتی لـە ڕۆژانـی ئەردەشـێردا و، یـەکێ لـەو زانایانەی ڕێك خستن و ڕاست کردنەوە و ڕاڤەکەی پێ سپێرا بوو بۆ گونجانـدنی لەگـەڵ داخوازییەکانی ئەو کاتە هۆی ئەو گۆڕین و دەسکارییە ڕوون دەکاتەوە و دەڵێ:

(لەوانەیە سزادان بە لە سێدارە دان لە تاوانەکدا پێویست ببـێ کـە لێ بـووردین تێدا شایستە تر بێ، دیسان لەوانەیە لێ بـووردن لـە تاوانەکـدا پێویـست کـە لـە سێدارەدانی تێدا ئاشکرا ترە، لە کاتێدا بینیمـان سـتەمدیدەکان یاسـا و حـوکمی پێشینەکان دادیان نادات و، خەڵکی گشتی لە ژمارە و هێزدا تووشی کەم بوونەوە دەبن ئـەو حـوکم و یاسـایانەمان دانـا تـا لـە سـەردەمی ئێمـە و دوای خۆمـان پەیڕەویانی لێ بکرێ و، فەرمانمان بە قازییەکان کـرد ئەگـەر تاوانبـاران گەڕانـەوە

سەر تاوانەکانیان کە غەرامەیان دیاری کرا بوو دوای تـەمبنی کردنیـان پێویـستە گوێچکە و لوتیان ببڕن و دەست لە شوێنی تریان نەدرێت).

## ج- نێربازی:

نێربازی (اللواط) لە ئاڤێستادا بە (کارەکی چاپۆشی لێ نەکراو) وەسـف کـراوە و، لە شەریعەتدا لە ژێر کردارە لادەر و نائاساییەکان خانە کراوە و، هـەر کەسـێ نێربازی لەگەڵدا کرد ناوی بە شەیتانی ڕەجم کـراو و نـەفرین لێ کـراو هـاتووە و، خوای گەورە لە مەڕ ئەوانەوە بە زەردەشت دەفەرمێ:

(ئەی زەردەشت ئەوە ئەو پیاوەیە کە شەیتانە و، قوربانی پێشکەش بە شـەیتان دەکات و، ئەو پیاوە شەیتانی مێیەیە بـۆ شـەیتان و، ئـەو شـەیتانی نێرەیـە بـۆ شەیتان و، ئەو پیاوەیە ژنی شەیتانە و، ئەو پیاوەیە وەکو شەیتانە و خودی شەیتان خۆیەتی و، بەر لەوەی بمرێ ئەو شەیتانە و دوای مردن دەبێ بە شەیتانەکی نادیار، چ جای ئەوەی سالب بێ یان موجەب بێت).

لە شەریعەتەکەدا هیچ سزایەکی دیـاریکراو نییـە بـۆ بکـەر و لەگـەڵ کـراوی نێربازی واتە (موجەب و سالب) و، لە شەریعەتەکەدا تەنیا بە تاوانەکی چاوپۆشی لێ نەکراو دانراوە و، لەبەر دزێوی و خراپیەکەی بۆ دنیا و قیامەت وەکو شـەیتانی داناوە، واتە بکەرەکەی نەفرین لێ کراو و دەرکـراوە لـە ڕەحمـەتی خـوا و، پاشـان (هیچ غەرامەی لەسە نییە، وە نە کەفارەت و پاکژ کردنەوە)[1].

سەرباری ئەوەی ڕابرد شەریعەت زۆر شتی تری قەدەغە کردووە کـە بـە بـەلا و کارەساتی دەرون ناوە زەد کراون و پێویستە وازیان لێ بێنرێت وەکو خۆشەویـستی زۆری چێژەکانی و لە خۆبایی لە سنور بەدەر و، پێویستە مرۆڤ تا دەتوانێ خۆی لە

[1] نێربازی لە ئیسلامدا گوناهەکی گەورەیە و، خوای مەزن لە قورئانی مەزندا. . . . . .

بازارەکان دوور بگرێ و، وەکو شتەکی خراپ و سووک تەماشای بازاڕ بکات کە پاکژی دەرون خراپ دەکات و، گیانی پاکژ لێڵ دەکات، ئەمەش لەبەر ژاوەژاوو هەراو ناپاکی و، فێڵ و فریودان. زەردەشتییەکان بەر لە ئیسلام نەیان دەهێشت قوتابخانە لە تەك بازاڕدا دروست بکرێن، تا ئەو درۆ و فێڵ و دەلەسەی نەبێتەوە هۆی خراپ کردنی قوتابییان.

ئیسلامیش هەمان ڕوانینی بۆ بازاڕ هەیە، چونکە وەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمێ شەیتان ئالآیەکەی لە بازاردا دەچەقێنێت، هەوڵ دەدات خراپە لە نێوان مرۆڤدا بڵاو بکاتەوە لە کڕین و فرۆشتن و بژێوییاندا.

## دووەم: خودا پەرستی:

### أ- نوێژ:

نوێژ لە ئاینی زەردەشتیدا وەك هەر نامەیەکی تری ئاسمانی پاڕانەوە و تەسبیحات و داوا کردنی لێ بوردن و، سوپاس و ستایش و بەرز ڕاگرتنی خوایە و، لە زەردەشتیدا نوێژ بەم چەمکەوە بەشێ لە خواپەرستی بڕوادار پێك دێنێ و، وەك باوە دەکەوێتە سەرووی خواپەرستیەکانی ترەوە بۆیە بە واجبەکی فەڕزی کردویە بە ئەرك و، بە شێوەیێ سستی و خاوی لە نوێژ کردندا، یان نەکردنی بە ئەنقەست لە بازنەی بڕواوە دەڕواتە بۆ کوفرەکی ڕووت.

لە شەریعەتی زەردەشتیدا فەرمان بە پێنج نوێژ کراوە لە شەو ڕۆژێکدا و، کاتی کردنی هەریەکێ لەوانەش بە جووڵە خۆرەوە بەستراوەتەوە لە سوڕی ڕۆژانەیدا. یەکەمیان دەکەوێتە کەمێك بەر لە بەرەبەیان و، دووەم نیوەڕۆ و، سێیەم بەر لە خۆرئاوا بوون و، چوارەم کاتی خۆرئاوا بوون و، پێنجەم لە شەودا.ئەم پێنج نوێژە

لە زەردەشتی بە (guhs) ناودەبرێت [1] بەڵام لە زستاندا بۆ چوار نوێژ کەم دەبنــەوە و، لە هاویندا وەك خۆیان دەمێننەوە و، هەر نوێژەش لــە ئاڤێــستادا نــاوی خــۆی هەیە و، کاتی خۆی هەیە و، کەم و زۆری ئەم نوێژە بەپێی جــۆری نوێژەکەیــە بــەم جۆرەیەی خوارەوە:

١- نوێژی ئوشاهینا (ushahina) لە نیوەی شەوەوە تا وون بوونی ئەستێرەکان لە ئاسماندایە.

٢- نوێژی هاڤانی (havany) لە خۆرهەڵاتنەوەیە تا نیوەڕۆ.

٣- نوێژی ڕاپیسوینا rapithwina لە نیوەڕۆوەیە هەتا دەرکەوتنی سورایی ئاسـۆ لە کاتی خۆرئاوا بووندا.

٤- نوێژی یوزایرینا (uzererna) لە سەرەتای پەیدا بوونی سورایی ئاسۆی کـاتی خۆر ئاوا بوونە تا دەرکەوتنی ئەستێرەکان لە ئاسماندا.

٥- نوێــژی ئیــوین ســرۆثریمــا (aiwinsruthrema) لــە کــاتی دەرکــەوتنی ئەستێرەکانەوەیە لە ئاسماندا تا نیوە شەو.

ئەو نوێژەی لە هەمووان گرنگترە و، ڕیز و پیرۆزییەکی تایبەتی جیای پێ دراوە نوێژی بەیانییە کە پێویستە هەموو بڕواداریَ بەم نوێژە ڕۆژەکەی دەست پێ بکـات و، لە گەڵ یەکەم دەنگی کەڵەشێر (کەڵەباب)دا لە خەو هەڵسێ و، کە باڵندەیەکـە فریشتەکان خەبەری دەکەنەوە بۆ هۆشیاری دان بە بڕواداران بۆ هاتنی کـاتی نوێـژ و، بانگی کەڵەشێر وەکو لە ئاڤێستادا هاتووە بە بڕواداران دەڵـێ: (هەڵـسن ئـەی خەڵکینە، سوپاس و ستایشی خوا بکەن و، نـەفرەت لـە شـەیتان بکـەن، ئـەوەتا پوشیانسا (pushyahsa) (شەیتانی خــەوتنی تەمبــەڵی) بــە دەســتە درێــژەکانی دەکەوێتە سەرتان و دەیەوێ بتانگێڕێتەوە بۆ نوێژ و لــە نوێــژتان دوور بخاتــەوە و،

[1] ووشەی (guhs - گوش) لە (نوێژ) نزیکە. کورد بەر لە ئیسلام نوێژ و ڕۆژوی هەبووە و، بەو نـاوی بردوون و، ئەگەر وا نەبوایە ووشەی (صلاة) و (الصیام)ی لەم ڕۆژگارەدا بەکار دەهێنا. (وەرگێڕ)

بلێ: بنو ئەی مرۆڤ هێشتا کاتی نوێژ نەهاتووە، کێ یەکەمجار هەڵسێ دەیدا بە پانایی دیواردا بە قسەکەیەوە و، ئەو سەرکەوتووە.

بەر لە چوونە ناو هەر پێنج نوێژێکی لەو نوێژانە پێویستە زەردەشتی خۆی بۆ ئامادە و ساز بکات.ئەمەش بە شوشتنی دەم و چاوو دەست و قاچەکانی ئەوەندەی کە تۆز و خۆڵی لێ نیشتووە، نوێژ بە تاڵ دەکاتەوە و، نوێژکەر ئەو پاکژییەی لە دەست داوە کە دروشمەکانی داخوازی دەکەن. پاشان ئەرکە لەسەر شانی ڕوو لە خۆر بکات ڕوگەی ئاین و، لەبەردەم خوادا بەوپەڕی گەردەن کەچی و بە گەورە دانان ڕادەوەستێ و بە تەواوی لە خوێندنەوەی ئایەت و پاڕانەوەکاندا قوڵ بۆتەوە.

هەر نوێژە پاڕانەوەی خۆی هەیە و ئەو نوێژکەرەی مۆرکی پەرستنی خوای گەورە زاڵە بەسەریدا دەیخوێنێتەوە، کە واتای مل کەچی و، بە گەورە دانان و، سوپاس و ستایشیان تێدا دەردەکەوێ، هەم پیاهەڵدان و مەدح بەهەر ووشە و واژەیێ کە جوان و بەڕێز بێت و، پشت پێ بەستن و، کوڕوزانەوە و، داواکردنی یارمەتییان تێدا دەردەکەوێت و، زۆر واتای تریش کە مرۆڤ شایانی ئەوە دەبێ کە بە هۆی ئەوانەوە ناوی بەندە وەربگرێت.

وە لێرەدا پاڕانەوەی تایبەتی هەیە بڕوادار لە نوێژ و دەرەوەی نوێژدا دەیخوێنێ داوا لە پەروەردگاری دەکات دڵی پاکژ بکاتەوە لە کینە و ئیرەیی و پیسی و ترس. وە شەیتانەکان و دوژمنانی ئاین لە ناو ببات و خوا پیت و فەڕ بخاتە ڕۆزی و بژێوییەوە و، خێزانەکەی بپارێزێ و، وڵاتی لە جەنگی دوژمنان چەپاڵە بدات و، بە خێر و چاکە هەموو وڵاتی موسڵمانان پڕ بکات و، زۆر شتی تریش کە لە پەڕەکانی ئەلیسنا و ئەلیشتادا بڵاو کراوەتەوە.

بۆ کردنی نوێژدا هیچ شوێنەکی تایبەتی نەکراوە بە مەرج و، بڕواداران بۆیان هەیە لە پەرستگاکان و، ماڵەکانیاندا و، شوێنەکانی کۆبونەوەیاندا نوێژیان بکەن، ئەو نوێژەی لە پەرستگادا دەکرێ بە زۆری خەڵکی جل و بەرگی سپی پاکی بۆ

دەپۆشێ و، زۆربەی جار پیاوانی ئاینی و زاناکان وتار بە دوای ئەمەدا دەخوێنن و کە بە زۆری باسی مەشخەڵەکانی ئاین و بیرهێنانەوەی دوا ڕۆژ و، چارە کردنی کێشەی ڕۆژانەیە.

لەگەڵ پێنج نوێژە دیاری کراوەکان و کاتەکەیان لە شەو و ڕۆژێکدا نوێژی تریش هەیە شێوەی کۆمەلایەتی و ئاشکرایی وەردەگرن کە تایبەتن بە جەژنەکانی ئاینییەوە کە لە وەرزەکانی ساڵدا بەڕێوە دەچن وەك جەژنی نەورۆز و، هەندێ نوێژی تر هەیە وەك نوێژی (الحاجة) و (الاستخارة) و (الاستغاثة) و کە پەیوەندییان بە هیچ بۆنەیەکەوە نییە و، لە ناو ئەو نوێژانەدا خەڵکی بە کۆمەڵ دەست بەتاڵ دەبن بۆ خوا کە ئەو تەنگژە و ناخۆشیەی دوچاری هاتون لە سەریان لاببات و، ئەو نوێژانەش لە نوێژی ئاسایی جیاواز نین تەنیا لە بوونی پەیوەندییان نەبێ بەو هەل و مەرجەوە کە تێیاندا دەکرێ و، بەپێی تایبەتمەندی نوێژەکان نزای تایبەتیان تێدا دەگوترێت.

جگە لە کاتەکانی ئاساییدا زەردەشتییەکان نزای تریان داناوە کە نازمێردرێن و، شێوازی جیاجیان هەیە و، هەریەکەیان لە هەموو بۆنەکانی ڕۆژانەیاندا دەیانخوێنن، دەتوانێ لە کاتی چوون بۆ سەر ئیش و کارەکەی هەموو بەیانیەك نزا لە پەروەردگاری بکات و، یان کە دەچێتە سەر پێشاو و، دوای کردنی نینۆك و کورت کردنەوەی موەکانی، پێش و دوای نان خواردن و بەر لە چوونە سەر جێگا لە شەودا بۆ نوستن.

سەرباری ئەوەش دوعای تایبەتی بۆ یاخییەکان و سەرپێچی کاران دانراوە، وە بۆ هەر لادەر و، گومڕایەك، دەتوانێ دوای نوێژیان لە ناو نوێژا بیانخوێنێتەوە، ئەم نزایەی باسی دەکەین لە ئەلیسنادا یەکێکە لە دوعایە زۆرەکانی تایبەت بە گوناهباران.

ئەی پەروەردگاری بەدیهێنەری بەبەزەیی لێ بووردە تکام وایە لە تۆ لێم خۆش بی لە گوناهەکانم و، ئەوەی لە هزرمدایە لە بیری خراپ و، ئەو قسە خراپانەی کە دەیڵێم و، یان ئەو کارە خراپانەی دەیکەم، خوایە من پەنا بۆ تۆ دێنم من و گوناهم لە یەکتر دوربخەیەوە، تا لە دوا ڕۆژدا لەگەڵ چاکەکاراندا زیندوو بکرێمەوە).

دوعایەکی تری زەردەشتییەکان کە لای عەرەبەکان بەناوبانگ بووە بەر لە ئیسلامدا پاڕانەوەی خواردن بووە کە خوێندنی چەند ئایەتەکی ئاڤێستا بووە لە پێش خواردندا بە دەنگەکی شاراوە و ورتە کە بە شێوەیێ لێی حالّی نابیت، لەم نزایە پیرۆز پیرۆز ڕاگرتنی خواردن و شوکرانەی خوای گەورەی تێدایە بۆ ئەو بەهرەی پێی بەخشیون، وە لە کاتی خواردندا هەر تێیان ناگەیت و ئاماژە دەکەن و هەرگیز قسە ناکەن عەرەب ئەمە بە (الزمزمة - گرمە گرمە) ناوی دەبەن. عومەری خەتتاب (ﷺ) ئەمەی قەدەغە کرد لە کاتی خواردندا گرمە و ورتە بکرێ، یان ئاماژە بە گنی ورتە ورت بگرێ، یان بەر لە خواردندا، چونکە ئەم گرمەیە لای مەجوس وەکو عیبادەتی لێ هاتبوو بۆیان، بوبو بە ئەدگارێ بۆیان، خەلیفە ویستی ئەم وێکچوونە نەهێڵێت.

بە درێژایی ڕۆژگار وای لێ هات دیاردەی خوێندنی پاڕانەوە بە وورتە وورت هەموو خواپەرستی زەردەشتییەکانی گرتەوە و، زەردەشتی هیندی ئیمرۆ نوێژەکانیان ڕۆژانە - وەکو نزیکەکانی خۆیان ناویانداوە - بە لێوی داخراو دەخوێنن. ئەوانە دەنگیان کە بێت بە ووشە و قسە نییە و ئاشکرا بێ و، تێی بگەیت و، بڕوایان وایە خودا بەهۆی فریشتەی سروش srosh بۆی داناون.

## ب: ڕۆژو:

ڕۆژوش وەك نوێژ لەو عیبادەتەیانەیە خوا لەسەر بەندەکانی فەرزی کردووە و، کردوویە بەپایەیێك ئاین بە بێ‌ی ئەودا دانامەزرێ و، هیچ شەریعەتێ بێ ڕۆژو نییە، چونکە سودی گیانی و دەرونی تێدایە و، تام و چێژەکی گیانی هەڵگرتووە کە تەنیا بڕواداران پەی پێ دەبەن. خوای گەورە فەرمویەتی: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ). واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ڕۆژوتان لەسەر فەرز کراوە وەکو چۆن لەسەر خەڵکانی بەر لە ئێوە فەرز کرا بوو، شایەد خۆپارێزی بکەن.

ڕۆژو گرتن بەپێی گێڕانەوەی مێژوونووسان لە ناو زەردەشتیەکاندا وەك عیبادەت و خواپەرستییەکی واجب هەبووە، هیرودوتس ڕۆژانی خۆی لەسەردەمی زەردەشتییەتدا دەگێڕێتەوە: (خویان وابوو دوای ڕۆژووی زۆر یادەوەرییان دەکرد لەمەڕ کاری گرنگدا و، سپەی ئەو خاوەن مالەی یادەوەریەکەی لە مالەکەیدا کرابوو دەهات بڕیار بە دەست ئەو بوو، ئەنجا بە زمانی بەڕۆژووەوە دەچونەوە و، ئەگەر بڕیاری دابایە بەو پایە ئەنجام دەدرا، ئەگەر نا نەدەکرا).

مەجوسی کۆن وەکو لە (دائرة المعارف البريطانية) دا باسکراوە بێ ڕۆژو گرتن و هاندان بۆ ڕۆژو نەبووە ئەگەر بۆ چینەکی کۆمەلگاش بوو بێت، جختی لەسەر ئەوە کردووە کە ڕۆژوی پێنج سالآنە لەسەر سەرۆکانی ئاینی فەرزەکی باو بووە.

لە نووسراوی ئاڤێستای ئیمرۆی زەردەشتییەکاندا کە کاری پێ دەکەن ڕۆژو بە تەواوی نارەوا کراوە و، هەر کەسێ بەڕۆژو بێ پێچەوانەی فەرمانی خواییە و دەکەوێتە ژێر ڕکێفی تاوانەوە و، کێ تاوانی کرد دەبێ کەفارەت بدات بە خۆراك دان بە کۆمەلێ لە هەژاران، ئەگەر لەسەر ڕۆژو سوور بێ لە دوا ڕۆژدا بە توندترین ئەو سزایەی لە دنیادا زانراوە لە بواری سزای شەرعیدا ئازاری دەدرێ، لە (ڤەندیدات)دا هاتووە:

(ئەو پیاوەی خۆی تێر دەکات فاهۆمانۆ (جبريل) لەو نزیکترە نەك لە برسی چونکە ئەو بە توندی لەگەڵ ئەستاڤیخوتس astavidhotus دەجەنگێ کە شەیتانی پیسی مردنە و، هیچ ناخوا و، بەرهەلستی زستانی سەخت دەدات و تەنکترین پۆشتە دەکاتە بەر و، لەگەڵ ئەئیمواتو شەڕ دەکات و بەرگری دەکات کە بێ بڕوایە و فەرمان بە ڕۆژو دەکات.

هەر کەسێ بۆ یەکەمجار ئەم گوناهە بکات دەبێ کەفارەت بدات و، جاری دووەم دەبێ بە توندترین سزای دنیا سزا بدرێ وەکو بڕینی ئەندامەکانی ئەندام ئەندام یان بەستنەوەی ئەندامەکانی بە زنجیری مسی زەرد، یان دەبێ ناچار بکرێ خۆی لە شوێنەکی بەرز هەلداتە خوارەوە، یان دەبێ ئەوەندەی لێ بدرێ نەتوانێ هەلسێتەوە سەر پێیان).

ئەوەی حەرامە لە ئاینی زەردەشتیدا وەك بۆمان دەردەکەوێ ڕۆژو نییە بەڵکو ئەو زوهد و دنیا نەویستە بێ سنورە و، خۆ گرتنەوەیەیە لە سادەترین پێویستییەکانی ژیان، کە دەبێتە هۆی کز و لاوازی لەش و ڕووخانی ورە و ویست و، ئازاردان و ئەشکەنجەدانی لەش و دەرون بە سزایەکی بێ مانا و بێ سوود، کە هێزی موسڵمان بۆ کار و خواپەرستی پەك دەخات، کە هەردووکیان مەبەستی ژیانی مرۆڤن لە زەویدا.

کاتێ زەردەشتییەکان ویستیان لە چاخی ساسانیدا ئاین نوێ بکەنەوە و، ئەم واتایانەیان لەمەڕ فەرزییەتی ڕۆژووەوە لێ شێواو تێیدا کەوتنە گومانەوە بۆیە بە یەکالا کراوەیی حەرامیان کرد.و، هەر شتێ کە پەیوەندیشی پێوە هەبێ حەرامیان کرد و، پاشان سەیری پاشماوەی تری سروشی خوایان کرد لە ژیانیاندا بینیان ڕۆژو لەگەڵ نوێژدا لەسەرەوەی خواپەرستییەکانی تر دەوەستێ.

بۆیە لەو دیاردەیەی ڕۆژویان ڕووت کردەوە کە لە بنەڕەتدا حەرامە وەکو برسیەتی توند و، دنیا نەویستی بێ سنوور و، خۆ دور گرتن لە چێژەکانی دنیا و، لەسەر ناوەڕۆکەکەی مانەوە وەك خۆر دور گرتن لە بێ سنوری کردارەکە ووتیان: (ئەو ڕۆژوەی بڕوا هانی بدات ڕۆژوەکی گوناهە). واتە: خۆ گرتنەوەیە لە هەڵە بە چاو و زمان و دەست و قاچە[1].

---

[1] لە فەرموودەکانی (متفق علیە)دا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی زانی کە (ابن عمر) هەموو ڕۆژێ بە ڕۆژوە و، شەویش بە نوێژ دەباتە سەر، پێغەمبەر (ﷺ) پێی دەفەرمێ: (الم اخبر انك تصوم ولا تفطر وتصلي، فصم وافطر، وقم ونم، فان لعينيك عليك حظا، وان لنفسك عليك واهلك عليك حظا).

ئەی بۆیان باس نەکردوم کە تۆ بە ڕۆژو دەبی و نێوانیان نادەیتێ و نوێژ دەکەیت، تۆ بەڕۆژو بەو بیشکێنە و، شەو نوێژ بکە و بنو، چاوەکانت مافیان بەسەرتەوە هەیە و، خۆشت و خێزانیشت حەقیان بەسەرتەوە هەیە.

لێرەدا پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژوی بەردەوام مەنع دەکات و دەفەرمێ: (لا صام من صام الابد) متفق علیە. وە نووستن و خۆ دور گرتن لە خواردن و سێکس بە تەواوی قەدەغە دەکات. (وەرگێڕ)

## ج: (زەکات)

زەکات بە ڕێژەی ۳/۱ لە سامان و ئاژەڵ و ڕووەك و بەهرەکانی تـر وەردەگـیرێ لە دەوڵەمەندان و سەرمایەداران کە خوداوەنـدی گـەورە داویـە بـە بەنـدەکانی و، پاشان بەسەر هەژاران و گەدایاندا لـە کـوڕانی وڵاتـدا دابـەش دەکـرێ و، ئـەوەی دەمێنێتەوە بۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی و چاك کردنی پردەکـان و جۆمـاڵ کـردن و پاك کردنەوەی ڕووبارەکان خەرج دەکرا. وە خوای گەورە هەر کەسێ زەکات نـەدات و، هەر کەسێ لە کاتی دەوڵەمەندیدا سامان نەبەخشێ هەڕەشەی لێ کـردووە کـە لە دنیادا سەرشۆڕی دەکات و، بەرەو چاڵی هەژاری و نەبوونی دەبـات و، نـەفرینی سەرشۆڕی و نەداری بەسەردا دەڕێژێ و، لـە هـەموو لایەکـەوە تووشـی سـوکی و ڕیسوایی دەبێت. وە هەر کەسێ کۆمەکی و هاریکاری هەژار و کلۆڵ و نەدار بکات ئەوە بەشدارییەکی بنیات نەر دەکات لە دامەزراندنی مەملەکەتی خوادا لە زەویدا و، خۆشنودی و باشتی باشی ئەو بە دەست دێنێ، بەڵام کێ زەکـات نـەدات ئـەوە یارمەتی شەیتان دەدات یارمەتی دەدات لە بنیاتنانی دەوڵەتی بەتاڵدا لە زەویـدا، ئەمەش لە ناو ئەو وتووێژەدا هاتووە لە ئاڤێستادا لـە نێـوان مـەلاکی خـوایی و مێیە شەیتانە کراو، مەلاکی خوا پێی دەفەرمێ: (ئەی خراپکاری بێ خێـر کێیـە یەکەم نێرینەت؟ وەڵامی دایەوە: ئەی فریشتەی پاکـژ و بـە ژن درێـژ و ڕوو جـوان یەکەم نێرینەی من کەسێکە ئەگەر کەسـێ برایـەکی بـڕواداری داوای شـتەکی لێ دەکات و ئەویش پێی نابەخشێ، ئەگەر شتەکی کەمیش بێ لـەو سـامانەی کـۆی کردۆتەوە، ئەو نێرینەیە سکم پڕ دەکات و، هەم تەواوی مێیەکانی تر بە تۆو دانان لە ناویاندا دوو گیان دەکات. فریشتەی خوا پرسیاری لە مێیە شەیتانەکە کرد چۆن ئەمە بە تاڵی دەکاتەوە ئەوەیە کە مرۆڤی بڕوادار خێـر و پیـاوەتی بکـات ئەگـەر کەمیش بێ لەوماڵەی کـۆی کردۆتـەوە بـێ ئـەوەی داوای لێ بکـرێ، بـەوە دوو گیانیەکە بە تاڵ دەبێتەوە لە ڕابردوودا دانی زەکات و خێر هیچ ڕواڵەتەکی لەگەڵدا نەبوو جوانی خواپەرستی خراپ و دزێو بکات و، یان شکۆی فەرێزەکـە بـشێوێنێ،

لە کاتێکدا ئاینەکە شێواو تێك و پێك چوو لایدا و لە دڵی خەڵکدا کز بوو، نەریتی ئاڵۆز و بت پەرستی دزێوی هاتە ناو کە بە نەریتی دیاری (الطقوس التقدمة) ناسراوە و، ئاگری تێدا هەڵدەکرێ و، پیاوی ئاینی (الموابذة) بەرگی تایبەتی دەپۆشێ و، زەکات بە هەژار و گەدایە ئامادە بوەکان دەدرێ، دوای ئەو پێشکەش کردنە پێویستە لەسەر پیاوە ئاینەکان ئەو جل و بەرگ و شتومەکانەی بەشداری یان کردووە لە ئەنجامدانی فەرێزەکەدا پیان پارێزێت[1].

بەڵام لە حاڵەتی قوربانیدا[2] و بابای زەردەشتی ئاژەڵەکە دەباتە شوێنەکی پاکژ و سەری بەکڵاوەکی دەورە دراو بە بۆن و بەرامە دادەپۆشرێ و، داوا لە خوا دەکرێ بۆ ئاوەدان کردنەوەی وڵات و سەرکەوتنی کوڕانی و کوڕانی برایانی لە ئایندا، لە کاتێکدا ئاژەڵەکە دەکوژرێتەوە گۆشتەکەی لەسەر ئاگر دەکولێنرێ پوش و گیای تەڕ دێنرێ لەسەر زەوی ڕیز دەکرێ و بەڕیز گۆشتی لەسەردا دەنرێ، ئەو کاتە پێویستە یەکێ لە زەردەشتییەکان یان کەسێکی تری جگە لەو لەوێ ئامادە بێ بۆ خوێندنی سرود و ئاوازەکی تایبەتی بە کارە پیرۆزەکان و، پاش ماوەیەیێ گۆشتە هەڵدەگرێ و چۆنی بوێ مامەڵەی تێدا دەکات.

---

[1] زەکات لە ئیسلامدا یەکێکە لە ڕوکنەکانی ئیسلام و، لەسەر دەوڵەمەندان فەرزە کە بە سەر هەشت چینی خەڵکدا دابەشی بکەن وەکو لە قورئان دا هاتووە لەوانەش هەژاران و گەدایان و، ڕێبواران و قەرزداران. (إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ.... ).

[2] لێرەدا نووسەر ئاماژەی بە حەج نەکردووە ئایا زەردەشتییەکان کردوویانەیان نە؟ بۆیە بە پێویستمان زانی ئاماژەیێ بەمە بکەین. ئەگەر سەیری کتێبی (تأريخ الكعبة: د: علي حسني الخربوطلي: دار الجيل/بيروت/ط٢/١٩٨٧/ل: ٢٦) لەوێدا باسەکی نوسیووە بە ناوی (پیرۆز ڕاگرتنی کەعبە لە لایەن عەرەب و هیند و فارس و صابئییەوە). لەوێدا بۆ نموونە ئاماژە دەکات کە فورسەکان (کە مەبەست پێی لە زەردەشتییەکانە) مەسعودی مێژونوس باسی کردووە کە بڕوایان وایە ئەوان ڕۆڵەی ئیبراهیم خەلیل (ع) و پێشینەکانیان چوون بۆ حەج و تەوافی کەعبە بۆ ڕێزیان و شکۆ ڕاگرتنی ئیبراهیمی باپیرەیان، دوا کەسیان کە حەجی کردووە ساسانی کوڕی بابك بووە). (وەرگێڕ)

**د: (کردەوە):**

شەریعەتی زەردەشتی لە دوو گۆشەوە سەیری کرداری کردووە:

**گۆشەی یەکەمی:** عیبادەتێکە و کردویە بە ڕێگایەکی نزیک خەرەوە لە خودای گەورە و نموونەی باڵا بۆ بە دەست هێنانی ڕەزای ئەو و، بە دەست هێنانی پاداشتی ئەو لە قیامەتدا، لەسەر ئەمە شەریعەت وای لە ئەنجامدانی کاری بڕوادار کرد کە بە دڵسۆزی ئیخلاسەوە بکرێ، وە بە چالاکی و زیندەگی ڕواڵەتی یەوە ئەرکی بۆ پەروەردگاری ڕاپەڕێنێت.

**گۆشەی دووەم:** لەو ڕووەوە کە چارەسەرێکی سەرکەوتووە بۆ دەرونی و ڕەوان و کردویەتی بە باشترین هۆ بۆ خاوێن کردنەوەی دەرون و بەرز کردنەوەی لە پلەکانی (المدارج) کە ماڵدا و، پاکژ کردنەوەی لە پۆخڵەواتی سواڵ و داواکاری و بە کۆیلە کردنی کەسانی تر بۆی بە چاکە.

لەو کۆمەڵە کردارانەی بڕوادار ئەنجامی دەدات بۆ دەستەبەرکردنی ئەم مەبەستانە کردنی کشتوکاڵە کە پلەی یەکەمی گرت و، ئاین هانی دەدا بۆ کردنی و، لە باشترین کردەوە و خۆشەویسترین کاری داناوە لە لای خوای گەورە. بەڵکو کشتوکاڵ و کشتیاری زەوی و لێ بڕان بۆ چاك کردنی بڕوادار پتر لە لە نوێژ و ڕۆژو و زەکاتی و خواپەرستییەکانی تری لە پەروەردگاری نزیك دەخاتەوە.

لەبەر ئەم هۆیە خوای گەورە سەرنجمان بۆ چوار جێگا ڕادەکێشێ کە ڕێز لێنان و بەهەند وەرگرتنی پێویستە و بەکارهێنانی زەوی بۆ کار بە تەنیا نیوەی هەیە کە ئەمانەن:

١- پەرستگا یان شوێنی خواپەرستی.

٢- جێگا و شوێنی خێزان و منداڵ و ئاژەڵ.

٣- ئەو خاکەی دانەوێڵە و میوە دەڕوێنێت.

٤- ئەو خاکە ووشکەی پێویستە ئاودێر بکرێ و، ئەو گۆم و زەلکاوەی پێویستە لە ئاوە بۆنگەنەکەی خاوێن بکرێتەوە و پاشان بکێڵرێ و بچێنرێت[1].

لێرەدا خوای گەورە لەمەڕ ڕێک خستنی خاک و چاودێری کردنی دا لەگەڵ زەردەشت دواوە و پێی فەرمووە:

[1] ئەم دەقانەی ئاڤێستا و، ئەو دەقانەی لە قورئاندا هاتوون لەمەڕ مەزهەبی ئابورییەوە ئەوە دەسەلمێنێ کە ئاینە ئاسمانیەکان بە تەنیا پەیامەکی گیانی و ڕەوشتی نین، بەلکو پەیامەکی سیاسی و ئابوری و، کۆمەلایەتیشن ئابوری لە ئیسلامدا پێداویستییەکی ژیانە و، شادەماری ژیانە لە جیهاندا و، ڕێنوێنی سەرەکی سیاسەی ناوخۆ و دەرەکییە و، جێگای بایەخی خێزانییە لەسەر زەوی. چاوگی هەموو کێشە کۆمەلایەتی و سیاسییەکانی جیهان لە دوو خاڵی سەرەکیدا خۆی دەبینێتەوە، کە کێشەی ئایدەلۆژیا و کێشەی ئابوریە و، بە چارەکردنی ئەم دوو کێشانە تەواوی کێشەکانی تر بۆ خۆیان دەپوکێنەوە و، کۆتایی بە خراپە و داگیر کردن و، چینایەتی و هەژاری دێت لە جیهاندا و، پلانی توکمە کراویش بۆ هێنانە دی ئەم مەبەستە لە قورئاندایە. وە قورئان ڕێبازی ئابوریەکەی لەسەر سەرمایەداری دانەمەزراوە و، وە نە لە سەر سۆسیالیزم دامەزراوە، بەلکو ڕێبازەکی سەربەخۆی هەیە. بۆ نموونە ڕژێمی سەرمایەداری رژێمە ئابوریەکەی لەسەر ستەمکاری ئابوری دامەزراوە و، بڕوای بە خاوەندارێتی تایبەتی بێ سنور و، بازاڕی ئازادی بێ سنور، سود و، داکرتن و پاوانکردن (الاحتکار) و، کڕین و فرۆشتنی شتە حەرامەکان هەیە وەك فرۆشتنی جگەرە و مادده سەرخۆشکەرەکان و، سێکس فرۆشی و هتد کە لە ئیسلامدا ئەمانە و زۆر شتی تریش حەرامن. لە هەمان کاتدا بڕوای بە ڕژێمی ئابوری سۆسیالیزمی نییە کە لەسەر خاوەندارێتی گشتی دامەزراوە. بەلکو ئیسلام بڕوای بە خاوەندارێتی تایبەتی سنوردار و، خاوەندارێتی هاوبەشی سنوردار و، خاوەندارێتی دەوڵەتی سنوردار هەیە. ئەمەش پەرچی نوسراوەکەی (مەکسیم رودنسون) دەداتەوە کە کتێبەکی نوسیوە بە ناوی (الاسلام والراسمالیە/ت: نزیە الحکیم) لەوێدا بانگێشە بۆ دنیای ئیسلامی دەکات دەست بە ڕێبازی سۆسیالیزمەوە بگرن کە لە گەڵ ئیسلامدا جیاوازی نییە. ئێمە ناتوانین بلێین خاڵی هاوبەشمان نییە لەگەڵ مەزهەبی ئابوری سەرمایەداری و سۆسیالیزمی بەلکو دەڵێین: خۆرئاوا هەردوو مەزهەبی لە ئیسلام وەرگرتووە. (عبدالمنعم محمد خلاف) لە کتێبی (المادیە الاسلامیە وابعادها) ئەوە دەسەلمێنێ نەك هەر مەزهەبی سۆسیالیزمی لە ئیسلام دزراوە بەلکو هەر ووشەکەش ئیسلامییە وەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمێ: (الناس شرکاء في ثلاثة. . . ). یان فرۆید سێ دەرونەکان لە ئیسلام دەدزێ شیتەڵی دەرونی لەسەر دامەزرێنێ و، دەرونی (خراپ و سەرزنشتە کەر و دڵنیا) دەگۆڕێ بە (من و منۆکی نزم و منۆکی بالا) بەلام بە دەستکاری و گۆڕینی جەوهەر و ڕواڵەتەکانیان و، لایەنە روحی و دینیەکانیان. قورئانی مەزن دەفەرمێ: (وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِي هَذَا الْقُرْآنِ مِنْ كُلِّ مَثَلٍ). (وەرگێڕ)

(ئەی زەردەشتی پاکژ و بێ گەرد ئەو زەوییەی ماوەیەکی درێژ کشتوکاڵی تێدا ناکرێ بەختەوەر نییە، بەڵکو وەك ئەو کچە وایە بە بێ منداڵ دەژی و بە داخ و کەسەرەوەیە بۆ پیاوە و، خۆشحاڵی بۆ ئەو کەسەی ڕەچاوی زەوی و کشتوکاڵی دەکات چونکە دەوڵەمەندی و سامانی پێ دەدات هەروەکو چۆن ژنی خۆشەویست منداڵ بە مێردی دەبەخشێ).

سەرچاوەی سەربەرزی مرۆڤ لە خاککەیدا و، ڕێز و شانازی لەو وەردەگرێ و، وا دەکات خەڵکیش ڕێز لەو بنێن، خوای گەورە دەفەرمێ و ئاخاوتن لەگەڵ هەموو بڕواداری دەکات: (کێ زەوی نەکێڵێ بە دەستی چەپ و ڕاستی زەوی پێی دەڵێ: ئەی ئادەمیزاد تۆ هەمیشە لە بەر دەرگای ماڵان دەبی لەگەڵ سواڵ کەر و دەرۆزەکەراندا بۆ داواکردنی خۆراك و، ئەوانەی خێر و بەهرەی زۆریان لایە بەرماوەی نانت پێ دەدەن).

لە کاتێکدا زەردەشت پرسیاری لە پەروەردگاری کرد کە زەوی لە کام شوێندا هەست بە بەختەوەری دەکات، ئاوەها وەڵامی دایەوە:

(لەوا کاتێکدا، بڕوادار تا دەتوانێ و لە تاقەتی دایە گەنم و گژ و گیا و دەرختی بەردار دەروێنێ و، لە کاتێدا ئاو بۆ خاکی بێ ئاو ڕادەکێشێ و، ئاو لە خاکی بەراوەوە بەکار دێنێ و، ئەو لە کاتێکدا ڕانە ئاژەڵی لەسەر زۆر دەکرێت و زۆر دەبێ، چونکە ئەو زەوییەی ماوەیەکی درێژ مردووە و کشتیار نایکێڵێ ئەوە هەرگیز دڵخۆش نابێ و، ئەو داوای کێڵانی باش دەکات، وەکو چۆن کچێکی جوان کە ماوەیەکی درێژ بێ منداڵە خۆزگەی ئەوە دەکات شووی کردبایە و منداڵی ببێت.

ئەی زەدەشت هەر کەسێ لە زەویدا بە دەستی ڕاست و چەپ کاربکات زەوی جۆرەها بەروبوومی بۆ دێنێ و، نموونەی ئەو وەکو مێردەکی خۆشەویستە کە لەسەر جێگای دا لەگەڵ خۆشەویستی دا دەنوێ یەکەم جار بەرهەمێ هەڵدەگرێ و، جارەکەی تر منداڵ، ئەو کەسەی کار لە زەوی دادەکات زەوی پێی دەڵێ من هەردەم هەموو جۆرە خواردنێ لە پێناو تۆدا هەڵدەگرم و هەردەم چەندان قەڵا بەستە و کەڵکە گەنمت بۆ هەڵدەگرم).

وە هەر كەسێ زەوی بكێڵێ و بیچێنێ و دوای مردن زینـدووی بكاتـەوە و، بـە كارەكی نایاب و پەسەند هەڵساوە لە لای خوادا و، هەر كەسـێ ئـەم كـارە بكـات وەك ئەوە وایە ژیانی لە بوونەوەردا بڵاو كردبێتـەوە و، هـەموو كـارەكی خـراپ و ناشیرینی لە زەویدا ڕەش كردبێتەوە.

**لە (ڤەندیداد)دا هاتووە:**

(هەر كەسێ تۆو بچێنێ قودسییەت و پـیرۆزی دەچـێنێ و، هـەر كەسـێ گـەنم بچێنێ سەقامگیری - الاستقامە - دەچێنێ و ئەو یارمەتی ئاینی خـوا دەدات و، شكۆ و ڕێزی ئەو زیاد دەكات و گەشەی پێ دەدات و، ئەم كارەی بە ئەندازەی سەد كار هەیە لەو كارانەی خوا خۆشـی دەوێـت و بەشـێكن لـە خـوا پەرسـتی و، بـە ئەندازەی هەزار كردەوەی داهێنان و جوانكارییە و دە هـەزار نـزا و پاڕانەوەیـە و، كاتێ گەنم گەورە دەبـێ شـەیتانەكان شـپرزە دەبـن و، كاتـێ گـەنم گـەورە دەبـێ شەیتانەكان لە هۆش خۆ دەبات و، كاتێ گەنم دەدروێتەوە شەیتانەكان لە ناو دەچن و قڕان دەكەن، بەڵام ماڵی گەنمی زۆر بڕواتە ناو شەیتانەكانی وا لە ماڵ دەڕۆنە دەر وەك ئەوەی گەرویان بە ئاسنی سور كراوە داخ بكەن. ئەی بەندەی باش: ئەم ئایەتە بە دڵ لە بەر بكە، هەر كەسێ نەخوات توانـای ئـەوەی نابـێ بـە جێبـەجێكردنی ئەركە ئاینییەكان بە گـەرم و گوڕییـەوە هەڵبـستێ، یـان بـۆ كـێڵان بـە چـالاكی هەڵبستێ، یان بە منداڵ بوون بە چالاكی هەڵبستێ، هەموو جیهانی جەستەكان بە خۆراك دەژین ئەگینا لە ناو دەچن)[1].

---

[1] قورئان و سوننەت پڕە لە هاندان بۆ كشتوكاڵ كردن و ڕواندنی نەمام و دەرخـت كـە سەرچـاوەیەكی گـرنگن بـۆ خـۆراك وەكـو: (وَآيَـةٌ لَهُـمُ الأَرْضُ الْمَيْتَـةُ أَحْيَيْنَاهَـا وَأَخْرَجْنَـا مِنْهَـا حَبًّـا فَمِنْـهُ يَأْكُلُونَ(٣٣)وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّاتٍ مِنْ نَخِيلٍ وَأَعْنَابٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ الْعُيُونِ(٣٤) لِيَـأْكُلُوا مِـنْ ثَمَـرِهِ وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ أَفَلاَ يَشْكُرُونَ(٣٥)) یس/٣٣-٣٥. واتە: موعجیزە و بەڵگەیەكی تری خـوا زەوی مردووە كە زیندومان كردۆتەوە و، دانەوێڵەمان لێ هێناوە و، لێی دەخۆن وە دروستمان كـردووە لـە ناویدا باخچە و باغ و لە دار خورما و میوەكان و كانیاوەكانمان تێدا هەڵقوڵاندوە تا لە بەرەكەی بخۆن و وە لە كرداری دەستی خۆیان، ئایا سوپاس و ستایش ناكەن)؟!.=

یەکێکی تر لە بایەخەکان کە پێویستە بە زەوی بدرێ و ڕەچاو بکرێ بکێڵرێ و خوا لەسەر بەندەکانی خۆی فەرزی کردووە کە ئاو بەپاکی ڕابگیرێ، جا ئاوی ڕووبارەکان بێ یان بیرەکان، چونکە بە ئاو یاسا و ڕێسای سروشت ڕادەوەستێ و هۆکاری ئاوەدانکردنەوەی جیهانە، ئەگەر کەسێ لاشەی ئاژەڵان و شتی پیس فڕێ بداتە ناو ئاوەڕۆ و جۆگەکانی ئاودان ئەو ئاوە بە پیس دادەنرێت. بەڵام کێ تف و

---

= سەبارەت بە ئاژەڵداری دەفەرمێ: (وَالأَنْعَامَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَافِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ(٥) وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ(٦)وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَى بَلَدٍ لَمْ تَكُونُوا بَالِغِيهِ إِلاَّ بِشِقِّ الأَنفُسِ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَحِيمٌ(٧)وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً وَيَخْلُقُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ(٨)) النحل/٥-٨. واتە: ئاژەڵانی بۆ دروست کردون کە خۆ گەرم کردنەوە و سودەکانی تێدایە و، هەر لەوانیش دەخۆن. وە بۆتان هەیە لەوانە جوانی کاتێ ئێوارە دێنرێتەوە سەر ئاخوڕ، بەیانیان لێ خوڕەڕێن بۆ لەوەڕگا. وەیان باری قوڕستان بۆ هەڵدەگرن بۆ شار کە بە دژواری نەبێ نایگەنێ و، پەروەردگارتان بە سۆز و بەزەیی بەردەوامە. ئەسپ و نێستر و کەرمان بۆ سواری و جوانی بۆ دروست کردون شتی واتان بۆ دروست دەکەین کە نایزانن) وەکو ئۆتۆمبیل و فڕۆکە و باپۆڕ. لە فەرموودەدا هاتووە: (اطلبوا الرزق في خبايا الارض) رواه الطبراني والبيهقي. واتە: ڕۆزی لە ناخی زەویدا داوا بکەن. (احرثوا فان الحرث مبارك. . . . ) رواه ابو داود مرسلا عن علي ابن الحسين (ﷺ). واتە: کشتوکاڵ بکەن چونکە کشتوکاڵ کردن فەڕ و پیتی تێدایە. (ان قامت الساعة وفي يد احدكم فسيلة، فان استطاع ان لايقوم حتى يغرسها فليغرسها) رواه البخاري في الادب المفرد.

واتە: ئەگەر قیامەت داهات و یەکێ لە ئێوە نەمامەکی بە دەستەوە بوو، ئەگەر توانی بیڕوێنێ با بیڕوێنێ. (من احيا ارضا ميتة فهي له) رواه احمد والترمذي وابو داود /صحيح. واتە: کێ زەوییەکی مردوو زیندوو بکاتەوە ئەوە هی خۆیەتی. (من كانت له ارض فليزرعها او ليمنحها اخاه) متفق عليه. واتە: کێ زەوییەکی هەبوو با بیکا بە کشتوکاڵ یان بیدات بە براکەی خۆی. (ما من مسلم يزرع زرعا او يغرس غرسا، فيأكل منه طير، او انسان او بهيمة الا كان له به صدقة) متفق عليه واحمد والترمذي. واتە: هەر موسڵمانێ کشتوکاڵ بکات یان نەمام بڕوێنێ باڵندە یان مرۆڤ یان گیاندار لێی بخوات ئەوە بۆی دەبێ بە چاکە. بە کورتی یەکێ لە کارە گرنگەکانی پەیامی پێغەمبەران ئاوەدانکردنەوەی زەوی و، بوژانەوەی ئابوری و، بوژانەوەی ژیان بووە کە ژیان و خۆش گوزەرانی لەسەر دادەمەزرێت. یەکێ لە کێشە گەورەکانی جیهانی ئیمڕۆش کێشەی نەمانی دارستان و خاکی بە پیت و، پیس بوونی ژینگە و، هەژاری و، نەخۆشیەکانی بەد خۆراکییە کە لە ناکامی کردەوە بەدەکانی مرۆڤ ڕوویداوە: (ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ). واتە: دەرکەوت خراپەکاری لە ووشکانی و دەریادا بەهۆی کردەوەکانی دەستی مرۆڤ. (وەرگێڕ)

میز بکاتە ناو ئاو ئەوە گوناهبار و تاوانبارە و، پاکژ بوونەوەی نییە لەو گوناهـە، ئەگەر بڕوا داریێ کەلاکێ ببینێ سەر ئاو کەوتووە پێویستە لە ئاوی دەربێنێ و هەر کارەکی هەیبێ دەبێ بچێ لە ئاوەکەی دوربخاتەوە).

لە قۆناغەکانی دارمانی دیـنی زەردەشـتیدا ئـەم پاکژییـەی ئـاو بـەپێی ئـەم فەرزییە گۆڕا بە پیرۆز ڕاگرتن و بە مەزندانانی ئـاوو لـە دۆخـی تینـوەتی دانـەبا دەستیان بۆ ئاو درێژ نەدەکرد، یان لە کاتی ئـاودانی ڕووەکـدا و، بـوار بـە کـەس نەدەدرا دەستی بشوات نەوەکو ئاوەکە پیس ببێ، چونکە ئاو بە لای ئەوانە مانای ژیانەکی نوێی پڕ لە کشتوکاڵ و، ڕووەکی سەوزی پێ گەیشتووی پڕ لە بەروبوم.

بەڵام جوتیار کە بایەخ بە زەوی و کشتوکاڵ دەدات ئەو بە تەنیا زەوی دڵخـۆش و کامەران دەکات و، ئەو خۆشەویستی خوایە کە پێویستە هـەموو کـەس خۆشـی بوێ و چاکەی لەگەڵدا بکات، وە لە (ئەلیسنا) دا پاڕانەوەیەکی زەردەشت هـاتووە لە پەروەردگاری نزا دەکات کە جوتیار لە گشت خراپەیـەکی بـێ بـڕوا و دوو ڕوان بپارێزێ کە ڕێزی کارەکەی نازانن:

(پەنا دەبەمە بەر خوا بە دەستی بەرز کراوەم کە دوعا و نزام پەسەند بکات کە ئازاری ئەوانە نەدات کە لە پێناو حەقدا دەژین، هەروەها ئەو جوتیارانەش کـە بـە باشی کار دەکەن بۆ دەوڵەمەندی وڵات و چاکەی بەندەکان و، وە تا تۆ ئازار و سزا دابەزێنیە سەر دوو ڕوەکان و خراپەکاران کە لە ناو ئەواندا دەژین).

گرنگـی دان بـە ئاژەڵـداری مـاڵی دوای کـشتوکاڵ ڕاسـتەوخۆ پلـەی دووەم وەردەگرێ و، هەندێ جار لە بایەخدا ئاژەڵان لەگەڵ جوتیاریدا یەکسان دەبن و، زۆر لە دەقەکانی ئاڤێستا پشتگیری لەمەی دەکەن کە پێویستی کردووە لەسەر بـڕوادار چۆن گرنگی بە زەوی دەدات ئاواش گرنگی بە ئاژەڵداری بدات.

شـەریعەتەکە هـەر بـە یەکـسانی نەوەسـتا بـەڵکو گەیاندیـە ئاسـتێ کـە شەریعەتەکە بەزەیی هاتنەوە بە گیانداراندا یان لە کاتی سەربڕینیاندا فەرز بکـات

نابێ لە کاتی پێویستیدا نەبێ سەریان ببڕێت، گەورەترین تاوان کە لەمەڕ گیاندارانی بە سوود دەکرێ گاڵتە کردنە بە کوشتنیان لە کاتی ڕاو و یاری تردا، ئەوانەی بێ بەزەیی و دڵڕەقی دەکەن لەمەدا بە دوژمنی ژیان وەسفی کردون و، ئەوانەش کە چاودێری دەکەن و بایەخی پێ دەدەن مژدەی باشترین پاداشتی پێ داون لە پەسلاندا.[1].

لە کاتێکدا زەردەشت لە پەروەردگاری پرسیاری کرد زەوی لە کام جێگادا دەگاتە ئەوپەڕی بەختەوەری؟ وەڵامی دایەوە: (ئەوە لە کاتێکدایە بڕوادار خانوێ دروست دەکات و خێزانەکی باش لەگەڵ منداڵەکانی و ڕانە ئاژەڵەکی تێدا دادەنێت، لەو ماڵەدا ئاژەڵەکان زاوزێ دەکەن و گەشە دەکەن و، سرپیان زۆر دەبێ و دەبێ بە پەینن و، کا گەشە دەکات و، هەموو شتەکی باش بۆ ژیان گەشە دەکات و پەرە دەسێنێت).

---

[1] پاراستنی مافی گیانداران لە قورئاندا لەمەدا هاتووە کە دەفەرمێ: (وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلاَّ أُمَمٌ أَمْثَالُكُمْ) واتە: هەرچی گیاندارە لە زەوی دا و باڵدارە و بە باڵەکانی دەفڕێ نەتەوەو گەلێکن وەکو ئێوە.

(النسائي) و (ابن حبان) گێڕاویانەوە: (من قتل عصفورا عبثا عج الي يوم القيامة يقول يا رب ان فلان قتلني عبثا ولم يقتلني منفعة). واتە: کێ چۆلەکەیێ بێ هودە بکوژێ قیامەت سکاڵا دەکات و دەڵێ: ئەی پەروەردگارم فلانە لە خۆوە کوشتمی بۆ سوود وەرگرتن نەیکوشتم.

(مسلم) گێڕاویەتەوە (لا تتخذوا شيئا فيه الروح غرضا) واتە: شتێ مەکەن بە نیشانە کە گیانی لەبەر بێت.

هەتا لە بارەی دار و درەخت فەرموودە هاتووە: (من قطع سدرة صوت الله رأسه في النار) رواه الطبراني والبيهقي. واتە کێ دارەکی مۆرد ببڕێ خوا سەری دەخاتە ئاگرە. نموونەی تر زۆرە لە فەرموودە لەسەر پاراستنی مافی ئاژەڵان و گیانداران و ڕووەك کە ئەوانیش مافی خۆیان هەیە نابێ مافی ئەوانیش پێ شێل بکرێت ئەگینا لەگەڵ سزای خوادا بەرەو ڕوو دەبنەوە. وەکو ئەو ئافرەتەی پشیلەیەك بە برسییەتی دەکوژێ دەچێتە ئاگرەوە، بەڵام ئافرەتێ سەگێ ئاو دەدات لە دەشتێکدا و لە مردن ڕزگاری دەکات دەڕواتە بەهەشتەوە. بەڵام زۆر گیانداری زیان بەخش ڕێگایان بە کوشتن دراوە چونکە زیان بەخشن وەکو: کێچ و ئەسپێ و، مێشولە و، مێش و، مشك و مار و، دووپشکە و... هتد. سەرباری میکرۆب و کەڕوە زیانبەخشەکان.

## زەردەشت ئامۆژگاری ئاژەڵدار دەکات و دەفەرمێ:

(با خوا یارمەتی دەرمانی بێ تا بەختەوەر بین، ئەو گیاندارە سوود بەخشەکان دەپارێزێ، ئەو ئاشتی لە نێوان گیاندارە باشەکاندا بڵاو دەکاتەوە و، هەموو گیانداران لەژێر چاودێری ئەودان، کێ ڕووناکی بوێ پێویستە گیاندارە ماڵییە سوود بەخشەکان بپارێزێ و چاودێریان بکات و شوێنی بێ ترسیان بۆ ئامادە بکات و، پێویستە ئەگەر کەسەکی بێ بەزەیی لە هیکرا ئازارایان بدات بەرگرییان لێ بکات، پێویستە ئاژەڵ بە پیاوی دڵڕەق و ستەمکار نەدرێت و، پێویستە بڕوادار ئالیك و پەڵخوڕیانی لە هاویندا بۆ ساز بکات تا لە زستانی سارد و سڕدا ناچاری نەکات بڕواتە دەرەوە و، حەرامە لەسەر بڕوادار بێچووەکانی لە شیرەکەی دوربخاتەوە، گیاندارە ماڵیەکان لەم دنیایەدا بۆ خوای گەورەن.

زەردەشت ئامۆژگاری خەڵك دەکا دەربارەی گیاندارە مێیەکان و، بە تایبەتی ئاوسەکان کە پێویستە بە بەزەیی پێویستەوە بایەخیان پێ بدرێ و دەڵێ: (پێویستە لەسەر ئەو کەسەی خودا مێیەی ئاژەڵانی پێ سپاردووە بایەخیان پێ بدات، گیاندارەکان دوو قاچ بن یان چوار پەل بن).

وە شتەکی تر کە پێویستە بە ئاژەڵەوە سەگە، ئاڤێستا لە دەقە کۆنەکان و تازەکانیدا لە گرنگی پێداندا لە ڕیزی گای سوودبەخش و چاکە بەخشی داناوە، چونکە سەگ (کسۆك) گیاندارەکی کەیی و ماڵییە بۆ پاسەوانی و پاراستنی ئاژەڵان بەکاردەهێنرێ، هەروەها بۆ پاسی ماڵی خەڵکدا، لەشی سفت و بەهێز کردووە دژ بە خراپکاران و هەر کەس بە دەنگی ئەو هۆشیار دەبێتەوە و، نە دز و نە گورگ بێ ترس و، ئاگایی شتێ لە ماڵی ئەو تاوا ناداتێ).

سەگ حەوت سیفەتی هەیە لە بڕواداری نزیك خستۆتەوە و، ئەویشی لە ئەو نزیك کردۆتەوە، وەك لە (ڤەندیداد)دا هاتووە، ئەوەی لای مرۆڤ هەیە ئەویش هەیەتی:

١- وەکو فالّچی پاشماوەی خواردن دەخوا و، وەکو فالّچی بە کەم ڕازییەو، خۆڕاگرە و وەکو فالّچی بە لەتکە نانێ ڕازییە.

٢- وەکو جەنگاوەر لە ڕیزی پێشەوەی کۆڕەودا دەڕوات و، وەکو جەنگاوەر بەرگری لە ئاژەڵان دەکات و، وەکو جەنگاوەر ناترسێ و بێ باکە و، وەکو جەنگاوەر لە پێناو خاوەنیدا دەمرێت.

٣- زۆر هەستیار و بە گوایە و، وەکو جوتیار لـە سـەر هەسـت دەنـوێ و، وەکـو جوتیار یەکەم کەسە دەڕواتە دەرو، دوا کەسە دێتەوە.

٤- ئەو دەگۆڕێ و پێویستی بە پەروەردە و ڕاهێنانە و، هەرچی لێی نزیك بێتـەوە برینداری دەکات و وەکو گۆرانی بێژی گەڕیدەیە.

٥- وەك دز حەزی لە تاریکییە و، لە شەودا دەسوڕێتەوە و وەك دز بـێ شـەرمانە دەخوا و، وەك دز کە شتەکی پێ سپێرا ناپاکی دەکات.

٦- وەکو ئافرەتی دامـێن پـیس تامـەزرۆی چاوەشـییە و، شـەوانە وەك ئـەو لـە ڕێگاوبانەکاندا دەسوڕێتەوە و وەك ئەو میزاژی دەگۆڕێت.

٧- وەکو منداڵ حەزی لە خەوە و، وەك منداڵ زەوی هەڵدەکۆڵێ و، وەك ئەو دڵـی ناسکە و، وەك منداڵ زمانی دەردێنێت.

بەڵام ئاژەڵێ بێ کەڵك و کێوی و، مێروی زیانبـەخش و لـەناو بـەر و، ئـەوەی دەستکەوتەکان دەدزێ هەموویان بۆ پاك و پیس بەش کراون.

- ئەوەی پاکژە ئەوەیە کاری باشە و، تا مابێ پاکیەکەی دەست پێ وە دەگـرێ و، کە مردیش لەشی دەگۆڕێ بە شتەکی پیس وەکو ژیـشك کـە مـشك دەکـوژێ و گەنم و دەغڵ دەدزی، یان کەڵەشێر کە بەندەکانی خوا بۆ نوێژ ڕاست دەکاتەوە لە بەیانیدا و، ئەم گیاندارانە تا ئیمڕۆش لای زەردەشتی هیند و ئێران ڕێزیان هەیە.

- وە پیس ئەوانەی کارەکانیان پیس دەبێ و، زیان و خراپە بـە خـەڵکی بگەیـەنن وەکو ئەژدیها و مار و دوپشك و بۆق و مێش و پشیلە کە لە ناو بردنیان بڕوادار لە خوا نزیك دەخاتەوە و بە کوشتنیان مرۆڤ لە گوناهەکانی خۆش دەبێت[1].

---

[1] لە ئیسلامدا فەرمان کراوە بە کوشتن و قڕ کردنی ئەم گیاندارانە کە زیانبەخش و نەخۆشـی دەگوازنـەوە. بـۆ نموونە قورئان دەفەرمێ: (فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ وَالْجَرَادَ وَالْقُمَّلَ وَالضَّفَادِعَ وَالدَّمَ) الاعراف/٧. واتە: لافاوو=

## سێیەم: خێزان:

خودای گەورە لەسەر هەموو بڕوادارەکی پێویست کردووە ژن بێنێ و شو بکات تا خێزان بنیات بنێ و ماڵێك قیت بکاتەوە و، ژن هێنانی زیاتر لە یەکێکی بۆ دروستە بەو مەرجەی دەوڵەمەند و خۆش گوزەران بێ و توانای خەرجی هەبێ و، ئەگەر دەست کورت بوو دەبێ یەك ژن بێنێ، چونکە خوای گەورە یەکەم شت کە لە بەندەی خۆی ڕازی دەبێ ئەوەیە ژنێ هەڵبژێرێ و، ماڵێ بۆ خێزان و منداڵی پێکەوە بنێ و لە ناویدا بژین و، خوای گەورە بە زەردەشت دەفەرمێ:

(من دەڵێم ئەی زەردەشتی پاکژ، پیاوی بە ژن باشتر و بەڕێزترە لە پیاوی سڵت و، ئەوەی خانوی هەیە باشترە لەوەی خانوی نییە، ئەو پیاوەی کوری هەیە باشترە لەوەی کوڕی نییە، پیاوی دەوڵەمەند باشترە لە هەژار)[1].

= کولله و، ئەسپێ و، بۆق و خوێنمان نارده سەریان. ئاشکرایە کوللە بەڵایەکی کشتوکاڵییە و، کێچ و ئەسپێ تاعون و کازار دەگوازنەوە و، (الدم) کە مەبەست لە مێشولەیێ کە خوێن دەمژێ ئەوە ئەنوفیلس مەلاریا دەگوازێتەوە و، مێش دەیان نەخۆشی دەگوازێتەوە و، نزیکەی ملیۆن وچارەکێ میکرۆب هەڵدەگرێ وەکو چاویەشەی تەراخوما و، ناوەڵە و، سورێژە و کولێرا و زەحیری و سیل و هتد. لە فەرمووودەدا هاتووە: (خمس من الدواب لا حرج من قتلهن: الغراب والحدأة و الفأرة و العقرب والكلب العقور) اخرجه البخاري و مسلم. واتە: پێنج گیاندار تاوانی تێدا نییە: قەلە ڕەشە و کۆلارە و، مشك و دوپشك و سەگی هار. ئاشکرایە مشك تاعون دەگوازێتەوە و، سەگی هار ڤایرۆسی هاری دەگوازێتەوە لە کاتی گەستندا.
(اقتلوا الحية والعقرب) رواه الطبراني. واتە: مار و دوو پشك بکوژن.
چونکە ژەهراوین و ژەهرەکەیان کوشندەیە. ئەم ڕێنومایيە تەندروستییانە بەر لە زانستی نوێ لە پەیامی هەموو پێغەمبەراندا هاتووە. (وەرگێڕ)

[1] لە ئیسلامدا ژن هێنان و شو کردن ئەرکی سەر شانی هەموو ژن و پیاوێکە و، سوونەتی ژیانە و، بەمە خێزان دادەمەزرێ کە یەکەی پێك هاتنی کۆمەڵگایە. بە ژن هێنان مرۆڤ وەڵامی ڕەمەکی سێکس دەداتەوە و، کرداری زۆربوون بەردەوام دەبێ و، مرۆڤ لە تاوانی سێکس و نەخۆشییەکانی بەرەڵایی سێکس و، لادانە سێکسیەکان ڕزگاری دەبێت. قورئانی مەزن دەفەرمێ: (وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً. . . ) واتە: یەکێ لە بەلگە و پەرجووەکانی خوا ئەوەیە لە خودی ئێوەي - جوتانەی دروست کردون، هەتا لە تەکیانەوەدا بنیشن و خۆشەویستی و سۆزی لە نێواندا داناون. (وَلْيَسْتَعْفِفْ الَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّى يُغْنِيَهُمْ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ)
واتە: با خۆیان داوێن پاك ڕابگرن ئەوانەی توانای ژن هێنانیان نییە تا خوا لە سایەی خۆیەوە دەوڵەمەندیان دەکات.=

وە ژن هێنان لە ئاینی زەردەشتیدا بەرزترین جۆری خواپەرستییە کە بەندە پێی لە خوای گەورە نزیك دەبێتەوە و، لە کۆمەڵە خێزانەکی باش کۆمەڵگایەکی باش دروست دەبێ و، لە ناو ئەودا کوڕانێ دروست دەبن خوا دەپەرستن و خاکی ئەو ئاوەدان دەکەنەوە و، حەز بە بڵاو کردنەوەی ئاین دەکەن و، ئەدەبایەتی ئاڤێستا شکۆداری خێزان بە زەوی دەچوێنێ و، ئەگەر زەوی بە بەپیتی نەبێ بە کەڵك نایەت مرۆڤیش بە خێزانی باش و ماڵی باش نەبێ بە کەڵك نایەت کە ژن و منداڵ دەگرێتە خۆی[1].

نەهێنانی ژن و دانە مەزراندنی خێزان کە ئاین یاساغی کردووە و، بەپێی کۆن بوونی ڕۆژگار گەیشتە ئاستی پیرۆز ڕاگرتن و، لە ڕۆژانی دەسەڵاتی ساسانیان دا بووە بنەمایەك بەو پایە مافی بە هاوڵاتی بوونی تەواوی پێ دەدرا و، ڕێزی خێزان لە دیدەگای کۆمەڵگاکەوە بەپێی ڕاددەی کوڕ پەیدا بوون دەگۆڕا، بەڵام سڵت و ڕەبەن بێ بەش بوو لە ژیانی گشتی.

لەئاینی زەردەشتیدا بۆ پێکهێنانی خێزان هەمان ڕێ و شوێنی ئیسلامی هەیە کە پشت بە ئازادی هەڵبژاردنی هاوسەری دەبەستێ بۆ هەردوولا، پیاوەکە و ئافرەتەکە و، دوای مارە کردن و دەسگیرانی کە باوە پیاوەکە مارەیی دەداتە بووك یان دەیدات بە سەرپەرشکارەکەی بەگوێرەی ئەو ڕێککەوتنەی لەسەری پێك

= پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمێ: (ثلاث من السعادة وثلاثة من الشقاء، المرأة الصالحة تراها فتعجبك وتغيب عنها فتأمنها على نفسها ومالك، والدابة تكون وطينة فتلحقك اصحابك، والدار تكون واسعة كثيرة المرافق.... ). رواه الحاكم/ اسناده حسن في الجامع الصغير. واتە: سێ شت بەشێکن لە بەختەوەری و سێ شت بەشێکن لە کلۆڵی و کەساسی، ئافرەتی باش کە دەیبینی دڵت خۆش دەکات و کە لێی دور دەبی بێ باکی لە خۆی و سامانت و، وڵاخی ڕام و هێور کە برادەرانت دەتوانن پێت بگەن و، خانووی فراوان و یاوەری زۆر بن).

(تناكحوا تكثروا) رواه عبدالرزاق في الجامع. واتە: ژن بێنن زۆر دەبن.

[1] ئەم پێچواندنە لە قورئانی پیرۆزیشدا هاتووە: (نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ). واتە: خێزانەکانتان کێڵگەی ئێوەن چۆن دەتانەوێ کیلگەتان بچێنن.

هاتوون لە سەرەتادا، وە زاوا بۆی هەیە لە هەندێ دۆخدا مارەییەکە داوا بکاتەوە یەکێ لەو دۆخە گرنگانەش نەزۆکییە[1].

سەرپەرشتی ژنەکە پاش مارە برین گورج بۆ مێرد دەگوازرێتەوە و، دەتوانێ بە پرسی و ڕازی بوونی ئەو هەڵس و کەوت لە سامان و زەوی و زاریدا بکات. چونکە ئافرەت کیانەکی سەربەخۆیە و خۆی ناتوێنێتەوە و کەسایەتی خۆی لە دەست نادات کە پیاو فەرمانی بەسەردا بکات و پیاو سالاری بنوێنێ و، ئەو مافی خاوەنداریتی و مافی هەڵس و کەوتی هەیە لەوەیدا کە خاوەنیەتی، بەڵکو دەتوانێ کاروباری ماڵی مێرد هەڵسوڕێنێ بە ناوی ئەو یان بە بریکاری ئەو. پەیوەندییەکە لە نێوان ژن و مێردا لەسەر سۆز و خۆشەویستی یەکتری دامەزراوە بە بێ زۆری لێ کردن و ناچار کردن لە هیچ کام لە لایەکان و، مێرد بەپێی ئەو سنوورە کە ئاین دایناوە دەسەڵاتی بەسەر ژنەوە نییە. ئاسایی بوو وەکو مێژوو نووسان دەگێڕنەوە کە هەموو خێزانەکان لە دەوری خوانی خواردن کۆببنەوە و، پێکەوە بچنە ئاهەنگەکان و بۆنە ئاینیەکان و جەژنەکان و، سەردانی کەس و کار و خزمان و، ئامادە بوون لەسەر داوەت و شایی و، هۆگری و شیرازە بۆ ماوەیەکی درێژ باڵی

[1] مارە کردن لە ئیسلامدا لە سەر (٥) برگە دادەمەزرێت:

١- ڕازی بوونی کوڕ و کچ بێ ناچار کردن وەکو لە فەرموودەدا هاتووە: (لا تنكح الأيم حتى تستأمر، ولا تنكح البكر حتى تستأذن) متفق عليه. واتە: بێوەژن مارە ناکرێ تا داخوازی نەکات و کچیش مارە ناکرێ هەتا پرسی پێ نەکرێت.

(٢-٣) سەرپەرشتکار و دوو شاهیدی دادگەر: (لا نكاح إلا بولي و شاهدين عدلين) رواه البيهقي/ صحيح.
واتە: مارە کردن بە بێ سەرپەرشتکار و دوو شاهیدی دادگەر دانامەزرێت. بەڵام وەلی کاتێ دەتوانێ کچ مەنع بکات کە بیانوی شەرعی هەبێ وەکو: کوڕەکە بێ دین بێ یان خراپکار بێ نەگینا حاکمی شەرع دەتوانێ سەرپەرشتکار ناچار بکات.

٤- مارەیی: وەکو دیاری و بەخششێك و ماڵێ بۆ ژنەکە: (خير الصداق ايسره) رواه الحاكم. واتە: باشترین مارەیی کەمترینیانە.

٥- مارەیی کردنەکە بە ئاشکرایی و بە زمان و ئاخاوتن بێ و، وا باشە لە مزگەوت بێ و، داوەتی تێدا بێ و دەف و سروودی تێدا هەبێت.

بەسەر خێزاندا کێشا بوو تا دەسکاری و گۆڕان بەسەر لقەکانی ئاینیەکاندا هاتووە، زۆر جار لە چاکە و ڕێزەکانی خێزانی زەردەشتی لە دەست چوو.

شەریعەتەکە ڕێزی ژنی ماڵەوە و کابانی پاراستووە و، ئەرکی ڕێز لێنانی لەسەر شانی هەموان داناوە و، هەروەها پۆشتە و مانەوە لە ماڵەوە و نەچوون بۆ دەرەوە بۆ پێویستی نەبێ وەکو هاوبەشی کردنی مێرد لە کاریدا، یان ئەگەر خۆی بچێ بۆ کار لە کاتی نەبوونی بەخێوکەر داو، جگە لەمە دەبێ کاتەکە بۆ پەروەردەی منداڵ و کاروباری ماڵەوە خەریك بکات[1].

دوای حوکمڕانی دارا [2] شەرع زانەکان ڕێ و شوێنی توندیان سەبارەت بە ئافرەت گرتە بەر کە هیچ پاساوو بەڵگەیەکی نەبێ لە شەریعەتەکەدا. بواریان نەدەدا بڕواتە دەر لە ماڵەوە لەناو کەژاوەی ئەستوردا نەبایە کە هیچی لەناودا

---

[1] لێرەدا کە قورئانیش دەفەرمێ (وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ) واتە لە ماڵەوەتان دانیشن مانای ئەوە نییە ئافرەت بۆی نییە بڕواتە دەرو، بەشداری چالاکی کۆمەڵایەتی و سیاسی نەکات بەڵکو مانای ئەوەیە کە خێزانداری و پەروەردەی منداڵ و، شیر پێ دانی و، خۆراك پێ دانی و، پەروەردەی دایك زۆر لە کاروباری دەرەوە گرنگترە و پیرۆزترە و، نابێ دایك ئەم ڕۆڵەیە لە دەست بدات و بە پارە و مووچە و، کرێکاری بیگۆڕێتەوە. چونکە دایك قوتابخانەی سەرەتایی منداڵە هەر لەو کاتەوە منداڵ لە سکی دایە و، کە شیرە خۆرەیە و، کە هەرزەکارە و گەورە دەبێت و، ئیش و کار و پێویستییان دابین دەکات تا وەچەیەکی سەرکەوتوو ساغ پێشکەش بە کۆمەڵگا بکات.

ئەنجا چوونە دەریشی دەبێ بە پێی نەریتەکانی کۆمەڵایەتی ئیسلامی بێ وەکو پۆشتە و، پاراستنی ئابڕو و کەسایەتی لە دەست ئەوانەی دڵنەخۆش و لادەرن بۆ پاراستنی کۆمەڵگا لە تاوانە سێکسییەکان و ناکامە خراپەکانیان تێك چوونی خێزان و وەچە. (وەرگێڕ)

[2] لە کتێبی (اربیل بین الماضي والحاضر) کە دەستەیێ ئامادەی کردووە (١٩٧٨)دا لەوێدا هاتووە: (لە ساڵی ٦١٢پ. ز دا هەولێر کەوتە دەستی میدیەکانەوە و، لە ساڵی (٥٥٠پ. ز) دەوڵەتی فارسی دامەزرا و ناوچەکە کەوتە ژێر ڕکێفییەوە. هەولێر شارەکی گەورە بوو تا شەڕێکی یەکالا کراوە لە نێوان دارای سێیەم و ئەسکەندەر ڕوویدا لە ساڵی (٣٣١پ. ز) کە بە جەنگی ئەربیلا ناسراوە و لەوێدا فارسەکان شکان.

بە پێی (المنجد للاعلام) دا لە ماددەی (میدیا)دا دەڵێ: میدیەکان کورش پادشای دەوڵەتی فارسی دەوڵەتەکەی ڕوخاندن لە (٥٥٦پ. ز)دا و (دارا) پایتەختی ئەوانی (هەمەدان) کرد بە پایتەختی خۆی.

بەم پێیە دوای نەمانی دەوڵەتی میدی و هاتنە سەر کاری حوکمی فارسی گۆڕانەکی باش لە ئاڤێستادا کراوە.

بۆ زانستی پتر لە مەڕ دەوڵەتی میدی بڕوانە کتێبی (امارة بهدینان الكردية/ صديق الدملوجي). (وەرگێڕ)

دیار نەبووە و، ڕێگای پێ نەدراوە لە کۆمەڵگای تایبەتی و گشتیدا تێکەڵ بە پیاوان بن و، تا ڕێگا لە ژنە بە مێردەکان گیراوە نزیکترین پیاویان لەوان ببینن با باوکیان یان برایان بێت.

لە لایەکی تریشەوە فەقیهەکان ئەرکی ئەوەیان لەسەر ئەو ئافرەتانە زۆر سوک کرد کە هەژارن و مێرد و سەرپەرشتیان نییە و، ڕێگایان بۆ کردەوە کە بە ئازادی هاتوچۆ بکات و تێکەڵاوی پیاوان ببێت چونکە ناچارە بۆ بژێوی خۆی هەوڵبدا و کاربکات، بەڵام دەبێ بەپێی شەرع پۆشتە بکات و نابێ ئەو تێکەڵاوییەی لە سنوری کار بڕواتە دەر، یان لە دەرەوەی ئیشی کارەوە بێت. یەکێ لەو کارە سەیرانەی مێژوونوسانی سەراسیما کردووە نەبوونی وێنەی ئافرەتە لە ئاسەوارەکانی فارسیدا نە لە نەخشەکاندا وە نە لە پەیکەرە داتاشاوەکاندا، ئەمەش مانای ئەوەیە شەریعەتی زەردەشتی دا پارێزگاری ئابڕووی ژن کراوە بەوەی کە ڕێگەی نەداوە نەخشەو وێنەو ناوی بکێشرێت، ئەمەش بەڵگەی ڕێزنانە لە ئافرەت لەناو کۆمەڵگاو ژیاندا.

وە بۆ پاراستنی شیزازەی خێزانی ئامۆژگاری ئافرەتی بڕواداری کردووە کە داوێن پاکی و پاراستنی ناموس و ئابڕوی بکات، کە ئەو سیفەتانەی بە سیفەتی فریشتەکان چواندووە، بەڵام ئافرەتی بەد ڕەوشتی بێ ئابڕو بێ سودە و، هیچ سودەك بۆ بوونی نابینرێ و، ئافرەتی داوێن پیسی بە هۆکارێك دادەنێ بۆ پیس کردنی ناموس و زەوی و، هێنەری خەشم و ڕقی خوایە و ئاڤێستا ئاوای وەسف دەکات: (ئەو ئافرەتەی تۆوی پیاو چاکان تێکەڵ بە تۆوی خراپکاران دەکات، تۆوی بەندەکانی خوای تێکەڵ بە تۆوی بەندەی بتەکان کردووە و، ئەو ئافرەتیکی زیناکەرە تەماشاکردنی ئاوی تاڤگەی چیاکان ووشك دەکات و، گەشەی ئەو ڕووەکانە پەك.دەخات کە جوان و ڕەنگ زێڕین خۆ دەنوێنن و، نزیك کەوتنەوەی بڕوادار خراپ دەکات و، توانا و ورەی تێك دەدات و، ئافرەتی زیناکار لە ماری

ژەهراوی و گورگی بەلورە و، ئەو گورگەی پەلاماری ڕەوایەکان گیاندارە مالّیان دەدات زیاتر شایانی کوشتنە).

جوولّەی بوونەوەر و هاوسەنگی و ڕێکیەکەی بە هیچ کارێ ئەوەندە نارێکی تووش نابێ وەك لە کاتی تێك چوونی خێزانی بڕواداری تووشی دەبێت و، وە بە تەلاّقدان و مردن ئەندامانی خێزانەکە پەرتەوازە دەبن، یان بە هۆی کارێکی تووڕەیی و تاوانباری ئاوارە دەبن بە زەویدا، ئەو کاتە خەم و پەژارە و نائومێدی هەموو شتێ دەگرێتەوە و، ژیان نرخ و بەهای خۆی لە دەست دەدات و، لە کاتێکدا زەردەشت پرسیار لە پەروەردگاری دەکات لەمەڕ پێنجەم شوێن کە زەوی زیاتر لە هی تر تێیدا خەمبار دەبێت و، وەلاّمی دایەوە و فەرمووی: (ئەو شوێنەیە کە ئافرەتی بڕوادار و منداڵەکانی پێدا بە تالاّن دەبرێ و، ئەو ڕێگایە تۆزاوی و بێ پیتە و چۆلە و، بە گریان و هاواری خەمناك دەنگ بەرز دەکەنەوە و پەرێشانی دەخەنە دڵەکانەوە).

مەبەستی بایەخدانی خوا بە خێزان زۆربەی هەرە زۆری دەربارەی دروست کردنی ژینگەیەکی باشە بۆ بەندەو جێنشینەکانی خوا لەسەر زەوی، وە بۆ هێنانە دی ئەم مەبەستە ئاینیە هەر شەریعەتەکە لەش ساغی ئافرەتی دوو گیانی پاراستووە و، هۆشیاری داوە کە حەرامە ئافرەت لە کاتی مانگی منداڵ بووندا جووت بوونی لەگەڵ بکرێ وەکو چۆن لە کاتی بێ نوێژیدا (حەیز) حەرام کراوە لە هەمان کاتدا منداڵ لەبار بردنی حەرام کردووە کە بە زیندە بە چاڵی شاراوەی داناوە و، هەتا منداڵ لە بردنی نا شەرعیشی بەیەکجاری حەرام کردووە. لە (الابتساق-ئاڤێستا)دا هاتووە: (ئەگەر پیاوێ زینای لەگەڵ کەنیشکەیکدا کرد یان مێردی نەکردبوو دوو گیانی کرد و، کە نیشکەکەوتی من لەم پیاوە دوو گیانم و، ئەویش پێی ووت برۆ لای فلاّنە پیرەژنە شارەزایە لە گژوگیا و دەرمانی منداڵ لەباربەر و، پیرەژنەکەش بە هەر دەرمانێ بێ منداڵی لەبار برد و کوشتی لە منداڵدانـدا، یان

بە هەر گژوگیایەك، ئەو پیاوو کەنیشکە و پیرەژنە هەموویان تاوانەکی گەورە و هەڵەیەکی گەورەیان کردووە).

دوای دابین کردنی ساغی وەچە ساغی دایك لە ڕیزی پێشەوەی هەموو گرنگییەکان دێت و، ڕێسای ووردی بۆ داناوە کە دەبێ لە کاتی دوگیانی و منداڵ بوندا ڕەچاویان بکات، وەك پاکژی و پاراستنی لەو نەخۆشیانەی کار لە تەندروستی دایك و کۆرپەلە دەکەن و، پێویستە بەر لە منداڵ بوون تا منداڵی پەیدا دەبێ چرای بۆ لە ژوورەکەدا هەڵبکرێ. وە سێ شەو و سێ ڕۆژان ئەو چرایە بەهەڵکراوی بمێنێتەوە تا منداڵەکە دێتە ژیانەوەو ئەم جیهانە و، ماوەی زەیستانی (٤٠) ڕۆژە و لە کۆتاییدا دایك گەرماو دەکا و خۆی دەشوات تا وەك بڕوادارانی ئافرەت دەست بە ژیان و خواپەرستی بکاتەوە.

زەیستانییەکان لای مەجوس (مگ)ی هیندی ئیمڕۆ لە تەواوی ماوەی زەیستانی دا پیسە و، دروست نییە کەس دەستی لێ بدات یان دەست لە کەس بدات و، ئەگینا پیسی بۆ هەمووان دەگوازێتەوە و، وەکو شتەکی فڕێ دراوی لێ دێ نە لە کەس و نە کەس لە ئەو نزیك نابێتەوە لە کاتێ دا نەبێ کە نەخۆشە و یان ژیانی لە مەترسیدایە و ئەو کاتە ڕێگا دراوە تێکەڵاوی بکرێ و چاودێری بکرێت. بۆ نموونە ئەگەر نوژدار (پزیشك) بانگ بکرێ بۆ چارەکردنی ئافرەتێ یان پشکنینی مەلۆتکەکە خاوەن ماڵ تۆقەی لەگەڵدا ناکات تا پیسی بۆ نەگوازێتەوە و، لە کاتی ڕۆیشتنیدا دور لە ئەو ڕادەوەستێ و ئامارە بۆ ڕێگای چوونە دەری دەکات، ئەگەر پزیشك هاوئاین بێ چونکە ئاشنایە بە ڕێساکانی پاکژی خۆی دەشوا و جل و بەرگی دەگۆڕێ بەر لەوەی لە ماڵەکە بڕواتە دەرەوە.

زەدەشتی هیندی لە هەموو ئەو شتانەدا پشت بە ڤندیدا دەبەستن بە تایبەتی و بەندەکی تێدایە بە تەواوی باس لە پیسی ئافرەت دەکات لە پاش منداڵ بووندا و، پیسی هەر شتێ دەستی لێ دەدات لە کەل و پەلدا کە ڕۆژانە بەکاریان دێنێت،

پاشان ڕێسای ئالۆزی داناوە بۆ پاکژ بوونەوەی خۆی و ئەو کەسەی دەستی بەر دەکەوێت، یان دەستی لێ دەدات، سەرباری ئەوەش ئیمڕۆ دەزانن کە ئەمە ڕێتێ نەچووە زەیستانی ئەوەندە پیس سەیر بکرێ و، تەقەلاکانی پاکژنەوەش هەر پڕ و پوچن بەلاّم ناتوانن بیگۆڕن و، وا دەزانن حوکمی خوایە دابەزیوەتە سەر ئافرەت و، هەر گۆڕانێ لە مەدا گۆڕینی شەریعەتی خوایە و گوناهەکی گەورەیە و، دەبێتە هۆی سزای خوایی لە دنیا و دوا ڕۆژدا.

وە منداڵ بوون بە ڕوداوەکی گەورە دادەنرێ و هەموو پێی دڵشاد دەبن وە بەهرەیەکی گەورەیە کە سوپاس و ستایشی دەخوازێت، بەلاّم منداڵ نەبوون بە کارەساتێکی دڵتەزێن لە قەڵەم دەدرێ و، بە نیشانەی بێ تەقوایی و بڕوا زەبوونی دادەنرێ، بۆیە ڕاستەوخۆ پاش منداڵ بوون خێر و بێر بەسەر هەژاراندا دابەش دەکرێ، بەلاّم دوای کشانەوەی ئاین و کەم بوونەوەی کاریگەری لە ولاّتدا ئەم دیاردەیە ڕوی لە پاشەکشە کرد و، ئەو مانا خواپەرستییەی مابۆوەش لە دەستیدا، ئەوەی ئێستا ئەنجام دەدرێ تەنیا بۆ کوڕ دەکرێ نەك بۆ کچ ئەوەی تر نەماوە، چونکە بڕوایان وایە پەیدا بوونی کوڕ سامانەکی ئابورییە و، پەیدا بوونی کچ بێ ئابڕویی و داخ و کەسەر دێنێت، بەڵکو هەندێ لە نوێژیاندا پاڕانەوە دەکەن خوا کچیان نەداتێ چونکە لە پەروەردە کردنیاندا کلۆڵ دەبن سودەکەشی خەڵکی تر دەیبات.

وا بووە بە نەریت لە سێ ڕۆژ و سێ شەوان شوێنی منداڵەکە بە چرا ڕووناك بکەنەوە لە ترسی شەیتان و دەستەکەی، وە شتیی پیسی وەکو بۆ نموونە حەیزدار تا نەبێتە هۆی کلۆڵی و کەساسی و بەد بەختی ئەو منداڵە، جگە لەم شتانە وەك شیردان و تاشینی سەری بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا ئەوانە بەپێی شەریعەت بەڕێوە دەچن نەك داب و نەریت. ئەوەی گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە کە زیان لە چەمکی خواپەرستییەکەی بدات کۆی دەقەکانی تەشریعییە کە زۆری کوڕ لە ماڵدا بەرەکەتە و، زێدە چاکەیە کە لە زێدە چاکەکان و، تا پیاو کوڕی پتر بن زیاتر لە خوا نزیك دەکەوێتەوە.

وە زەردەشتیەکان بۆ ناونانی کوڕەکانیان لایەنەکی ئاینیان بە ڕوونـی گـرت و، لەگەڵ دورکەوتنەوە لە ناوە بت پەسـتییەکانی پێـشودا بـەڵکو ئـەم ناونانانـە لـە کوڕەکانیان گوناهە و زینـدو کردنـەوەی ڕابـردووە و ئـاین هـەڵی گرتۆتـەوە و لـە بونەوەردا لەم ناوە ئاینیانەش کە تا دەرکەوتنی ئیسلام لە ناویاندا باو بووە لەوانـە یزد بوخت (یەزدان پوخت) واتە: بوختەی یـەزدان. بـەڵام نـاوی کـچەکان هـەمان لایەنی گرتە بەر بەڵام زۆربەیان بـە ووشـەی دوخـت (دوختـەر - کـچ) دێـت وەك هورمز دخت (هورمز دوخت - کچی خوا) خوا و، ئازەر میدخت (کچی پاکیزە)[1].

وە ناوی فریشتەکان لە هەمان لایەنی ئاینەوە بەسەر منداڵەکاندا دابڕاوە و نـراوە، ناوی کوڕەکانیان ناوە (بوهرام - تراعنا، نرسی)، یان ناوەکەیان لە دوو ناوی لێکدراوی فریشتەکان پێك هێناوە وەکو (مهد نرسی) کە دوو فریشتەن (میترا و نیریوسنها).

وە ناوەکە هەندێ جار گەشبینی هەڵـدەگرن وەکـو پـیرۆز (سـەرکەوتو) و (نـام وپە)[2]، هەندێ جار ناوی وەها لە منداڵ دەنرا کـە مانـای نـەژاد پـاکی و نـەژادی بەرێز هەڵبگرێ وەکو شاپور (کوڕە شا - شازادە) و، ناوی پێ هەڵاوتن و مەدح بە زۆری بۆ کچان دادەنرا وەکو شیرین و وردك (گوڵ).

---

[1] من نازانم چۆن (ئازر میدخت) دەبێ بە کچی خاوێن. چونکە ئەم ناوەیە لـە سـێ ووشـە پێـك دێ و لێکدراوە (ئازەر) ئاگرە (مید) ناوە بۆ میدی دەوڵەتی کوردە میدییەکان و (خت) کورتەی (دختـد)ە واتە: کچ ! (وەرگێڕ)

[2] لە فەرهەنگی ئیریەن ڤەج (محمد ئەمین هەورامی)دا (وپە) کە ئاوا هاتووە (ڤەهیەهـ vahyah) یـان (ڤەهیاهـ) بە واتای (چاك) و (خاس) و، باش و (بەهـ) هاتووە، ئەم ووشەیە لە پارسـی کۆنـدا بـووە ڤەهو (vahu) لە سانسکریتیش دا بووە بە ڤەسو (vasu) بەڵام لە پەهلەویدا بووە بە (ڤێهـ veh). لە پارسی ئیمڕۆدا، ئەم ووشەیە بووە بە (خوب = xub) و لە ناو کوردەواریدا بە شتێکی زۆر باش و زۆر نایاب بۆ نیشانەی سەرسوڕمان، لە چاکی و نایابیدا بەهـ بەکار دەهێنرێ و دەوتـرێ (بـەهـ لـەو شتە نایابە!)، (بەهـ لەو میوە باشەیە!).

لەوانەشە هەر بەهـ بوبێ و بەرەو بەخ خۆی گۆڕیبی بێ. (وەرگێڕ)

زەردەشتییەکان لە ناونانی منداڵەکانیان تا ئەو کاتەی دوا گۆڕان بەسەر ئاینەکە داهات دەستیان بەم ڕێبازەوە گرت، ئەوەبوو ئاگر هاتە ناو عەقیدەیان وەکو ڕوگە و قیبلەیەك بۆ خواپەرستی و، وەکو هێمایەکی پیرۆز و هەست پێ کراو بۆ خوای گەورە لە بەرزایی خۆیدا و، کە ناویان لە منداڵەکان دەنا ناوی ئاگریان لەگەڵدا لێك دەدا وەکو (ئازر بزی) واتە: (ڕزگار بوون بە ئاگر)[1] و ئازەر خورشید ئازەر (ئاگری خۆر

[1] لە فەرهەنگی ئیریەن ڤەچدا سەرچاوەی ڕابردوودا هاتووە (ئاتەر atar) لە ئاڤێستادا بۆ چەند جارێ پان بووەتەوە ئەم وشەیە، بە واتای ئاور، ئاوێر، ئادر - دێی کلۆر - لە زمانی کوردی ئیمڕۆدا هاتووە. لە پەهلەویدا بووە بە (ئاتەرش atars) و بوویشە بە (ئاتۆر ator)، ئەوەی لە زمانی کوردی ئیمڕۆ ئاڤێستادا بەدی دەکرێ ئەوەیە ئاوبەندی (تە = ta) و لە وشەی (ئاتەر)دا بووە بە (گ = g) و (و = w) و (وی = we) لە زمانی کوردیدا. لە زمانی کوردی ئیمڕۆدا بە تایبەتی لە هۆنراوەدا زۆر نەبێ کەم ئەم وشانەی هاوواتای (ئاتەر = atar)ە بەم جۆرانە بەکارهێنراون بۆ وێنە وشەی (ئایر) مەولەوی دەڵێ: (دوریت ئایروست وە یانە لەوی من یانێ یانەی دڵ ویرانەکەی من

هەوا ئایرین سەروەخت ئایرین          دڵە ئایرین بەخت ئایرین

مەحوی وشەی (ئاگر) و هی ئاتەشی بەکارهێناوە. ئەمانەش ئەوانەن: غەمم دێتێ کە بۆ وەك کۆدەك ئاگر بەردە مەناکەز

لە بۆ نوسینی غەمناوی دڵم هەرگا قەڵەم دادەم (ل: ٢٢٧)
(سەکینەی مەرتەبەی سوتانیە ئاتەش پەرستی عیشق)
ئەگەر ساحیب ئیرادەت بێ عەجەب پیرێکە پەروانە (ل: ٢٧٨).

وە وشەی (ئازر) وشەیەکی قورئانیە و باوکی ئیبراهیم ناوی (ئازەر) بووە وەکو لە کتێبی (ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد/ئیحسان نوری پاشا)دا (وەرگێڕان لە فارسییەوە (حەمە کەریم عارف)دا (ل: ٩٠) و (چ١/١٩٩٨)دا هاتووە: (ئەمرود و ئازەر) وشە گەلێکی ئارین، ئەمرود مانای نامرۆییە و، ئازەر مانای ئاگرە کە تا ئەمرۆش ئازەر بەکاردێنن).

بەو پێیە بە پیرۆز دانانی خۆر و ئاگر بەر لە ئیبراهیم لە ناو گەلی ئاریدا باو بووە و، جارەکی تریش دوای زەردەشتی کوڕی دەغد وڤای کچی ئیبراهیم خەلیك ئاینیان تێکەڵ بە پیرۆزی ئاگر بۆتەوە. کریستن لە (ایران در زمان ساسانیان/ل: ٥٥)دا دەنوسێ: (ئاینی کۆنی ئاریەکان سروشت پەرستی بووە). وە درزمیل لە (تاریخ تمدن ایرانی)دا دەڵێ: (بیرو زانیاری زەردەشت گەشە کرد و ئازایانە بوو بەڵام چارەنووسی بە هەمان چارەنووسی ئاینەکان تر گەیشت). (ڕابردوش ئاماژەمان بەمە کردووە).=

ئاگر) و هەتا کوڕەکانیشیان بە ناوی پەرستگای ئاگری گەورە زۆر بووە وەکو (کشنسب فر) (واتە مرۆڤی کشنسبی) کە ڕێز و پایەی ئەوی هەیە.

منداڵ تا (٥) ساڵی لە باوەشی دایکی دایە و بەخێوی دەکات پاشان باوك تا حەوت ساڵی دەیگرێتەخۆ و بەخێوی دەکات، لە (٧) ساڵیدا دەست دەگرن بە پەروەردە و فێر کردنی و، ئەوەی ئەو ئەرکە لە ئەستۆ دەگرێ پیاوانی ئاینی و، مامۆستایانی هاو ئاینن و، کەرەستەی وانە و خوێندنەکەش بیروبڕوای ئاینی دەگرێتەوە بەپایەکان و لقەکانیەوە و، هەم پزیشکی و، کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێو کردن و، هەندێ هونەری جەنگ وەکو سوار بوونی ئەسپ و تیر و ڕم هاوێژی، بەڵام فێرکردنی کچان فێر کردنی ئاین و ماڵداری بووە و، ڕێگاش بە هەندێکیان دراوە هەندێ لە زانیاری ئەزمونیدا قوڵ ببنەوە بەڵام بێ پسپۆڕ و بلیمەت بوون لە ناویدا.ئەگەر ئەوەی هیرودتس ئاماژەی پێ کردووە ڕاست بێ پەیوەستی بە ڕاستگۆیی و خۆشەویستی ڕاستەقینە بەشێ بووە لە بڕیارە وانەییە سەرەکیەکان لە تەمەنی (٥- ٢٠) ساڵیدا، واتە وەك بڕوا وایە لێرەدا شتێ نەبووە هۆکارێ بێ بۆ بێ ئابڕوویی و ڕیسوایی وەکو درۆ و فێڵ کردن لە خەڵك و، پەیمان شکێنی و، بەڵام ڕاستی ویستن و ڕاستەقینە پێویستە لە دڵی بڕواداردا لە خۆر درەوشاوە تر بێت.

هیرودوتس دەڵێ: (شتەکی ڕێگە پێ دراو نەبوو کە باس لە شتێ بکەن کە کردنی حەرام بێ و، هیچ شتێ بە لایانەوە دزێو تر نەبوو لە درۆ کردن پاشان داواکردنی قەرزکردن، لە بەرچەند هۆیەك تایبەتی ترینیان چونکە قەرز ناچارت

= وە ووشەی (خۆر) کوردییە (فر) ئەگەر لە (ڤیرە vira) هاتبێ وەك لە فەرهەنگی ئیریەڤەچدا هاتووە (بە واتای مێرد، مێر، مرۆ، پیاو، مرۆڤ دێت و بەرامبەری ووشەی (man)ی ئینگلیزییە، ئەوەی کە پێویستە بوترێ ووشەی (ڤ) بەرەو دەنگی (م) چووە و، پاش ئەو بەسەربردن و تەمەنە، مێری ئیمڕۆ پارێزگاری ئاواز و واتا کۆنەکەی کردووە: بۆ نموونە ووشەی مێر سەبری بۆتانی دەڵێ:

جوتیان گەر شڤانن گەرپا لەو ڕەزڤانن
هەمی میر و میرخاسن یەك یەك گوڵی دناسن) (شین و شادی/ل: ١٨٤) (وەرگێڕ)

دەکات بە درۆ کردن) بە هەر حاڵ ڕێبازی پەیڕەو کراو لە فێرکردندا بەپێی قۆناغەکانی تەمەن دەگۆڕێت، لە قۆناغەکانی سەرەتاییدا قوتابی فێری زانست دەکرێ و، لە تەمەنی (١٠) ساڵیدا بڕیاری بەسەردا دەدرێ کەوانەکانی دەرخ بکات و دەورەیان لێ بکاتەوە و پیاندا بڕواتەوە، بەڵام زانیاری تاقیکردنەوەیی ئەوە قوتابی و خوێندکار بە هاریکاری مامۆستا دەیخوێنێ وەری دەگرێت و، لە (١٥- ٢٠) ساڵیدا - کە قۆناغی تەواو بوونی هزر و لەشە تەنیا ئەوەندەی لەسەرە چەند بەشێ لە ئاڤێستا لە ناوەڕۆکدا و، مێژووی باب و باپیران و پاڵەوانە ناودارەکانیان دەرخ بکات[1].

[1] لە ئیسلامدا تەمەنی (٧) ساڵی کراوە بە سەرەتا بۆ چوونە ناو قوتابخانە و فێرکردنەوەی وەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمێ: (مروا اولادكم بالصلاة وهم ابناء سبع سنين، . . . ) رواه ابو داود والحاكم اسناده صحيح. واتە: فەرمان بە منداڵەکانتان بکەن کە حەوت ساڵین. لە (جامع الصغير/ للسيوطي) بە (اسناد الصحيح) هاتووە: (طلب العلم فريضة على كل مسلم) رواه ابن عبدالبر. واتە: داوا کردنی زانست فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێ، لێرەدا جیاوازی نەکردووە لە نێوان کوڕ و کچدا. وە فەرمانی کردووە بەوە کە منداڵەکان فێری وەرزش و مەشق و هونەری جەنگ بکرێن: (علموا ابناءكم السباحة والرماية. . . ) رواه الفردوسي/ حسن. رواه الفردوسي/ حسن. واتە: کوڕەکانتان فێری مەلەوانی و هاویشتن بکەن. وەك لە (مدخل علم النفس/ د: لندال وافيدوف) دا هاتووە: (پیاجی) قۆناغی هەستە جوڵەیی (الحسعريكه) لە کاتی لە دایك بوون تا دو ساڵ دادەنێ و قۆناغی دووەمی گەشەی هزری بە نە ئاوزان دادەنێ کە لە (٢-٧) ساڵە دایە منداڵ زمانی گەشە دەسێنێ و لە تەنەکان تێ دەگات. وە دکتۆر هیوا ئەحمەدیش لە (دەروونزانی)دا ئاماژەی پێ کردووە کە نووسراوی (و. ب. گۆتەریچ)ە. وە پێغەمبەریش (ﷺ) بەر لە بیاجیە باس لەم قۆناغی دووەمە دەکات و، قورئانیش قۆناغی یەکەم باس دەکا و دەفەرمێ: (وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ) / واتە دەبێ دوو ساڵی ڕەبەق شیر بە منداڵەکانیان بدەن. ئیمڕۆش مرۆڤایەتی لە (٧) ساڵیدا منداڵەکان دەنێرنە خوێندنگا و قوتابخانەکان. (وەرگێڕ)

## چوارەم: جەژنە ئاینیەکان:

زەردەشتی ئیمڕۆ دەڵێن: جەژنی ئاینی پێشینەکانیان (٧) دانەیە کە خوای گەورە ڕێگای پێداون شادی و ئاهەنگی خۆی تێدا بگێڕن و، یەکەم کەس کە بەردی بناغەی دانا زەردەشت بوو، کە بە درێژایی ساڵەکان پیرۆزی و گەورەیی وەرگرت کە گوێ پێ نەدان و کەمتەرخەمی کردن تێیدا گوناهـە و سـزای بکـەرەی ی دەدرێ وەکـو چـۆن لەسەر گوێ پێ نەدانی پەرستن فەرزە شەرعییەکان سزا دەدرێت. سەرەڕای ئەوەی کە زۆربەی جەژنەن کۆنـەکانی فارسـەکان[1] تـا ئەندازەیـەکی زۆر مـۆرکی ئـاینی پێـوە دیاربوو وەك هەموو شتەکانی تر لە ژیانیادا بەڵام دوو جەژنیان دەتوانین تا ڕاددەیـێ بە دڵنیایی وەربگرین کە ئەو دوانە خوای گەورە شەرعییەتی پـێ داون و، زەردەشـت بناغـەکانی شـادی تێـدا دانـاون، بـەڵام پاشاوەکـانی تـر لـەم جەژنانـە جەژنـەی کۆمەڵایەتین و بە هاتنی چاخەیەك بـە دوا یەکەکانـدا گـۆڕاون بـە چـەند جەژنـەکی میللی کە شادی خۆی تێدا بکەن و، هەردەم بە وەرزشی کەشتیارییەوە بەند بوون لـە کاتی هاوینە و زستانەدا و، پاشان کردویانن بە جەژنی ئاگر.

ئەوەی لێرەدا باسی دەکەین پیشاندانی جەژنی نەورۆز و میهرگـان (المهرجـان)ە کە گەورەترین جەژنن لای زەردەشتییەکان و، ئەم دوانە هێـشتاش زەردەشـتی لـە ئێران و هینددا بایەخەکی گەورەیان پێ دەدەن.

---

[1] محمد ئەمین هەورامی دەڵێ: (بە شێوەیەکی ئاشکراتر، پارسەکان هەروەکو چۆن کوردستانیان بـە زۆر داگیر کردووە کردویانە بە وڵاتی خۆیان، بەم جۆرەش سەروەرت و سامانی کەلـەپوری و ڕۆشـنبیری میدیەکانیان بە ناونیشانی خۆیانەوە تۆمار کردووە).

(فەرهەنگی ئێریەن ڤەچ/ ل: ٦). بەو پێیە دوای ڕوخـانی دەوڵـەتی میـدی لەسـەر دەسـتی کوشـی پادشای فارسەکاندا ئەم کلتورە بە فارسی کراوە. (وەرگێڕ)

## (نەورۆز)

نەورۆز ووشەیەکی فارسی کۆنە و لە دوو ووشە پێك دێ (نو) واتە نوێ و (روز) واتە ڕۆژ، بە مانای ڕۆژی نوێ دێت[١].

وە ڕۆژی نەورۆز وەکو جەژنێ بەپێی ڕۆژ ژمێری فارسی کۆن ١٦ی مانگی فروردینە کە هاوکاتی ٢٧ی مارسە لە هەموو ساڵێکدا .

لە جەژنی نەورۆزدا موسڵمانان لە جەژنەکانیاندا چی دەکەن لە جەژنەی ئاینیاندا ئەوانیش وا دەکەن[٢] بەیانی زوو لە خەو هەڵدەستن، چونکە بڕوایان وایە

---

[١] بەڵام (محمد ئەمین هەورامی) لە فەرهەنگی ئیریەڤەجدا دەڵێ: (نو nu) ئەم ووشەیە بە واتای (ئێستا، ئێستە - نوکە - هەنوکە) هاتووە لە ئینگلیزیدا ووشەی (ناو = now) لە هەمان واتا هاتووە، بۆیە بۆمان هەیە بڵێین بە هەردوکیانەوە لە یەك ڕیشەوە وەرگیراوەیان یەك ڕیشەیان هەیە، لە هیندی کۆندا ئەم وشەیە بووە بە (نونەم nunam) و لە پالەویشدا بووە بە (نوون nun) و بە بلو جیش (نرو = nu) یان (نوون = nun) ە. لە پارسی ئەمرۆدا بووە بە ئەکنون (aknun).

سەبارەت بە (ڕۆژ) دەڵێ: (ڕەویە raocha) ئەم ووشەیە ئاڤێستاییە بە واتای ڕۆشنایی، (ڕۆژ) ڕۆحیار هاتووە، ئەم ووشەیە لە پالەویدا بووە بە (هڤەرخ شیت hvarxshit) لە پارسی نوێشدا خورشیدە (xurshid). ئەم ووشەیە لە هیندی کۆندا بووە بە (ڤرەج vraj). و بە هۆی ئەم ووشەیەوە واتە ووشەی ڕەوچە و هەندێ ووشەی تری ناساکار دروست بوون وەك (ڕەوچەنە raocana) کە بە واتای (ڕۆژن)، (رۆچن)، (کلاو ڕۆژن)، (کلاو ڕۆژچن)، (دەلاقە) هاتووە. بۆ وێنەی (ڕۆژ) بێکەس دەڵێ:

(خەیاڵاتی شەو و ڕۆژم میللەتی کوردە
تەمەنام لای خودا دائیم ژیانی میللەتی کوردە) (وەرگێڕ)

[٢] ئاشکرایە لە ئاینی ئیسلامدا دو جەژنە ڕەسمییەتی یان پێدراوە و کراون بە (سونئەتی (مؤكدة) کە جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربانە. جەنگی ڕەمەزان بە بۆنەی مانگی ڕەمەزانەوەیە کە قورئانی تێدا دابەزیوە وەکو دستور بۆ مرۆڤایەتی و، جەژنی قوربانی کە یاد و بیرەوەری ئیبراهیم و ئیسماعیلە. بەڵام لێرەدا مانای ئەوە نییە کە ئیسلام ڕێزی لە بۆنە و یادی تری ئاینی و نەتەوایەتی نەگرتووە. بۆ نموونە: (مسلم) لە (صحیح مسلم/ عدد/١٢٧ (١١٣٠)دا گێڕاویەوە: (پێغەمبەر (ﷺ) هاتە مەدینە بینی جولەکەکان بە ڕۆژون لە عاشوڕداو، پرسیاریان لەو بارەوە کرد؟ ووتیان: لەو ڕۆژەدا خوا موسا و بەنو ئیسرائیلی بەسەر فیرعەوندا سەرخست. ئێمە بۆ گەورەیی ئەوە بە ڕۆژو دەبین. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (نحن اولی بموسی منكم فامر بصومه). واتە: ئێمە نزیکترین لە موسا لە ئێوەو فەرمانی دا بە گرتنی ڕۆژوەکە. لە فەرموودەی تری (مسلم/ ١١٢٦)دا هاتووە دوای هاتنی فەرزییەتی ڕەمەزان (ان عاشوراء يوم من ايام الله، فمن شاء صامه ومن شاء تركه). لێرەدا نوسەر نەورۆز بە جەژنەکی ئاینی زەردەشتی دادەنێ، یان ئەوەتا بە دوری نازانێت. بۆ مەسەلەی نەورۆز مێژو بیروبۆچونی جیاجیای هەیە، هەندێ دەڵێن: ڕۆژی سەرکەوتنی کاوەیە کە لەگەڵ فەرمیدوندا ئەژدیهاکی ستەمکاریان لەناو بردو، هەندێ مێژوونوسی تر دەڵێن: ئەم جەژنە ڕۆژی نوێ بونەوەی ژیانە کە نوح لەو ڕۆژەدا لەسەر جودی کەشتی نیشتەوە کە لوتکەیەکی زنجیرە چیاکانی ئەراراتە. (وەرگێڕ)

کە بەختەوەرترین ساتەکانی ڕۆژی جەژن ساتی بەرەبەیانە و بە سەیر کردنی پیرۆزی وەردەگرێ و، پاشان خۆیان دەشۆن و، خۆیان پاکژ و بۆن خۆش دەکەن و، جل و بەرگی نوێی سپی کە بە تایبەتی بۆ جەژنەکە دەیکرن و، پاشان بە تەنیا نوێژی بەیانی دەکەن و لە خوا دەپاڕێنەوە بۆ بەزەیی هاتنەوە بە خۆیان و خاووخێزانیاندا و، داوای لێ بووردن لەو گوناهانە دەکەن کە لەمەڕ ئەودا کردویانە و، ئەو گوناهانەش کە ساڵی ڕابردوو ئەنجامیان داون.

دوای ئەوە بۆ نزیکترین پەرستگ دەڕوات و لەگەڵ برایانی ئاینیدا کۆدەبێتەوە بۆ نوێژی جەژن بە کۆمەڵ و، لە نوێژدا پاڕانەوەی زۆر دەکەن کە لە بازنەی داواکردنی ڕەحمەت و ڕەزامەندی ناڕواتە دەر و، دوای تەواو کردنی نوێژ ئەوەی لایەتی لە خێر و چاکە بەسەر هەژاران و نەبوواندا دابەشی دەکات و، ئەنجا سەردانی خزم و دراوسێیانی دەکات و، جەژنە پیرۆزییان لێ دەکات و، پاشماوەی تری ڕۆژەکە لەگەڵ خێزانی خۆیدا بە خۆشی و کامەرانی دەیباتە سەر.

لە ڕۆژی دووەمی جەژن تا شەشەم ڕۆژە خەڵکی لە شوێنی گشتی و باخچەکاندا کۆدەبنەوە، وە لە ماڵەکان و، خواردنی گرانبەهایان پایە و، جیاوازی هەژار و دەوڵەمەند نییە و، لەو کۆبوونەوانەدا جیاوازی لە نێوان منداڵانی ئاینەکەدا نامێنێ و، دوبەرەکی و دوژمنایەتی نامێنێ و، دۆستایەتی نوێ دەبێتەوە و، خۆشەویستی لە نێواندا دەردەکەوێ وەك یەك گەل کە بڕوا کۆی کردونەوە، وە شەریعەت شیزازەی کۆمەلایەتی بەهێز کردون.

زەردەشتی ئیمڕۆ بە تایبەتی هی هیند لە هەمان ڕۆژدا ئاهەنگ دەگێڕن و، بەڵام بە جەژنی پاتیت (paitit) ناوی دەبەن واتە جەژنی تۆبە و پەشیمانی، کە زۆربەی ئەم نوێژە و دوعا و خوێندنەوەکانی داواکردنی لێ بووردنە لە تاوان و دان هێنانە بە گوناهەکان و نوێ کردنەوەی بیروبڕوایە.

ئەوەی مەجوسی هیند دەیکات لە جەژنی تۆبە و پەشیمانی دا و، هەمان کارە فارسەکانی کۆن کردویانە لەگەڵ گۆڕانەکی کەمدا و، هەریەکە لەوانە زوو لە خەو هەڵدەستێ و، بە ئاوی پاك خۆی دەشوات و، نوێژەکەی دەکات بۆ بەرز ڕاگرتنی

خوا و داوای لێ بووردن لە گوناهەکانی دەکات کە بە درێژایی ساڵی ڕابردوو کردویەتی و، پاشان بەرەو پەرستگا دەڕوات و ئامێزە دارەکی سندڵ هەڵدەگرێ بە دیاری بۆ پەرستگای دەبات، لێرەدا دەست بە نوێژ دەکاتەوە تا خۆشەویستی خوا و ڕەحمەتی ئەو و بەزەیی ئەو بگێڕێتەوە ئەگەر نوێژ تەواو بوو خێرەکە بەسەر پیاوانی ئاینی هەژاردا دابەش دەکرێ کە ئاینی زەردەشتییان پەسەندە و، پاشان بە سەردانی دراوسێ و خزم و نزیکانی هەڵدەستێ و، پاشماوەی کاتەکەی تر لەگەڵ خێزانیدا بە خۆشی و کامەرانی دەباتە سەر.

ئەو داستانەی بەیرونی دەیگێڕێتەوە لە بارەی جەژنی نەورۆز لە ڕۆژانی ساسانیدا[1] کە ماوەی گەشە کردنی دووەمی ئاینە و لە ماوەی گەشە کردنی یەکەمیدا کە لەسەری بووە جیاوازە، هەم لە حاڵەتی ئیمڕۆش و، بەم چەشنە وەسفی حاڵەتی ڕۆژی جەژنەکەیان دەکات:

(لەم ڕۆژەدا بەیانی زوو لەخەو هەڵدەستن لەبەرئەوەی وایان دەزانی و لە ناو کەسانی گەدا و ئاسایی داوا باوبوو کە لەم ساتەدا بەختەوەریەکان دابەش دەکرێن بەسەر زەویدا و، لەو ساتەدا پاڕانەوەکانی زەردەشت بە پەروەردگاری دەگات و، لەو ڕۆژەدا خوا لە دروست کردنی گەردون دەستی بەتاڵ بووە و تەواوی کردووە، بەر لە قسە کردن پارچە شیرنایەتییەکیان دەخوارد و، سێ جار هەنگوینیان نۆش دەکرد و، لەشیان بەڕۆن دەهەنوێ و، سێ مۆمیان دەکرد بە بخور و دووکەڵ تا لە نەخۆشی و بەلا بیان پارێزێت.

---

[1] ئیمڕۆ کوردەکان و زۆر لە گەلانی دنیا وەکو عەرەب و فارس و تورك و میسریەکانیش یادی نەورۆز دەکەنەوە و عەرەب بە (عيد الشجر) ناوی دەبەن. بەیهەقی لە (هشام بن محمد بن سيرين) گێڕاویەوە کە (دیارییەکی نەورۆز بۆ ئیمام عەلی (ﷺ) هێنرا و، فەرمووی ئەوە چییە؟ وتیان ئەی ئەمیری موسڵمانان ئەمە نەورۆزە. فەرمووی: (فاصنعوا كل يوم نيروزا). واتە: هەموو ڕۆژێ بکەنە نەورۆز. وە لە سەردەمی عەباسیەکاندا (متوكل) کردویەتی و دیاری بۆ خەلیفە دەبرا لە بەغدادا وەکو لە کتێبی (الحضارة الاسلامية في القرن الهجري /ج٢/ل: ٢٩٣/ط بيروت/آدم متز)دا هاتووە و نووسەر ئاماژەی بەمە نەکردووە. (وەرگێڕ)

دوای ئەوە لە ماڵیان دەردەچون و دەهاتنە سەر ڕووبار و جۆگەکان، یان ئاوێ لەبەری بڕوات گەرماویان دەکرد و، بەسەر خۆیاندا دەپڕژاند بۆ پیرۆزی و، خەڵکی ئاویان بەیەکتردا دەپڕژاند، چونکە ئەو پڕژاندنە لە ئاستی خۆپاکژ کردنەوەدایە لە دوکەڵی ئاگر و ئەو پیسیەی لە ئاگر کردنەوەدا پێوەیان لکاوە و تووشی هاتوون، چونکە ئەم نەخۆشی و پەتایەی پەیدا کردووە و پیسی کردووە لایدەبات لە هەوادا).

ئەمە هەمووی لە ئاستی میللیدا، بەڵام لە ئاستی فەرمی و میریدا دەوڵەت شەش ڕۆژ بە دوای یەکدا ئاهەنگی جەژنەی دەگێڕا کە گەورەترین دیاردەی هەڵکردنی ئاگر بووە بە درێژایی ڕۆژانی جەژن و، گەدا و هەژاران پێداویستیەکانیان دابین دەکرا و، بەند کراوەکان و زیندانیان ئازاد دەکران و، چاوپۆشی لە تاوانباران دەکرا و، ڕەوڕەوەی کار لە دەوڵەتدا لە کار دەخرا تا خەڵکی پشو بدەن و بە خۆشی و جەژنە شادمان بن.

بەڵام بەرنامە و پرۆگرامی پادشایان لە ڕۆژانی جەژندا بەم شێوەیە بووە:

١- لە ڕۆژی یەکەمدا پادشا جاڕێ دەدات بە ناو خەڵکدا کە لە کۆشك دادەنیشێ تا پیرۆزبایی لە خەڵکی ئاسایی وەربگرێت و، ڕێگا لە کەس ناگیرێ و، لەوێدا دیاری پێشکەش بە پادشا دەکرێ.

٢- ڕۆژی دووەم پێشەوازی لە خەڵکی پایەدارتر لەوانە دەکرد وەکو کوێخا و خانەدانەکان.

٣- ڕۆژی سێیەم پێشەوازی لە پیاوانی ئاینی گەورە دەکرد.

٤- ڕۆژی چوارەم پێشەوازی بنەماڵە و خێزان و نزیکان و تایبەتکارانی دەکرد.

٥- ڕۆژی پێنجەم بەخێر هاتنی منداڵەکانی و وەچەکانی خۆی دەکرد بەپێی لێوەشانەوەیان ڕێزی دەگرتن و پلە و بەهرەیان پێ دەدان.

٦- لە ڕۆژی شەشەمدا وەك بەیرونی دەڵێ نەورۆزی بۆ خۆی دەکرد هاودەمانی خۆی نەبێ یان ئەوانە نەبێ کە شایستەی ئەوەن بچنە لای پێی نەدەگەیین و،

فەرمانی دەدا کە ئەو دیاریانەیانەی بۆی هێنراوە ئامادە بکرێن و، لێکیان جیا بکاتەوە و، ئەوەی مەبەستی بێ لە گەنجینەکەیدا هەڵی بگرێت).

## (میهرگان)[1]

شەش مانگ و نیو دوای نەورۆز زەردەشتیەکان ئاهەنگی جەژنی میهرگان دەگێرن، جەژنی میهرگان یەکێکە لەو جەژنانە کە هیچمان پێی نەگەیشتووە کە ئەو ئاهەنگانەی لەناویدا دەکرێ پەیوەستی بکات بە زەردەشتەوە، تا گریانکاری ئەم جەژنەیە لە ڕووی دەینەوە هیچمان بە دەستەوە نییە ڕێنوێنیمان بکات بۆ ئەمە تەنیا ئەوە نەبێ کە سەلمانی فارسی بۆی گێڕاوینەوە (ﷺ) کە دەفەرمێ: (لەسەردەمی زەردەشتییەتدا دەمان ووت خوا لە نەورۆزدا جوانی بۆ بەندەکانی دەرهێناوە لە یاقوت و، لەمیهرگاندا لە زەبرجەد و، ڕێزی ئەو دو جەژنە بەسەر ڕۆژانی تردا وەکو ڕێزی یاقوت و زەبرجەدە بەسەر تەواوی خشڵەکاندا).

زانایانی ئاینی زەردەشتی خجت لەسەر ئەوە دەکەن کە ئەم جەژنە پەیوەستە بە زەردەشتەوە و دەڵێن: (خوا پەیمانی ڕووناکی و تاریکی لە ڕۆژی نەورۆز و میهرگان وەرگرتووە).

یەکێ لە پیاوان و کەشتیانی زەردەشتی لە ڕۆژانی حوکمڕانی عەبباسیدا دەڵێ: (ئەگەر ڕۆژی میهرگان هات و خۆر بە دوسەری ناوەڕاست دەرکەوت و، ڕوناکی و تاریکی، گیانەکان لە جەستەکاندا دەمرن بۆیە فارسەکان (بە میرکان) ناوی دەبەن).

قسە و باسی زانایان هاودەنگی بڕوای فۆلکلۆری میللییە لە پەیوەست کردنی سیمای ئاینی و خواپەرستی بە جەژنەوە و، دەڵێن: (لە ڕۆژی میهرگاندا خوا زەوی

---

[1] Mitragan (میهرگان) لە فەرهەنگی عەمیددا وشەیەکی پالەوییە مانگی میهـ :   پایزە و، ڕۆژی شازدەی مانگی میهرە و، جەژنەکی کۆنە کە پارسان ڕۆژی (١٦تا٢١)ی مانگی میهر بەرپایان کردووە و، دوای نەورۆز بە گەورەترین جەژن دانراوە. (وەرگێڕ)

پانراخست و، لەشەکانی وەکو ئارامگایەك بۆ گیانەکان دروست کرد و، لەو ڕۆژە بە ڕوناکی خۆی بەرەبەیانی بە بەهاو شکۆی خۆی داپۆشی دوای ئەوەی گۆیەکی تاریکی بێ ڕوناکی بوو، بۆیە وتراوە مانگ لە میهرگاندا لەسەر خۆر دەردەکەوێ و، بەختەوەرترین و پڕ سانس ترین ساتەکانی ڕۆژ ساتەکانی بەرەبەیانە).

هەر کەسێ مێژووی جەژنی میهرگانی نوسیوە لەسەردەمی ساسانیدا، هەروەها دوای ئەوە نوسیویەتی، هیچ شتێ بەر لە داگیر کردنی ئەسکەندەری مەقدونیدا بۆ وڵاتی فارس نازانرێت ئەگەر بە (اجتهاد)یش بێ، بەیرونی دەڵێ: (بە گشتی فارسەکان ڕۆژی جەژن زوو لە بەیانیان دەکردەوە و، شتێکیان لە هەنار - نارۆك - دەخوار و، بۆنی گوڵاویان دەکرد، چونکە بڕوایان وابو هەر کەسێ وا بکات زۆر بەڵا و کارەساتی لە کۆڵ دەبێتەوە، بازاڕەکی گەورەی تێدا دادەنرێ بە هەموو شتەکی شادمان کەر و دڵخۆشکەر دەڕازێنرێتەوە).

پاشایانی ساسانی بە ئاهەنگی هێمایی بەشداری خۆشی و شادی ئاهەنگەکەیان دەکرد و، تاجەکیان دەنایە سەر کە وێنەی خۆری لەسەر بوو لەسەر گالیسکەیێ ڕۆنرا بوو کە بە دەوریدا کێشرا بوو، چونکە خەڵکی سادە بڕوایان وا بوو کە خۆر یەکەمجار لەم ڕۆژەدا بۆ جیهان دەرکەوتووە و، بەر لە دانانی تاج لە بان سەردا وەکو نەریتەکە وابوو پیاوێ بە حەوشەی پادشادا هاوار دەکات، ئەمەش لە بەرەبەیاندا و دەڵێ: (ئەی فریشتەکان دابەزن، شەیتانەکان و خراپکاران قەدەغە بکەن و لە دنیا دەریان بکەن).

بەڵام پاشماوەی تری جەژنەکان زۆربەیان بۆنەی کۆمەلایەتی ئاساین و، بە درێژایی ڕۆژگار سیمای پەرستنیان وەرگرتووە بۆ نموونە جەژنی (ڕە پی‌ئوان) تەنیا بۆنەیەکی کۆمەڵایەتیە خەڵکی بە هاتنی وەرزی هاوین ئاهەنگ دەگێڕن، بەڵام قوڵایی ئاین پەروەری لای فارسەکان و دەسەڵاتی ئاین لە واقیعی ژیاندا شوێن و نیشانەی ئاینی کەوتووەتە سەر و گۆڕاوە بە جەژنێکی ئاینی گەورەی وەك نەورۆز، ئەنجا ئاهەنگەکی

گەورەی بۆ بەرپا دەکرێ و سەرجەم موسڵمانان لە پەرستگای سەرەکی شاردا ئامادە دەبن، نوێژی تێدا دەکرێ و نزا و پاڕانەوەی تێدا دەخوێنرێتەوە.

نموونەیەکی تریش جەژنی (خورەم روز)ە واتە: (ڕۆژی فەڕ و بەختەوەری) لەوێدا پاشا لە دەشتدا لەسەر ڕایەخەکی سپی دادەنیشێ و، بەرگەکی سپی پۆشیوە و، پادشا لەوێدا ڕێگری و ترسان لە پادشا و سام کردن لێی ڕەفز دەکات دادەبەزێتە ناو کاری دنیا و خەڵکەکەی و، کێ پێویستی بێ کابرا بەرز بێ یان نزم بێ لێی نزیك دەبێتەوە، قسەی لەگەڵدا دەکات بێ ڕێگرتن لێی، لەگەڵ کوێخا و کەشتیاران دادەنیشێ و خواردن و خواردنەوەیان لەگەڵدا دەخوات و، دەڵێت:

(من ئیمڕۆ وەکو ئەندامێکم لە ئێوە، چونکە ڕاگری و وەستانی دنیا بە هۆی ئەو ئاوەدانییە ئێوە بە دەستی خۆتان دەیهێننە دی و، وەستانی ئاوەدانیش بە پادشایە و، هیچیا بێ‌ی یەکتری نابن، کەواتە من و ئێوە وەکو برایەکی پێکەوە گونجاوی یەکترین، نەخوازەلا ئەوە لە دوو برای پێکەوە گونجاوەوە ڕوودەدات).

دوای ئەوەی ئاگر چووە ناو خواپەرستییەوە، جەژنی ئاگر شێوەیەکی کۆمەلایەتی وەرگرت و، کە نیشانەیەکی لە ئاینی گۆڕاوی تێدا بێت. بۆ نموونە جەژنی (ئازەر جەژن) واتە: (جەژنی ئاگر) بۆ نموونە نە ناو شاردا لەگەڵ هاتنی وەرزی زستاندا ئەم جەژنە ئاهەنگی بۆ دەکرێت و، نموونەی وەك نموونەی جەژنەکانی تری وەرزییە و، ئاگر دەکەنەوە و پەرستنی زۆری بۆ دەکەن و بە گەورەی ڕادەگرن و، ئەنجا لە دەوری خواردن کۆ دەبنەوە و، وا دەزانن ئەمە هەمووی بۆ لابردنی سەرما و وشکییە کە لە زستاندا ڕوودەدات و، بلاوبوونەوەی زیان لە ڕووەك لادەدات)[1].

---

[1] هەرچی دکتۆر (معین)ە لە (مزدیسنا وا دب پارسی)دا دەڵێ:

(موسڵمانانی ئێران زەردەشتییەکان بە ئاگر پەرست ناوەزەد دەکەن چونکە پیرۆز سەیر دەکەن، بەلام ئەوان ئاگر بە خوایەکی تایبەتی نازانن، یان جۆرێك لە خواکان وەك لای فارسەکانی بەر لە زەردەشت هەبووە، بەڵکو ئاگر شوێنی ڕوگەی ئەوان بووە چۆن موسڵمانان ڕوگەیان کەعبەیە). وە هەرچی (جان=

## پێنجەم: بە خاك سپاردنی مردو:

سەرچاوەکانی زەردەشتی نوێ لە مەڕ تەقەلا و ئەو نەریتانە قسە دەکەن کە لەگەڵ مردودا ئەنجام دەدرێن کە زۆر دورە لە شەریعەتی خوا کە دایناوە و، خەڵکی لە لوتکەی گەشە کردنی ئاینەکەدا و، دەسەڵاتی زانیارییە ڕاستەکانی دا لە ژیانیاندا پەیڕەویان لێ دەکەن. کە ئاڵۆزی و دژواری تێدایە نەك ئاسانکاری و سادەیی کە سیمایەکی هەموو ئاینە ئاسمانیەکانە.

یەکەم کارکە مەجوسیەکان (زەردەشتییەکان) دەیکەن لەگەڵ مردودا شوردنیەتی، ئەنجا کفن کردن لە بەرگەکی سپی پاکژدا و، ئەو کاتە (موبەز) یان دەستور کە مەجوسی هیند بەمە ناوی دەبەن دەخوێنرێتەوە لەگەڵ شتی تردا لە لایەن زانایانی ئاینەوە و، داوای لێ خۆش بوون بۆ مردووە کە لە خوا دەکەن، هەم ئاسانکردنی ڕێگا بۆ پەڕینەوە بەسەر (پرد - جنڤات)دا. ئەگەر ئەو کەسەی

---

=ناس)ە لە کتێبی (تاریخ جامع ادیان) دا (ل: ۳۰۹-۳۱۰)دا دەڵێ: (زەردەشت ئاگری نەدەپەرست و، بەڵکو بڕوای وەك هی باب و باپیرانی نەبوو لەمەڕ ئەم توخمە پیرۆزە و، لە مەڕ ئەمەوە بڕوای جیاواز بوو لەو باوەڕەی کە ئاگر پەرستانی دوای ئەو هەیان بووە، بەڵکو ئەو وای سەیر دەکرد کە ئاگر ڕەفرەکی پیرۆزە و، ئاماژەکی نرخ دارە لە لایەن ئاهورا مزداوە و، مرۆڤ دەتوانێ لە ڕێگەیەوە بگاتە حەقیقەتی بەرزی پەروەردگاری زاناوە).

هەرچی شێخ عەلی (ابن سینا)یە لە کتێبی (الشفاء، قسم الطبیعات)دا دەنوسێ: (چینەك لە پێشینان کە بڕوایان بە دژەکان (الاضداد) هەبووە و، وایان زانیوە کە دو دژیان دوو ئاکۆك دوو پرەنسیپی یان دوو بیرو بڕوان بۆ گشتی و، لەوەدا لای قسەی خێر و شەڕ و ڕوناکی و تاریکی یان گرتووە، لە گەورە دانانی ئاگردا زێدەڕەویان کرد و کردیانە شایانی پاك ڕاگرتن و بێ گرد ڕاگرتن، هەمووش لەبەر ڕووناکی و ڕۆشنایيەکەی و، وایان سەیر کرد کە زەوی تاریکە و ناوەوەی ڕوناك نابێتەوە نە بە کردار و نە بە هێز و بە شایانی بە کەم سەیر کردن و سەر کۆنەکردنیان زانی). بەم پێیە فکرەی ئاگر پەرستی لە بیرۆکەی دوانەخواییەوە سەری هەڵداوە لە بونەوەردا، هەم لە فەلسەفەی خێر و شەڕ و ڕوناکی و تاریکی. (خوا زاناترە)، (وەرگێڕ)

لەسەرە مەرگدایە هۆشی هەبێ دەتوانێ خۆی ئەم دوعایە بخوێنێ و، ئەگەر هۆشی نەبێ، کوڕی یان کێ لە هەموو کەسی نزیکترە ئەو لە جیاتیدا دەیخوێنێتەوە، یان پیاوەکی ئاینی تایبەت بە خێزانەوە.

بەهەر بارودۆخێ بێ ئامادە کردنی مردو بۆ دوا ئارامگایەکەی تایبەتە بە کۆمەڵە پیاوەکی ئاینییەوە کەس ناتوانێ جگە لە ئەوان پێوەی هەڵبستن و، ژمارەشیان سێ کەسە و، یەکەمیان ئەنجامی دەدا و دوانەکەی تر گەواهی بۆ دەدەن و، حەرامە ئەم سێ کەسە بڕۆنە ناو خەڵکەوە تا بە تەواوی کرداری پاکژ کردنەوە درێژ و ئاڵۆزەکە ئەنجام نەدەن.

هەموو ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە - وەکو باس دەکەن - دەرچونی گیانی پاکژ لە لەش، لاشەی مردو بۆ ماددەیەکی بوغزاوی و ڕقاوی و پیس دەگۆڕێ و، هەر کەس دەستی لێ بدات بۆی دەگوازرێتەوە، یان لێی نزیك بێتەوە، یان لە تەکیەوە دابنیشێ بۆی دەگوازرێتەوە، ئەمەش لە کاتی گیانەڵادا، بەڵکو هەتا ئەگەر لە دەست لە کەسێ بدەی دەستی لێ دابێ، یان لێی نزیك بوبێتەوە، یان لە تەکیەوە ڕۆنیشتبێت لەسەر هەموو ئەوانە ئەرکە خۆیان بشۆن لەو پیسی و تاوانەیە وەکو یەك زەردەشتییەکانی کۆن و تازە بۆمردو پەرێشان و خەمبار دەبن و، لە دیمەنی جیاجیادا ئازاری جیابونەوە دەردەبڕن، وەك بەپێی پەتی و خاوسی و سەر ڕۆتی لەگەڵ مردودا دەڕۆن و، خۆ خستن بەناو خۆڵدا و، جل بەرگی تایبەتی پرسە و، بەڵام لە ڕووی شەرعییەوە بە تەواوی نارەوایە لەسەر مردویان شین و گریان بکەن لە هەر ئاستێ دابێت وە گریان دەقی لە سەرەو، لە ئاڤێستادا هاتووە کە ئەمە کارێکی شەیتانە و، هاتووە: (شەشەم و باشترین وڵات کە من کە خوام دروستم کردووە هارویۆ (haroyu)یە کە نایابی شار و وەڵاتە و، ڕازاوەتەوە بە چاکترینی خەڵك شەیتانی پڕ ڕووی لە مردن کرد کە کاری منە و، وەسوەسەی بۆ بڕوا دارانی من کرد بە گریان و شین لەسەر مردوەکانیان).

وە لاشەی مردوو وەك مەجوس بڕوایان وایە بە ئاگر ناسوتێنرێ چونکە ئاگر پاکژ و پیرۆزە و، نابێ بە شتەکی پیس پیس بکرێ، یان لە خاکەکی خاوێندا بنێژرێت، چونکە خاك سەرچاوەی ڕۆزی خەڵکە و عەقڵ نایگرێ لاشەی لە ناخیدا بشاردرێتەوە، بۆیە مسۆگەر دەبێ کە شوێنەکەی لەسەر زەویدا دابنێن کە لاشەی مردوی تێدا دابنێن و ناویان ناوە بە (dkhama) واتە: (بورجی خامۆشی) کە شێوەی بۆریەکی لولەکی هەیە و دیوارەکانی بەرز و بێ سەقفن و، لە شوێنەکی دور و تەریك دا بنیات دەنرێ و، لەوێدا لاشەی مردویان دادەنێن، یان بە مانایەکی ڕونتر دێن لاشەی مردوو لەبەر خۆردا دادەنێن تا باڵندەی گۆشت خۆر گۆشتەکەی ببەن.

مەجوس (موگ- ماد) لە هەموو ئەو شتانەدا پشت بە ئاڤێستا دەبەستن کە مرد و ناشتن یان سوتاندن وەك وەسفی دەکات پێچەوانەی شەریعەتن و ئیلهامی شەیتانییە و، کارەکە لە کارەکا خراپەکانی ئەو، هەرچی خستنە ڕووی مردووە دەقی ڕاست و ڕەوانی لەسەر هەیە: (لێرەدا لەسەر لوتکەی چیاکان تەرمەکان و لاشەکان بۆ باڵندە گۆشت خۆرەکان لێ دەگەڕێن، وە بۆ چڵێس ترین گیانداری گۆشت خۆر و، بۆ داڵەکان کە خوا دروستی کردون و، دەڵێن، ئەم بڕوادارە پەشیمان دەبێتەوە لە هەموو ئەو گوناهو تاوانەی کردویەتی، تۆش بە تەنیا ئەی خوای بێ گەرد ڕێزی پەشیمانیەکەی دەگری و، بەم پەشێمانیە لێی خۆش دەبێت).

ئاپۆرە و مەڕاسیمی پرسە و سەرە خۆشی دوای گەیاندنی مردوو بە ماڵی دوایی دەست پێ دەکات و، خاوەن مردوو لەسەر زەوی دادەنیشن پێ خاوس و سەر ڕوتن و، سێ ڕۆژ پێشەوازی لەسەرخۆشی کەران دەکەن، بەڵام ژنانی کەسوکاری مردووەکە لە نزیك ئەو شوێنەدا مردووەکەی تێدا مردووە ڕایەخی بۆ ڕادەخرێ و پرسە و سەرە خۆشی لە ئاشنایان و خزمان وەردەگرێت و، (٣- ١٠) ڕۆژ درێژە دەکێشێت و، لە کاتی پرسەدا خێزانی مردووەکە و خزمەکانی هەموو خۆشی و جوانیەك لە خۆیان دەگرنەوە و، هەندێ جار بۆ دوو مانگ درێژە دەکێشێت.

ماوەی پرسەکە پەیوەستکراوە بەو بڕوایەی باوە لە ناویاندا کە گیانی لە سێ ڕۆژەکانی دوای مردنی دا دنیا چۆل ناکات، بۆیە نوێژ و خوێندنی پەیوەندی دار بەیەکەوە لەو ماوەیەدا بۆ دەکرێت، لە بەیانی ڕۆژی چوارەمدا گیانی جیهانی دنیایی بەجێ دێلێ و، بۆ دنیایەکەی تر دەڕوات کە داخوازی ئامادە کردنی ئاهەنگەکی ئاینی دەکات لە ماڵەوەدا یان لە پەرستگایەکدا، ئەمەش لە ئێوارەی ڕۆژی سێیەمدا و بەر لە خۆرهەڵاتنی ڕۆژی چوارەمدا و، خزم و کەسی مردوو ئامادە دەبن و، لەوێدا خێر و چاکە بەسەر هەژارندا دابەش دەکرێت و، ڕۆژی چوارەم بۆ ڕۆژو تایبەت دەکرێت، ئەمەش بۆ یارمەتی دانی گیان تا بەسەر پرد (الصراط)دا بپەڕێتەوە.

نەریتەکانی کۆن بنەمای شەرعی سادەیان تێدایە کە زێدەڕەوی و توندی و، ئالۆزی تێدا نییە و، کۆنی ڕۆژگار کاری تێ کردووە، هەم ئەم دەستکاریەی لە ئایندا کراوە، ئەنجا بە هۆی بێ ئاگاییەوە بووبێ، یان لە یاد کردن، یان دوری لە چاوگی ئاینی ڕاستەقینە، بەڵام ئەوەی لەگەڵ سوننەتی ئادەمدا نایەتەوە کە پشت بە پشت هاتووە سپاردنی جەستەی مردوانە لە بورجی خامۆشیدا (البرج الصامت) لە جیاتی بە خاك سپاردنیاندا.

ئاڤێستا بە ڕوونی ئاماژە دەکات کە دانانی لاشەی مردوان لەبەردەمی باڵندە گۆشت خۆرەکاندا شتەکی ئاینی نییە، بەڵکو (بورجەکانی خامۆشی - الابراج الصامتة) کردارە خراپەکانن و، لادانیان لە بون خوای گەورە پێویستی کردووە، لە بەندی سێیەمی (ڤەندیداد)دا هاتووە کە زەردەشت لە پەروەردگاری ئاوا دەپرسێ: (ئەی کردگاری دنیای ماددی، ئەی بێ گەرد، سێیەم شوێن کوایە کە زەوی پتر لە شوێنەکانی تردا تێدا خەمبار دەبێ، پەروەردگار وەڵامی دایەوە ئەو شوێنەی لە هەموو شوێنەك پتر بورجەکانی خامۆشی - الدخما - ی لێ بێت کە لاشەی مردوانی لێ بێت کە لاشەی مردوانی تێدا دادەنێن).

لە بەرامبەر ئەوەشدا کاتێ لێی دەپرسێ لەو پیاوەی زەوی زۆر دڵخۆش دەکات، پێی شادمان دەبێ، وەڵام دەداتەوە: (ئەو پیاوەیە زۆرینەی ئەو بورج و قەڵایانە دەروخێنێ کە لاشەی مردوانی تێدا دادەنێن و لەگەڵ خاکدا تەختیان دەکات).

لە شوێنەکی تردا لە بارەی پیاوێکەوە کە هەمان کار دەکات دەڵێت:

(کێ ئەو بورجانە تێك بدات ئەگەر لە قەبارەی لەشی خۆیدا بێ ئەو تێك دانە دەبێتە کەفارەت بۆی لە بری گوناهەکانی ئەو، ئەنجا گوناهەکان هزری بن یان گوتەیی یان کردەوەیی).

لە بەندی حەوتەمی ڤەندیدادا ئاڤێستا وا سەیری ئەو قەڵا و بورجەی لاشەکان دەکات کە ئەو جێگایانەن شەیتانەکان لە ناویدا بەختەوەر دەبن، چونکە پێچەوانەی سوننەتی ئادەم و ئەو شەریعەتەیە لە ناو کورەکانیدا ماوەتەوە تا قیامەت و لەگەڵ زەردەشت دەدوێ:

(لەسەر ئەو بورج و قەڵایانەی لەسەر زەوی دایدەمەزرێنن مردووی لەناودا دادەنێن پڕ لە شەیتانەکان دەبن و ئێوە پەرتیان دەکەن و، چۆن ئێوە شیو لێ دەنێن و گۆشتی برژاو دەخۆن شەیتانەکانیش ئاوا دەکەن، ئەو بۆنەی شەیتانەکان دەیکەن لەو قەڵایانەدا بۆنی خواردنی ئەوانە، ئەی زەردەشتی کارزان لەوایە بەختەوەری و شادی ئەوان).

دوای گەواهی دانی دەقە ڕاستەکانی ئاڤێستا گەواهی دانی مێژوونووسی یۆنانی (هیرودوتس) دێ تا دوپاتی بکاتەوە کە دانانی لاشەی مردوان لەبەردەم باڵندەی دڕندە و گۆشت خۆردا ئاینی زەردەشتی نییە بەڵام ئەمە زەردەشتی مادی و فارسی کردویانە بەر لە زەردەشت و دوای ئەوداو، تا ئەو کاتەی هیرودوتس ئەم مێژووەی لە بارەوە نوسیوە. نەریتی مەجوس وا هاتووە کە لاشەی مردوەکانیان بخەنە بەردەمی گورگ و باڵندەی گۆشت خۆر و هەرگیز نەیان نێژن، ئەمەش لەبەر هەمان بڕوای زەردەشتییەکان لە کاتی هەرەس هێنانی ئاینیاندا، کە بریتییە لە

پیس نەبوونی خاکی پاکژ لـە سەرچـاوەی بـژێوی سـەرجەم گیانلەبەرانـە، بـەڵام فارسەکان بەپێی بڕوای خۆیان (لەشی مردوەکانیان لـە مێـو دەگـرت و ئـەنجا بـە خاکیان دەسپاردن).

مێژوونوسـان گـەواهی دەری ئـەوەن کـە بـە خـاك سـپاردنی مـردوان لای زەردەشتیەکان لەسەردەمی ئەلیخییەکاندا کە حـوکمی فارسـەکانیان کـردووە بـە ئاینی زەردەشتی و لە زەمانی ئەواندا لـە خۆرهـەڵات و خۆرئـاوادا بـڵاو بـووە و، مردویان لە گۆڕدا دەشاردەوە کە لەسەر زەوی دەربکەوێت و، هەیانـە بـە دروسـت کردنی گۆڕستانەکان خۆی لە خوا نزیك خستۆتەوە.

لە کاتێکدا کوڕشی گەورە مرد گۆڕەکی بەردینی جوانی بۆ دروست کرا کە (٥٣)پێ بەرز بکرێتەوە، لەسەر بنکەیەکی بە پێ پلێکانە و، خودی بنکەکەشی هەر لە بەرد بوو، ژوورەکی بچوکی لەسەر بوو، حەوشە و شورەکەی ئەستور و بێ کولانکە بـوو، بانەکـەی لەبەرد بوو، تا ئیمڕۆ گۆڕەکە ماوە و، دەکەوێتە (بازاڕ جادە) لە ئێران.

لەبەر هەمان سوننەت لە ناشتندا بۆ (دارا)ش لە شوێنەکی کـە زۆر دور نـەبێ لە برسیولیس لە ئێراندا گۆڕەکی داتاشاوی بۆ دروستکراوە کە ڕووی لە تـاوێرەکی چیایە و، دەروازەکەی وا دروست کراوە کە ئەگەر کەسـێ سـەیری بکـات وابزانـێ ڕووی لە کۆشکێ کردووە نەك گۆڕێك و، لە لای دەروازەکەوە چوار سـتونی باریـك لە دەوری دەرگایەکی بەرز چەقێنراوە و، لەسـەر دەرگاکـەوە چـەند کەسـێ هەیـە وێنەی پادشای لەسەر هەیە و، تـا ئیمـڕۆش بـە گـشتی ئێرانیـەکان بـە نـەقش و نیگاری ڕۆستەم ناوی دەبەن.

ئەوەی باسکرا بەسیەتی بۆ دەرخستنی ئەوە کە زەردەشتییەکان نەك هەر گرنگییان بە گۆڕی مردوەکانیان داوە، بەڵکو بەڵگەشە لەسەر بایەخدانی ئەوانە کە ناشتنیان بە فەرز و سوننەت داناوە کە واجبە پەیڕەوی لێ بکرێ و، ڕێز و بـێ گەردییـەکی هەیـە وەکـو چـۆن فـەرز و سـوننەتەکانی تـر هەیانـە، ئـەوانیش لـەوەدا هیـچیان لـە ئادەمیزادەکانی تری ئەهلی کیتاب و ئەوانی ئەهلی کیتاب نین کەمتر نییە.

# بەندی چوارەم:

## (داروخانی ئاینی زەردەشتی)

ئاینی زەردەشتی بە واتای سادە و کرداری خۆی بە هۆی گەلی مادی و فارسی بە (٥٠٠) ساڵ بەر لە زاین گەشە کردنی بەخۆوە بینی لە ئاستی ڕەوشتیدا کە لە ژیانی هاوچەرخی ئەو سەردەمەدا هاوتایان کەم بێت و، پاکژی دەرون لە چڵکی ماددی و گیانی و، خۆشەویستی کار و ڕاستی و حەقیقەتی کرد بە تەوەری جوڵەی ژیان. هەمان واتا لە هەموو لایەکی ترەوە پەیوەست بووە بە ئاراستەیەکی ئاشکراوە بۆ ئاوەدانکردنەوە و شارستانی و گەشە کردن و، زۆربوونی وەچە و، سوود وەرگرتن لە خۆشیەکانی ژیان بە مام ناوەندی و بێ سنور بەزاندن و، لەو شتانەدا کە ئاین حەلاڵی دەکات و ڕێگای پێ دەدەن، بەلام ڕەبەنی و دورەپەرێزی لە ژیان دژ بەو واتایەیەو، هەم دژایەتی ئەوەیە.

مێژوونوسانی هاوچەرخ لەسەر ئەوە کۆکن کە ژیان لە فارسی کۆندا ئاین کاریگەریەکی گەورەی کردە سەر، تا سیمای ئاین هەموو ژیانی داگرت و، ئاین بووە دیاردەی گیانی سەرجەم ئومەت و، هەرچی فارسەکان پێی گەیشتن لە شارستانیەت و میثالیەت و نموونەی و هێز و ڕەوشت سۆنگەکەیان بۆ ئاینەکەیان گێڕایەوە کە سادەیی و کردەوە و لایەنی گیانی تێدایە. قورئان لە ناو باسکردنی پێغەمبەراندا ناوی زەردەشتی نەهێناوە[1] بەلام بەسەرهاتی (ذو القرنین)ی گێڕاوەتەوە یان کورشی گەورە کە یەکێکە لەو کەسانەی ئیسلامی زەردەشتی دارشت و جیا نەبێ لەو قالبەی ئیسلامی موحەممەدی دایڕشتبێ لە دوا پەیامی

[1] ئەگەر قورئان ناوی زەردەشتی نەدابێ ناوی ئاینەکەی داوە و لە ڕیزی ئەهلی کیتابی تردا دایناون کە بە (مجوس) ناوی بردون کە لە ووشەی (موگ - ماد)ەوە هاتووە، وەك (مسعود محمد) لە (لسان کرد) و (احسان نوری) لە کتێبی (ریشتەنی نزادی کردی)دا باسی کردووە و، (حمە کریم عارف) بە ناوی (مێژووی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد) وەری گێڕاوە.

ئاسمانییەکەیدا بۆ سەرجەم خەڵك، خوای گەورە ئەو واتا ئیسلامیە شاراوەیەی لە دڵیدایە و، میکانیزمی ژیانی ئەوە گێڕاویەوە و مێژووەکەی باسکردوە کە دەفەرمێ[1] (وَيَسْأَلُونَكَ عَنْ ذِي الْقَرْنَيْنِ قُلْ سَأَتْلُو عَلَيْكُمْ مِنْهُ ذِكْرًا(٨٣)إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي

[1] بە ڕاستی مێژو سەیرە و، بەشێکی زۆری واتا و لێکدانەوە هەڵدەگرێ، پیاو چاك دەکات بە پیاو خراپ و پیاو خراپ دەکات بە پیاوی چاك و، لەمەدا کێشە لە ناو مێژوونوساندا پەیدا دەکات. سەیر کە چۆن نوسەر ئەم پیاوە بە ناوی (کورش) بە زولقەرنەین ناوی دەبات، بێ ئەوەی ئاماژە بە بۆچوونی مەفەسیران و زانایانی تری مێژویی بکات لەمەڕ زولقەرنەین و کورشدا کە بە بڕوای من باس نەکردنی ئەم ڕاستییانە هەرچەند زۆر هەڵدەگرێ بە گوناهو تاوانی دەزانم، بۆیە بە کورتی دەڵێم بۆ واتای زولقەرنەین پێناسنامەکەی کێ بووە بۆچوون زۆرە هەندێ دەڵێن ئەسکەندەری گەورەی یۆنانی بووە کە دنیای داگیر کرد لەوانەش دەوڵەتی فارسی و کوردستان کە فارسەکان داگیریان کردبوو. وەکو لە (امارە بهدینان الکردیە/صدیق الدملوجی) باسی کردووە دەوڵەتی میدی یان مادی یەکەم کەس (ریوکس - دیوکس) دایمەزراند و، لەو دەوڵەتەدا زۆر گەورە پیاو هەڵکەوتن وەك کەی قوباد یان (دیاکۆ) ئەنجا کەی ئەخسار کەلەگەڵ شای بابل نەبولاسر هێرشیان کردە سەر ئاشوریەکان و روخاندیان. وە کەی ئەخسار ئەوەی نەبوخدنەسری بە ناوی (ئامیشیتس) دەخوازێت کە شای بابل بووە و لە (٥٨٦ پ. ز) مردووە. ئەنجا کوڕەکەی کەی ئستیاخ شوێنی کەوێ ئەخساری باوکی دەگرێ، بەڵام ئەو شایا وەکو باب و باپیرانی پیاو نابێ و گوێ بە دەوڵەتی ماد نادات و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کەس لە گەلەکەی بە دەورەوە نەمێنێ و کورشی فارسی تەماع بکاتە دەوڵەتەکەی و، بە دزییەوە پەیوەندی بە کاربەدەستانی ئەوەوە بکات و لە گەڵیاندا ڕێك بکەوێ و، بەم چەشنە حکومەتی میدی لە هەمەدان ڕووخا و، پاشان پاشماوەکەی تر (کەی بداخ) کۆی کردەوەو دەوڵەتەکی نوێی دانا و پایتەختەکەی (ئامانی - ئامێدی) بوو، بەڵام زۆری نەبرد ئەسکەندەری مەقدونی لە کاتی ڕابردنی سوپایەکەی بۆ وڵاتی نادیابن (٣٣١پ. ز) دەسەڵاتی بەسەردا گرت...). (بە کورت کردنەوەی).
کاتێ ئەسکەندەری مەقدونی دەوڵەتی ساسانی گرت ئاڤێستای سوتاند.
(ابو الکلام) لە (اثبات الوصیة)دا دەڵێ: (فەریدون کە بە دژی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کوردا (ل٦٦) دا دەڵێ: (زەردەشت ناوی موژدلموهایە و ڕەچەڵەکی دەگاتە سەر مەنوچەهری ئەوەی فەریدونی کوردی. ئێمە لێرەدا کارمان بەوە نییە کە ووشەی ماد - میدی - چۆن بووە بە کورد و، یان ووشەی کورد بووە بە مای و ماه) ئەوەی هیچ گومانێکی تێدا نییە ئەوەیە کە میللەتی ماد کورد بوونە). دەڵێ: (مان و، مانج و موغ هەرسێکیان ناوی یەك تیرە بوونە و ئێستا ناوی کرمانجی گرتۆتە خۆ). وە لە فەرموودەدا سەبارەت بە (نەبوخدنەسر) هاتووە کە (الحافظ القرطبي) لە (التذکرة) دا نووسیویەتی: (ان بني اسرائیل لما عصوا و قتلوا الانبیاء سلط الله علیهم بخت نصر وهو من المجوس، فکان ملکه سبع مأة سنة وهو قول تعالی: (فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ أُولاَهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَنَا أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا خِلاَلَ الدِّيَارِ وَكَانَ وَعْدًا مَفْعُولاً) واتە: (کاتێ=

الآرْضِ وَآتَيْنَاهُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا(٨٤)فَأَتْبَعَ سَبَبًا(٨٥) حَتَّى إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ الشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ عِنْدَهَا قَوْمًا قُلْنَا يَاذَا الْقَرْنَيْنِ إِمَّا أَنْ تُعَذِّبَ وَإِمَّا أَنْ تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا(٨٦)قَالَ أَمَّا مَنْ ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَى رَبِّهِ فَيُعَذِّبُهُ عَذَابًا نُكْرًا(٨٧)وَأَمَّا مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَهُ جَزَاءً الْحُسْنَى وَسَنَقُولُ لَهُ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا(٨٨)ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا(٨٩)حَتَّى إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ الشَّمْسِ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَى قَوْمٍ لَمْ نَجْعَلْ لَهُمْ مِنْ دُونِهَا سِتْرًا(٩٠) كَذَلِكَ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا(٩١)ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا(٩٢)حَتَّى إِذَا بَلَغَ بَيْنَ السَّدَّيْنِ وَجَدَ مِنْ دُونِهِمَا قَوْمًا لاَ يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلاً(٩٣)قَالُوا يَاذَا الْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي الآرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَى أَنْ تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا(٩٤)قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا(٩٥) آتُونِي زُبَرَ الْحَدِيدِ حَتَّى إِذَا سَاوَى بَيْنَ الصَّدَفَيْنِ قَالَ انفُخُوا حَتَّى إِذَا جَعَلَهُ نَارًا قَالَ آتُونِي أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا(٩٦)فَمَا اسْتَطَاعُوا أَنْ يَظْهَرُوهُ وَمَا اسْتَطَاعُوا لَهُ نَقْبًا(٩٧)قَالَ هَذَا رَحْمَةٌ مِنْ رَبِّي فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُ دَكَّاءَ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا) واتـە: پرسـيارت لەمـەڕ زولقەرنەین لێ دەکەن، تۆش بلّێ لە بارەی ئەوەوە من هەندێ باستان بۆ دەکەم، بە ڕاستی ئێمە لە زەویدا توانامان پێ دا و، بۆ هەموو شتێ هۆکار و ئامرازەکمان پێدا و، ئەویش شوێن هۆیەکە کەوت، هەتا گەیشتە خۆرئاوا بینی خۆر لە بەرچاودا لە قوڕ و لیتەیەکدا ئاوا دەبوو، لەوێ گەلەکی بینی و، وتمان (بە ئیلهام) ئەی زولقەرنەین ئەوانەیان سزا دەدەی یان ڕێگاباشیان لەگەڵدا دەگریە بەر. ووتی: بەلاّم کێ ستەم بکات ئەوە ئێمە سزای دەدەین و، ئەگەر گەڕایەوە لای

=جولەکەکان سەرپێچیان کرد و، پێغەمبەرانیان کوشت، خوا بەخت نەسری زاڵ کرد بەسەریاندا کە زەردەشتی بوو، پاشایەتی ئەو (٧٠٠) ساڵ حوکمی کرد و، ئەمەش فەرمایشتی خوای گەورەیە (کاتێ پەیمانی یەکەم هات ڕەوانەمان کردە سەریان کۆمەڵە بەندەیەکی خۆمان کە خاوەن هێز و توانای زۆربوون. . . . )). وە سەبارەت بە بەبەستی زولقەرنەین کە وەکو سنورێکی دەستکرد لە نێوان دوگەلدا دروستی دەکات کە یەکێ ستەمکارە و، ئەوی تر ستەمدیدەیە لە (المجلة العربي الكويتية/ العدد ١٨٤/ل١٣٤)دا هاتووە کە دوو چیاکانی زولقەرنەین کە بەنداوی تێدا دروست کردووە لە نێوان قەزوین دەریای ڕەشدایە و لەوایە چیای قوقاز و، شوێنی بنەڕەتی یاج و ماجوج مەنگۆلیایە. وە بەنداوی چین جیایە لە بەنداوی زولقەرنەین چونکە هی یەکەم لە (٢٦٤ پ. ز) دروست کراوە و، هی دووەم لە سەدەی (٦)ی پێش زاین دروست کراوە. (وەرگێڕ)

پەروەردگاریشی ئەوە سزایەکی سەختی دەدات. بەڵام کەسێ بڕوا بێنێ و کاری باش بکات ئەوە پاداشتی باشی هەیە و، کاروباری ئاسانی پێ ڕادەگەیەنین. پاشان شوێن هۆکار کەوت. هەتا گەیشتە خۆرهەڵات بینی خۆر لە سەر گەلێك هەڵدێ کە هیچ بەربەستەکیان نەبوو بەر لە خۆر بگرێت بۆیان (واتە بێ خانوبەرە و بەرگ بوون)، وە ئێمەش ئاگادار بوین بەوەی ئەو دەیکرد. پاشان شوێن هۆکار کەوت. هەتا گەیشتە نێوان دوو کێو، لەوێدا گەلێکی بینی کە لە زمانیان تێ نەدەگەیشت. ووتیان ئەی زولقەرنەین یاج و ماجوج خراپکارن لە زەویدا ئایا دەرامەتێك (پارەیەك) بۆ تۆ دابنێین کە سنورێك لە نێوان ئێمە و ئەواندا دروست بکەیت. فەرمووی ئەو توانایەی خوا بە منی داوە زۆر باشترە لەوەی ئێوەوە بەهێز یارمەتیم بدەن کە سنورێ لە نێوان ئێوەو ئەواندا دروست بکەم. پارچە ئاسنەکی گەورەم بۆ بێنن هەتا یەکسان بوو لە نێوان هەردوو کێوەکەدا. ئەنجا فەرمووی ئاگری بەربدەنێ تا ئاسنەکە بووە بە ئاگر و سور بۆوە و ئەنجا ووتی مسم بۆ بێنن بیکەم بەسەریدا کە نەتوانن بەسەریدا سەربکەون، یان کونی بکەن. فەرمووی ئەوە ڕەحمەتێکە لە پەروەردگارمەوە ئەگەر بەڵێنی پەروەردگارم هات دەیشکێنێ و بەڵێنی پەروەردگارم ڕاستە).

لێرەدا زولقەرنەین وەکو قورئان وەسفی دەکات نموونەی خواناسییەو، دادوەرێکی دادگەرە و، ڕزگاری خوازێکی بە بەزەییە و، ڕزگار کردنە یەك بە دوایەکەکانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا و، باکور و باشوری گرتۆتەوە، کە مەبەستی پێ لەمە گەڕان نەبووە لە شوێن ماڵ و ساماندا، یان خۆشەویستی دەسەڵات و هێز پاڵی پێوە بنێ، بەڵکو بڵاو کردنەوەی دادوەری و، سۆز بووە و، بۆ گرتنی دەستی ستەمدیدە و زۆر لێ کراوو چەوساوەکان بووە و، بەو پەڕی ڕێز و ڕەوشتە وە مامەڵەی لەگەڵ ئەو خەڵکانەدا کردووە کە خوا وڵاتانی ئەوانی لەسەر دەست ئازاد کردووە و، مامەڵەکانی قورسایی و دژواری نەخستۆتە سەر شانی بەندەکانی خوا کە زیانیان لێ بدات، بەڵکو هەمووی سۆز و بەزەیی و لێ بوردەیی بووە.

زولقەرنەین بە هەموو ئەو مانایە ئیسلامییە بەرزە لە دنیایەکدا دەرکەوت کە ڕووناکی پێغەمبەرایەتی پرشنگداری تێدا بێ و، هێزی ستەم و دڵڕەقی و، دڕندەیی دەستی بەسەردا کێشا بێ و، بە ئاسانی ڕێگای بڕی بۆ ناو دڵی خەڵك و، خەڵکی شکۆ و مرۆیی ئەویان کەوتە دڵ، هەم پاکی و خاوێنی ئەو، خواناسان و زانایان لەو وڵاتانەدا کە کەوتونە ژێر حوکمی ئەو و لەسەردەمی ئەودا بوون قسەکانیان شاهیدییەکی زیندوو و قسە کەرە بۆ مەزنی ئەو ئاینەی لەو قالبە خواییە نمونەییەدا داڕشتووە.

هیرودوتس بە کورتی ئەوەی لە بارەی ئەوەوە بیستویەتی باسی دەکات: و دەڵێ: (کورش پادشایەکی بەخشندە و بە سەخی بوو، زۆر لێ بوردە بوو، لەسەر کۆکردنەوەی سامان سوور نەبوو، بەڵکو هەموو سور بوونی لەسەخاوەت و بەخشندەیی و بە دڵ بوون بوو، دادگەری بە ستەمدیدەکان دەدا و، هەرچی خێر و چاکەی بۆ مرۆڤ تێدا بوو ئەنجامی دەدا).

وە زەینەفون لە بارەیەوە دەڵێ: (شایەکی هۆشمەند و بە بەزەیی بوو لەگەڵ نایابی شایەتی زێدە چاکەیی کارزانەکانی هەبوو، هیممەتی ئەو لە سەروی مەزنی ئەوەوە بوو، سەخاوەتییەکەی بەسەر شکۆیدا زاڵ بوو خزمەتگوزاری مرۆڤایەتی دروشمی ئەو بوو، دادوەری بە ستەمدیدان بەخشی، لە شوێنی خۆ بەزلزانی و خۆ پەسندی دا خۆ بە کەم زانی و لێ بووردەیی دانرا بوو)[1].

[1] ئارشەك سەفراستیان لە کتێبی (کورد و کوردستان/ وەرگێڕ ئەمین شوان)دا لە (ل: ٣٧)دا دەنوسێ: (لەسەر خشتە بەردینەیەك کە لە وێرانەکانی بابلدا دۆزراوەتەوە نوسراوە کەوا کورشی دامەزرێنەر و یەکەم پادشای هخامنشی فارس (٥٣٨-٥٢٩پ. ز) بە شانازییەوە دەڵێ کەوا مەردۆخی خواوەندی شاری بابل (خێڵەکانی سەر زەمینی گۆتۆی ناچار کرد لە بەر پێی ئەودا کورنوش بەرن). ئەو قسانە زۆر بە گرانی دەچنە عەقڵەوە، ئەمەش لەبەر هۆیەکی زۆر ساکار: دەوڵەتی فارس کە خۆی تازە لە ناوچە لاوییەکانی نۆکەندی فارسەوە بوو بوو بە قەوارەیەکی سیاسی کەی ئەو هێز و توانایەی هەبوو کە گەلێکی بەیدەستی وەکو گۆتۆ بێنێتە کوڕنوش. بە پێچەوانەوە هەر بە گوێرەی ئەو نوسراوەی کۆرش خۆی ئەو کەسەی کە هەوەڵ جار بە خۆی و=

وە شاهیدی کۆنەکان مێژوونوسانی هاوچەرخ تایبەتمەندیەکانی زولقەرنەینیان لە چەند دەستەواژەیەکدا دارشتوە کە بە راڤە و لێکدانەوەیێ دادەنرێ بۆ ئەوەی قورئان پوختی کردۆتەوە لە رێز و چاکەکانی ئەو. مێژوونوسی بەریتانی (c.b.grahdy) لە بارەیەوە دەڵێ: (کەسایەتی کورش کەسایەتییەکی بێوێنە و، نائاسایی بوو لە چاخی خۆیدا، کارەکی کردە دڵی گەلانی هاوچەرخی خۆی کە سەری هۆشمەندان سەرسورپهێنێت، زەینەفون قوتابی سوکرات رووداوەکانی ژیانی ئەوی نوسیوە بە (١٥٠) ساڵ دوای مردنی ئەوو، لە هەموو گێرانەوەکانیدا چاکە مرۆڤییەکانی دەرکەوتوی ئەو دەبینین، ئەنجا بایەخمان پێدابێ یان پێ نەدابێت. وە دەرباز بونمان لەوە ناکرێ کە دان بەوە دابێنین کە پەتی سیاسەتی ئەو بە رەوشتە جوان و کردارە مرۆییەکانی ئەوەوە پەیوەست بوو، ئەگەر رەفتاری ئەو لەگەڵ رەفتاری پاشایانی ئاشور و بابلدا بەراورد بکەین دەبینین زۆر بە جوانی و مەزنی دەدرەوشێتەوە.

---

= سوارە کوردەکانیەوە چووە ناو شاری بابلەوە تۆگبارۆی پادشای گۆتۆ بوو، تەنیا چەند رۆژێك دوای ئەوە ئەنجا کۆرش چووە شارەکەوە و بێ شەر و پێکدادان گرتی). وە لە پەراوێزی هەمان لاپەرەدا دەنوسێ: (هیرۆدۆتس هەوڵی داوە گۆبارۆ بکا بە فارس، هەروەها ئەسپاتینی ئەرمەنی و ماردۆنیاسی مانییش دەکا بە کوڕی گۆبارۆ واتە ئەوانیش فارسن).

ە لە لاپەرەی (٣٩)ی هەمان کتێبدا دەنوسێ: (ب: ناساندنی یۆنانیە (ئازادی دۆست) و (بیر بەکارهێنەر)ەکان بە کۆمەڵگا مێشك ساکار و گەوهەر پاك و رەسەن چاك و بێ خەوشەکانی رۆژ هەڵاتی دێرین بەرەبەرە ئاڵۆگۆرکاری و پێشکەوتنی راستەقینەی مێژوویی هەرێمەکەی هەژاند. لە ماوەی هەزار ساڵێکدا دوای ئەوە داستان و ئەفسانە بەندی یۆنانی رووی راستەقینەی شارستانیەتی دێرینەی رۆژهەڵاتی لێڵ و لەکەدار کرد. رەگەزە کۆن و رەسەنەکانی وەکو عەرەب و ئاشوری و گۆتۆ و ئەرمەنیەکان خۆیان زۆر نەشێوان بەڵام مێژووی کۆنیان بە تەواوی شێوێنرا، گەلێ چیرۆکی سەیر سەیریان یان رووداوی شەرماوەر لە لایەن هیرۆدۆتسەوە دەربارەی حەشیەکان و مادەکان و یان نەتەوەی نەناسراوی تر گەڕاوەتەوە. بەڵام هەرگیز شتەکی ئەوتۆ کە تەنیا تۆزقاڵێ نرخی هەبێ دەربارەی رەگەز خۆولاتیەکان نەوتراوە و تەنانەت لە دوریشەوە شتێك بۆ گۆتۆکان هەڵنەبەستراوە).

ئەوەی لێرەدا پرسیار دروست دەکات و ئەگەر راست بێ چۆن کورش کە زولقەرنەین بووە چۆن دەڵێ: (مەردۆخی خواوەندی شاری بابل خێڵەکانی سەر زەمینی گۆتۆی ناچار کرد کە لە بەر پێی ئەودا کوڕنوش بەن)؟ چۆن دان بە بت و سەنەم دادەنێ وەکو خوا؟! (وەرگێڕ)

گەلەکەی لێی دەترسان بەڵام نەك لە هێز و بازوەکەی و، کـە حکومەتەکـەی سـزای کوشتن و تاڵانی نەدەزانی و، تاوانباران دارکاری نەدەکران و، جـارێ بەکۆمـەڵ کوشـتنی دەرنەدەکرا و، گەلانی دور لە نیشتمانەکان نەدەترسان، بەڵکو ئاسایش و ئاشتی هەموو کەسی دەگرتەوە و، دڵنیایی و خۆشگوزەرانی لەسەر هەموو کەسێ دەشەکایەوە.

کـورش سـتەمی پادشـا ئاشـوریەکان و بابلیـەکانی لادا و، گـەلانی ئـاوارە و دەربەدەر گەڕانەوە زێدی خۆیان و، دادوەری درایە سەرجەم گەلان و، ئازادی تـەواو بـە سـەرجەم ئـاین و مەزهەبـەکان بەخـشرا، دادگـەری و لێ بـوردەیی بـەرێز و، یەکسانی تەواو شوێنی ترس و بیمی کـۆنی گرتـەوە). کـورش دوای داگـیر کردنـە سەرکەوتووەکەی (١٠) ساڵ ژیا و لە سـاڵی (٥٢٩ پ.ز) دا کۆچـی دوایـی کـرد، ئەنجا قەمبیزی کوڕی هاتە شـوێنی و، قـەمبیز زۆر نەمایـەوە لـە حوکمـدا و لـە شامدا مرد. کورش کوڕی نەما، بۆیە دارایوش کە ئامۆزای بوو بووە حاکمی وڵات و، ئاین لەسەردەمی ئەودا گەیشتە چڵەپۆپە لە پایەداریدا و، بە شێوەیێ بڵاوبـۆوە کە ڕابردوو ئەو بڵاوبوونەوەی بە خۆوە نەدیتبێت. ئەو وڵاتانەی رزگـاری کـرد لـەو پەڕی خۆرهەڵات تا ئەوپەڕی خۆرئاوا بوو، گـەورەترین ئیمپڕاتـۆری یەکتاپەرسـتی دامەزراند کە جیهانی کۆن بیبینێت[1].

---

[1] سەیر بکە لە (تفسير الجلالين)دا زولقەرنەین ئەسکەندەری مەقدونییە کە وەکو زانراوە یۆنانی بووە و، لای نوسەری کتێبی (زەردەشت و زەردەشتییەکان کورشەکە لە ڕەگەزی فارسییە و، لای (ابو الکـلام ئازاد) لە کتێبی (اثبات الوصية)دا زولقەرنەین فەرەیدونی کوردییە کە بە دامەزرێنەرەکی دەوڵـەتی میدی دادەنرێت.

ئەنجا سەیر بکە بە پێی مێژوو، بۆ نموونە لە کتـێبی (اربیـل بـین الماضـي والحاضـر) ١٩٨٧/ل: ٣٩ داو، لـە کتێبی (امارة بهدینان/صديق الـدملوجي) سەیر بکە وەکو ڕابردوو ئاماژەیان پێ کرد: فارسەکان لە سەردەستی کورش دەوڵەتی میدی کە دەوڵەتی زەردەشت و فەریدونە دەروخێنێت و، ئەسـکەندەریش دەوڵـەتی فـارس لـە سەردەمی دارای سێیەمدا لە ساڵی (٣٣١ پ. ز) دەروخێنێ، لە ئەربیل دا و، بە جەنگی ئـەربیلاش ناسـراوە! جا لێرەدا دەپرسین: ئایا کام لەم سێ کەسانە لە ناو ئەم سێ گەلەدا دەبێ زولقەرنەین بێت؟ دیارە من بۆچوونی خۆم هەیە، بەڵام بوار بۆ مێژوو نوسان دەهێڵینەوە با ئەوان وەڵامی ئەوە بدەنەوە!. (وەرگێڕ)

دارا ئەو رزگارکردنەی بە دەستی هێنا لە لایەن خواوە لە وڵاتدا و، ئەو سەرکەوتنە گەورەی بە دەستی هێنا لە چەسپاندنی ئاسایش و ئاشتی بۆ هێز و توانای خۆی نەگێڕایەوە. بەڵکو وەکو هەر بەندەیەکی خوا بۆ زێدە چاکەی خوایی و یارمەتی ئەو گێڕاویەوە، سەبارەت بەو سەرکەوتنە گەورەی سەرەتا بە دەستی هێنا بەسەر ئەو مەجوسیانەدا کە لە کاتی دیار نەبوونی ئەو دەسەڵاتیان لە قەمبیز ستاند بۆوە دەڵێ: (تەختی وڵات کە کئوماتای مەجوسی لە قەمبیزی سەند بوو کە هەر لە کۆنەوە هی خێزانی ئێمە بوو، کئوماتای مەجوسی فارس و میدیا و ویلایەتی تری لە قەمبیز داگیر کردبوو، پێی دەوڵەمەند بوو، بوو بە پادشا.

شا دارا دەڵێ: کەس لە فارس و میدیا دەرنەکەوت یان لە خێزانی خۆمان تەختی شانشینی لە کئوماتای مەجوسی وەربگرێتەوە، خەڵکی لێی دەترسان چونکە خەڵکی زۆری کوشتبو، کەس نەیدەتوانی شتێ بە کئوماتای مەجوسی بڵێ تا من هاتم و، داوای یاریدەم لە خوا کرد و، یارمەتی دام، وە لە ڕۆژی دەیەمی مانگی باکیادیش من بە یارمەتی چەند کەسێ کئوماتای مەجوسی و ژمارەیەکی زۆری یارمەتی دەرانی ئەومان کوشت و، پادشایەتیم لێ سەندەوە و، لە سایەی خواوەوە بوم بە پادشا. خوا مولکی پێدام، داریوش شا دەڵێ: ئەو حوکمەی لە دەستی بنەماڵەمان دەرهێنرا بوو گێڕامەوە و، پێی گەیشتمە ئەو شوێنەی سەرەتا لەسەری بوو، ئەو پەرستگایانەی کئوماتای ڕووخاندبوونی چاکم کردنەوە و، ئەوەی کئوماتای قۆرخی کردبوو لە خەڵکی سەند بوو لە کەل و پەل و خزمەتکار و خانوبەرە داماناوە خەڵکەکان و، ئارامم دایە فارس و میدیەکان و خەڵکی سەرجەم ویلایەتەکان و، گەڕانەوە شوێنی ڕابردووی خۆیان، بەم چەشنە هەرچی سەندرا بوو گێڕامەوە حاڵەتی ڕابردووی خۆی، هەموو ئەو شتانەشم بە زێدە چاکەی خوا کرد.

وە لە شاری (الاصطخر) دارا لەسەر تابلۆیەکی بەردی بەهرەکانی خوا دەژمێرێ و، وتویەتی:

(گەورەیە ئەو خوایەی ئەو زەوییەی دروست کردووە و، ئـەو ئاسمانـەی دروسـت کـردووە و، مرۆڤـی دروسـت کـردووە و، بەختـەوەری دروسـت کـردووە و، دارای کردووەتە پاشایەك بەسەر زۆر خەڵکدا و، شـەرع دانـەرێ بـۆ زۆرێ لـە خـەڵك.وە دارای پادشا دەڵێ: لە سایەی خواوە ئەوە ئەو دەڤـەر و هەرێمانەیـە مـن خـاوەنی ئەوانەم لە دەرەوەی فارسدا و لە ژێر ڕکێفی مندانە، کە سەرانە دەدەن و، فەرمانی من بە گوێ دەکەن و، شەریعەتی مـن ئـەنجام دەدەن، میـدیا، سوسـیانا، برتیـا، هریفا(هرات)، بەکتریا (بەلخ)، سفد، خوارزم، هیند، بابل، ئاشور، وڵاتی عەرەب، میسر، ئەرمینیا، کبنقیا، ئیسبرتا[1].

شا دارا دەڵێ: (کاتێ خوا زەوی بینی مـنی کـرد بـە ئەمینـدار بەسـەریدا و، سوپاس بۆ خوا بەڕێوەبردنی زەویم توند و قایم کرد کە فەرمانی منی تێـدا بـەجێ بنێنرێ، ئەگەر دڵت لێت بپرسێ ئەو زەوییانە چەندە شـا دارا دەسـەڵاتی بەسـەردا گرتوون سەیری ئەو وێنەیە بکە کە تەختی منیان هەڵگرتووە ڕەنگە بیاننناسیت.

دارا دەڵێ: ئەوەی من کردم لە سایەی خـوادا کـردم و، خـوا یارمـەتی دام تـا تەواوم کرد، تکام وایە خوا بمپارێزێ، هەم خانەکەم و، هەم ئەم زەوییـە، بۆیـە لـە خوا نزا دەکەم شایەد خوا ئەوەم پێ ببەخشێت، ئەی مـرۆڤ خوداوەنـد بـۆ تۆیـە و گومانی خراپی پێ مەبە و، لە ڕێگەی ڕاست لامەدە و تاوان مەکە.

---

[1] ئەوەی لێرەدا زۆر کێشە بۆ میللەتی ماد پەیدا دەکات لەمەڕ مێژووەکەیدا ئەوەیە وەکـو مەسـعود محمد لـە (لسان کرد/ل٢٠)دا ئاماژەی پێ کردووە کە پادشاکانی ماد هـیچ نوسـراوەکیان بـە زمـانی خۆیـان بـەجێ نەهێشتووە کە بتوانرێ بکرێ بە بەڵگە بۆ دیاری کردنی ئەو زمانەی لەسـەردەمی مـادا بـەکارهاتووە یـان کوردەکان، تەنیا ناوی چەند پادشایەکی ئەوان بە ئێمە گەیشتووە کە لە نووسراوی گەلانی تردا هـاتووە، تـا لێرەدا ئاستەنگ سەرهەڵدەدا لە ڕاددەی پەیوەندی و چون یەکی نێوان زمانی کوردی کۆن و ئاڤێستادا.

وە لە (ل٢٤)دا دەڵێ: تەنیا ئاڤێستا شك دەبەین کە بۆی بگەڕێینەوە کە زمـانی میدیـەکان چـی بـووە. وە (ل٣٨)دا دەڵێ: (ئەو پاشماوانەی لە شاکانی فارس ماوەتەوە لە سەردەمی کورشی گەورە لە ناوەڕاستی سەدەی ٦ پ. زدا کە دەوڵەتی میدی ڕوخاند و خۆی بووە شاهەنشا دەگاتە (٤٠٠) و چەند ووشەیەك کـە لـە زمـانی ئاڤێستا نزیکن، بەڵام ئەو جیاوازییەی لە نێوانیادا هەیە دەیان کات بە دوو زمانی جیا لە یەکتری). (وەرگێڕ)

لە کاتێکدا دارا هەموو سەرکەوتنی خۆی بۆ خوا دەگێڕێتەوە و تەنیا، ئەمەش بۆ بڕوای قوڵی ئەو دەگەڕێتەوە کە هەموو کاروبارەکان بەپێی ویستی ئەو ئەنجام دەدرێن و، وە لە خوای بە هێز و بە توانا یارمەتی و سەرکەوتن وەردەگرێ و، لە سەرجەم قسەکانیدا لە قسەکانی کورشی کوڕە مامی ناڕواتە دەر لە کاتێکدا هەموو کردەوەکانی بۆ پەروەردگاری جیهانەکان دەگێڕێتەوە و، دان بەوە دادێنێ کە ئەوە زێدە چاکەی خوایە و فەزڵە بۆ ئەو، (هذا رحمة من ربي). مانا و چەمکی یەکتاپەرستی[1].

ماوەیەکی زۆر دوای دارا و جێنیشی ئەو دەسەڵاتی بەسەر هەموو بوارەکانی ژیانی فارسی داگرتبوو، ئەنجا وورده وورده ڕواڵەتی دور لە ئاینی لەسەر ڕووی ژیان سەردەکەوت کە بیری ئاگر پەرستی کۆنی لەگەڵدا دەردەکەوتەوە و، کەوتە کێشە لە پێناوی دەسەڵات گرتن بەسەر ژیانی ئاینیدا لەگەڵ بیرە ڕەسەنە زەردەشتییەکان و، حەق و بە تاڵ لە کۆمەڵگادا تێکەڵ بە یەکتری بوون.

ئەگەر ئاینی زەردەشتی هێزێکی زاتی هەبوایە کە دوری بخاتەوە لە توخمی کات و شوێن دەیتوانی لەگەڵ تەواوی لادانێ بەرەو ڕوو بێتەوە و، هەر پاشگەز بوونەوە و دەرچوونێ لەناو ببات و، هەر بیرەکی بێگانە و بڕوایەکی خراپ سەرکوت بکات،

[1] بە پێی مێژوو هەر لەسەردەمی هخامنشییەکان گۆڕان بەسەر ئاینی زەردەشتدا هاتووە کە کورش دایمەزراندووە، مامۆستا (ڕەشید یاسمی) وەرگێڕی کتێبی (ایران دز زمان ساسانیان) دەنوسێ: (ئەوەمان نەزانیوە کە هخامنشییەکان لە هەموو کارەکانیاندا پەیڕەویان لە زەردەشت کردبێت و، هەندێ بڕوایان وایە ئاناهیناهینا (خۆر و زوهرە)یان پەستبێ). بەڵام دکتۆر (معین) لە کتێبی (مزدیسنا و ادب پارسی) دا ئاماژە دەکات کە بیری بوزی هیندی تێکەڵ بە ئاینی زەردەشتی بوو، هۆی سەرەکیش بۆ ئاگر دەگەڕێتەوە. هەندێ بڕوایان وایە لە چاخی ساسانیدا بە تەواوی ئاینەکە لەبەریەك هەڵوەشابێ و، دوای سوتاندنی ئاڤێستا لە لایەن ئەسکەندەرەوە جارەکی تر ئەردەشێری ساسانی کە بڕوا وایە کورد بوبێ فەرمانی نوسینەوەی دابێ، کە زۆر جیا بووە لە ئاڤێستای زەردەشت. لەو سەردەمەدا خوای گەورە کلێشە و وێنەی بۆ کێشرا و لە نەخشی تاق بوستاندا و، لە نەخشی ڕەجەبدا و، بە نەخشی ڕۆستەم دا تاجی شاهانە بە یەکێ لە شاکان دەدات، کە ئەمەش ئەوە نیشان دەدات کە ساسانیەکان خوایان بەرجەستە کردووە. کەچی هەندێ دەڵێن ئاڤێستا لە سەردەمی هخامنشییەکاندا نوسراوەتەوە! (وەرگێڕ)

بەڵام خوا ویستی لەسەر ئەوە بوو کە ئاینەکە پەیوەستە بە کات و شوێنەوە و، تەنیا بۆ چەند کەسانێکی دەست نیشان کراوە، بۆیە بە بوونی ئەم تایبەتکاری و خاسیەتانەوە دژوارە لەبەرامبەر شەپۆلەکانی لە ناوچون و دەرچوون و، بێ ئاگایی و لە یاد کردن و، لێکدانەوە و ڕاڤە کردندا ڕابوەستێت، لەسەروی هەموو ئەو شتانەوەش بەرەنگار بونەوەی بیروئایدیا و بیرە جیاوازکان لەگەڵ ئەودا، زەبونی و بێ هێزی دزەی کردە ناوو، هۆیەکانی لادان و گۆڕین دایگرت و، تا لە کۆتاییدا ئاینەکە سادەیی خۆی لە دەستدا و وەچە لە دوای وەچە هات و گۆڕا بۆ ئاینەکی تێکەڵ بە سەرجەم بیروبڕوایەکانی باو لە کۆمەڵگادا.

دیاری کردنی سەرەتای ڕمانی ئاینەکە و تێکەڵ بوونی بە ئاگر پەرستی میدی و فارسی کۆن و بت پەرستی یەکانیتر ئاسان نیەو زەحمەتە. بەڵام ئەوە بە ڕاست دەزانین سەرەتای هەرەس هێنانی ئاینەکە یەك سەر لە ڕوانینی خەڵکەکەوە بۆ زاتی خوا دەستی پێ کردبێت.

هەر کە سەدەی سێیەمی بەر لە زاین دەستی پێ کرد، واتە نزیکەی (٢) سەدە و نیو دوای کۆچی زەردەشت بیروکەیەکی تۆکمە و پێگەیشتوو سەری هەڵدا کە بێگومان کاری هۆشمەندان و زانایان بوو، ئەم بیرۆکەیەش بە گەورە زانینی ئاگر بوو وەکو هێمایەك بۆ خوا لە ژیانی دنیادا[1].

[1] لە ئێراندا دوای زەردەشتییەت زۆر بیر و ئاین سەریان هەڵدا کە خەڵکی ئێران باوەشیان بۆ کردەوە و، گۆڕانێکی ئاینی و سیاسی لە ئێراندا دروست کرد و، کاری زیاتری لە دینی زەردەشتی کرد وەکو:

١- ئاینی جولەکە: دوای ئەوەی کورش بابلی گرت، ئەو دیلە جولەکانەی سەردەمی نەبوخذنەسر گیرابوون ئازاد کران و، هاتنە ئێران و دەوری خوزستان و ئەکباتان و ئەسفەهان.

٢- نە ستوریەکان: کە نەسارای ئێرانی بوون کە سەردەمی ئەشکانیەکان دینی ڕەهبانییان وەرگرت و کەڵێسایان بۆ خۆیان بنیات نا.

٣- مانەویەکان: کە (٢٢٨ز) دەرکەوتن و، خێرا بە ئێراندا بڵاو بوونەوە و، پەیامەکەیان زیاتر گیانییە و پاکژی دەرونە، ئەمانە لەسەردەمی شاپوری یەکەمدا داوای پێغەمبەرایەتییان ڕاگەیاند و،=

بەڵام چۆن بیرۆکەیەکی بت پەرستی ئاوا لە پەیامێکی ئاسمانیدا سەرهەڵدەدا کە لەسەر بێ گەرد ڕاگرتنی ڕەهای خوادا دامەزرابێت، وەڵامی ڕاستەوخۆ و گورج لە بێ گەرد ڕاگرتنی ڕەهای خوداوە لە هەرچی خڵتە و خەوشی ماددییە و، لە هەموو بەشەکانی وێچواندن و هاوشێوە کردن و نا تەواوی و گۆڕان و بەش بونی هەڵدەقوڵێت، چونکە ئەم جۆرە بۆچوونە لەمەڕ خوداوە زاتی خوا لە ئاستی ماددی هەست پێکراو دەگوازێتەوە بۆ ئاستی عیرفانی کە ڕامانی خودا لە زات و بوندا دەگۆڕێ بۆ بیرێکی زانستی ڕووت. لە کاتێکیشدا کە ئەم جۆرە بیرە لە توانای زۆر کەسیش دانەبوو، لەگەڵ سروشتی ئەواندا نەدەهاتەوە و، نەیان دەتوانی پەی پێ ببەن لەبەر لە کاروەستانی هزریان لە بەرامبەر شتی بەرجەستەدا و، قەناعەتیان بە لقەکانی کارەکان دەکرد بێ وورد بوونەوە، زانایان و عاریفەکان لە بەرامبەر هێزی بێ گەرد ڕاگرتندا هیچ شتەکیان نەبینی تەنیا ئاماژە کردن نەبێ بە ڕەمزێ بۆ زاتی بەرزی ئەو کە لە داڕنین (التجرید) نزیك بێ و، لە حاڵەت و سیفاتدا لە ئەو بچێ و، لەبەر جەستەیی و هەست پێ کراوی نزیك بێ، تا هزری خەڵکی توانای وەرگرتنی هەبێ و هەڵی بگرێ و بتوانێ وێنە بیری بکات و پەی پێ ببات و، لەگەڵ سروشتی ئەواندا بگونجێ و، کە کۆتایی بیرەکەیان سەری کێشا بۆ ئاگر.

وەرگرتنی ئاگر بە تەنیا لە ناو دیاردە سروشتییەکاندا کە سیفەتەکان و دۆخەکانی لە سیفەتەکان و دۆخەکانی خودا دەچێت، ئەمە بۆ هەڵە حاڵی بونیان

---

= ووتی سروشم بۆ دێ و، کتێبەکی هەیە بە ناوی (ئەرژەنگ). بڕوا وایە پاشماوەی ئاینی زەردەشتی و، جولەکایەتی و مەسیحییەت بێت.

٤- مەزدەکییە: لە نزیکەی (٤٩٧پ. ز)دا دەرکەوتن لە ئێراندا و داوای سۆسیالیزمی و هاوبەشی سامان و ئا فرەتیان دەکرد و، بە کورتی بەڕەڵایان دروشم بوو، هەرچەندە ئەردەشێر زۆر بە توندی وەڵامی دانەوە و، بە کۆمەڵ دەیکوشتن، کەچی ئێستاش پەیڕەویان هەر ماون.

ئەو ئاینە و زۆر ئاینی تر وەکو بودییەت و هی تریش لە ئێراندا دەرکەوتن کە کاریان کردە سەر گۆڕینی ئاینی زەردەشتی و کەم کردنەوەی ژمارەیان. (وەرگێڕ)

دەگەڕێتەوە لە سیفەتی ڕووناکی خواییدا[1] لە کاتێکدا سەیری سروشتی خوایان کرد کە ڕووناکییەکی پاکژ و پوختەیە و، پاشان بۆ ڕوناکییەتی خوا چەند درەوشانەوەیەکی جیاوازیان دانا لەسەرجەم گەردووندا، هەر لە دەست کردن بە گڕی خۆر و، تریفەی زەردی مانگ لە ئاسماندا، هەتا ئاگر لە ئاگردانی زەویدا، هەتا وزەی ڕوناکی و ئاگری کە لە تەواوی دروستکراواندا خولقێنراوە و، هەموویان ڕواڵەتی ڕووناکی ئەوو هێمای ئەون. وە لە بلێسەی ئاگر و داگیرساندنی دا وەکو ڕواڵەتەکی ڕووناکی خوایی هێمایەکە ئاماژە دەکات - وەك ئەوان وا گومان دەبەن - بۆ سەرجەم واتاکانی خودایی و، بەرزی و شکۆ و، مەزنی و پاکی و بێ خەوشی هەیە و، لەسەرەوەی ئەوەشەوە سەرچاوەی ڕووناکی و سەفایە و، ئەو هەردەم

[1] ئایا لە کاتێکدا قورئان دەفەرمێ: (اللّٰهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ) النور/ واتە: خوا ڕووناکی ئاسمانەکان و زەوییە. دەشێ مانای ئایەتەکە بە ڕواڵەتی لێك بدەینەوە و، بڵێین خوا ڕووناکییە وەك ڕووناکی خۆر و ئەستێرەکان و بروسکە و ئەو ئاگرەی ئێمە هەڵی دەگیرسێنین؟! یان بە زمانی فیزیایی ئیمڕۆ بڵێین خوا وزە و شەپۆڵە ماددە و ئەتیری پێك هێناوە و بە یەکەی پێك هاتنی بونەوەر دادەنرێت؟! ئەگەر سەیری زانا و موفەسیری خۆمان بکەین بۆ نموونە لە (تفسیر الجلالین)دا هاتووە: (اللّٰهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ) (أي: منورهما بالشمس والقمر). واتە: خوا ڕووناك کەرەوەی ئاسمان و زەوییە بە خۆر و مانگ. وە (الراغب) لە (مفرد الفاظ القران)دا لە ووشەی (النور)دا دەڵێ: (وسمى الله تعالى نفسه نورا من حيث انه منور، قال الله نور السماوات والارض). النور/٣٥. وە (ابن كثير) لە (تفسير القران العظيم)دا دەڵێ: موجاهید و ابن عباس دەڵێن: (اللّٰهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ: يدبر الامر فيهما نجومهما و شمسهما وقمرهما). واتە: کاروباری ئاسمانەکان بە ئەستێرە و خۆر و مانگەکانی ئەو دوانە هەڵدەسوڕێنێ. هەرچی (انس کوڕی مالکە) ووشەی (النور) بە (الهداية) لێك دەداتەوەو (ابن جرير) ئەوەی هەڵبژاردووە. هەندێ وەکو (الضحاك) وشەی (نور) بە (نوّر) دەخوێننەوە.

کۆمەڵەکی کەم دەڵێن: (أي بنوره اضاءت السماوات والارض) وەکو (السدى). لە زانایانی خۆرئاوای نوێ (بول كلارنس ئەبرسولد) مامۆستای سروشتی زیندەگی لە (الله يتجلى في عصر العلم/ ل: ٣٥)دا دەڵێ: نامە ئاسمانیەکان لە کاتێکدا خوامان بۆ وەسف دەکەن و، لە بارەی زات و نهێنی ئەو دەدوێ زۆر وشەی دنیایی بەکاردێنێ کە ئێمە لە بارەی وەسفی ژیانی مرۆڤ و مێژووەکەیدا لەسەر زەویدا بەکاری دێنین، بەڵام خوای گەورە بونەوەرەکی روحانی نادیارە، ئەگەر لە سەروی ڕوحانی بن لە بەرزیدا ئەو لە سەرووی ئەوەوەیە. وە ئێمە ناتوانین بە وەسفی روحانی روت وەسفی بکەین، هەرچەند مرۆڤ لە لەش و گیان پێك دێ بەڵام ناتوانێ لەو وەسفە روحانیە حاڵی ببێ یان بیلێت تەنیا لە سنوری شارەزایی خۆیدا نەبێت). (وەرگێڕ)

چالاکە و خراپی و لەناو چوون و گۆڕانی بەسەردا نایەت، بۆیە وەکو هێمایەك بۆ خوا لە بەرزاییەکەیدا و، بۆ پاکژ ڕاگرتنی ئەو هەڵبژێردرا و، بە چاوی گەورەیی و پاکژی و شکۆداری سەیریان کرد.

کەواتە: مەبەستیان ئاگرەك نییە بەڵکو مەبەستیان ئەو واتایەیە بڵێسەی ئاگر ئاماژەی بۆ دەکات و، بە گەورە دانان و بە پیرۆز سەیر کردن بۆ ئاگرەکە نییە بەڵکو بۆ هەمان واتایە، چونکە بڕوای تەواویان وایە ئەگەر هێما بە ڕواڵەتەکەی وەربگیرێ لەگەڵ بڕوا و یەکتاپەرستیدا دژ دێتەوە، بەڵام وێنە بیرکردن و ڕامان لە خوا وەك هێمایەکی بەرجەستە کە بە هەستیارەکان پەی پێ ببرێ بە هەر جۆرەکی بێ و، ئەوە دابەزاندنی خوای تێدایە بۆ ئاستەکی ماددی هەست پێ کراو، ئەو بڕوایەی لە سەر واتای ڕەمز و هێما دامەزراوە و، ئەو زانیاریەی لەسەر شتی هەست پێ کراو دامەزراوە لە هەموو بارودەخدا بڕوا و زانیارییە کە ڕەمزی تێدا ون دەبێ و، ڕێنوێنەکەی دەشارێتەوە و، خوا لەو دیدەگایەوە وەکو ماددەکانی تر بەرجەستە سەیر دەکرێ و، خواش زۆر لەوە بەرز و بڵندترە.

کت و مت هەر ئەوە ڕوویداوە هەر کەسێ لە فەلسەفەی هێمایی زەردەشت حاڵی نەبێ بە کرداری بە لەش کردن (التجسیم) تاوانباریان دەکات و، ئاگر پەرستییان دەداتە پاڵ و، کە مەبەست لەمەدا بە گەورە دانانە و، ڕاستییەکەشی ئەوەیە ئاگرەکە نەپەرستراوە و، کەسیش نەیکردووە بە خوایەکی جیا لە خواوە ئەوان کە ڕووی تێ دەکەن لە کاتی نوێژ و پاڕانەوەکانیاندا چاویان وەرناگێڕن وەکو خوایەکی پەرستراوی جگە لە خوا سەیری ناکەن، بەڵکو وەکو هێمایەکە بۆ خوا کە چاوەکان پەی پێ نابەن و، هزرەکان نهێنییەکەی نازانن، بەو پێ و دانگە بابای زەردەشتی بە بڕوایەکی توندەوە جیاوازی دەکات لە نێوان خوای گەورە و هێمایەکەیدا.

کەواتە ئاین هەرگیز ڕێگای بە ئاگر پەرستی نەداوە و، جۆرەها شێوەی گۆڕانی بەسەردا هات و، لە چەند چاخەکی یەك بە دوای یەکدا لە واتا و چەمکەکانی

یەکتاپەرستی ناوی ڕووت کرایەوە، بەڵام بڕواداران هەمیشە خۆیان لە بت پەرستی و بڕوا بەتاڵەکەی پاراستووە، هەم لە خوایە داتاشاوەکانی و، مالکوڵم کە مێژوونوسەکی بەریتانییە ئەم زێدە چاکیە دان پێدا دێنێ و لە کتێبی (مێژووی ئێران)دا دەڵێ: (فارسەکان بە تەنیا لەناو گەلاندا لە هیچ خولەکی مێژوویی دا باڵیا بۆ بت پەرستی پان ڕانەخستووە)[1].

وە ئەو موسڵمانانەی ئەرکیان کێشا بۆ وەستان لەسەر ئاینی زەردەشتی (مەجوس- موگ) و بە دورو درێژی سەیری هێماکان و ئەدەبی ئاینی ئەویان کرد، یان ئەوانەی تێکەڵی ئەوان بوون و لەمەر نوسراوەکانی بەردەستی ئەوان و زانیاری ئەوان دەمەتەقەیان لەگەڵیاندا کرد، ئەو ڕاستیەیان پەی پێ برد و ئەو ڕاستییەیان لە ناو نوسراوەکانی خۆیاند سەلماند، بۆ نموونە قەزوینی دەڵێ: (....کشتاسف فەرمانی دا بە دروست کردنی خانەی ئاگر و، ئاگری کرد بە ڕوگە و قیبلە نەك خودا و، ئەو ئاینە تا هاتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مایەوە).

---

[1] ڕابردوو ئاماژەمان بە قسەی زۆر لە خۆرهەڵاتناسان کرد کە ئارییەکان ئاگریان پەرستووە، هەم خۆر و هێزە سروشتییەکان، بەڵام لە بەرامبەر ئەم بۆچونانەدا، بۆچونی تر هەیە کە دەڵێ: کورد بە درێژایی مێژو بتی نەپەرستووە و، هەمیشە خاوەن پێغەمبەر و، ئاین بووە و، نوێژی کردووە و، ڕۆژووی گرتووە، ئەوەتا ئەو دوو ناوانە کوردین و، ئەگەر نوێژ و ڕۆژو بەر لە ئیسلامدا باو نەبوایە لە جیاتی ووشەی (نوێژ و ڕۆژو) دا (الصلاة والصیام)ی بەکاردەهێنا. وەکو لە کتێبی (مێژوی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد/ئیحسان نوری/ل: ٢٦)دا هاتووە بە پێی ئاڤێستا زۆر پێغەمبەر لە ناو کوردا هاتون وەکو کێو مەرد کە بە نوح ناسراوە و، ئەخرام کە ئیبراهیمە و، هەروەها مهاباد و، هۆشەنگ و، زەردەشت و هی تریش. بە پێی قورئانیش دروست بونەوەی ژیان لە خاکی کوردستاندا بووە: (واستوت علی الجودی). واتە: کەشتییەکە لەسەر جودی نیشتەوە. بە پێی (کتاب المقدس) میدیەکان نەوەی یافثی کوڕی نوحن (ع).

وە لە بارەی ئیبراهیم (ابن کثیر) دوو ڕاستی دەرخستووە: بڕوانە (قصص الانبیاء/ل١٣٦) دەڵێ: ئەو کەسەی مەنجەنقی بۆ ئیبراهیم دروست کرد کوردێ بوو بە ناوی (هیزن). وە لە (ل٩٥)دا دەڵێ: عەرەب دوو بەشە: عەرەبی ڕەسەن و عەرەبی بە عەرەب کراو کە نەوەی ئیسماعیلی خەلیلن (ع). (وەرگێڕ)

هەیە لە موسڵمانان ئاگریان بە کەعبەی زەردەشت ناو بردووە و، هەیانە وتویەتی: (ئاگر ڕوگەی ئەوە وەکو چۆن کەعبە ڕوگەی موسڵمانانە). فیردەوسی بە تایبەتی سەرکۆنە دەکات و سەرزنشتە دەکات، بەڵکو داوا لە هەر موسڵمانێ دەکات زەردەشتییەکان بە ئاگر پەرست ناوەزەد نەکات، چونکە بەپێی دەربڕینی ئەو تەنیا خوای تەنیا و بە دەسەڵات دەپەرستن.

بە هەر حاڵ ئەو شێوەیەی ئاینی زەردەشتی تێدا دەرکەوت، جێگای بڕوا و جێگای کارتیاکردن خواپەرستی و توێژینەوە بوو، وەك هی ڕۆژانی زەردەشت و جێنشینییەکانی ئەو نییە و، وەچە لە دوای وەچە لە دوای وەچە بە هۆی بێ ئاگایی و لە یاد کردن سادەیی و گەورەیی خۆی لە دەستداو، بۆ شێوازەکی ئاڵۆز بیر و نەریتی دژ بە بڕوا و دیاردەکانی گۆڕا و، تەنیا ئەوەندەی تێدا مایەوە کە ئاماژە بۆ واتای یەکتاپەرستی بکات کە هەر لە دورەوە لە ناو گەلە واتایەکی خوایی ساختەیی و ناڕاست دا دەدرەوشێتەوە و، هەورەکی نەزانی بەری ڕوناکیە پڕشنگدارەکەی دەگرێت و، بەربەستێ لە نێوان ئەوو ئەوەی دەچێتە دڵانەوە دروست دەکات.هەر چۆنەك بێ پاشماوەی تری ئاین دەسەڵاتی بەسەر جوڵەی ژیاندا گرت لە کۆمەڵگای فارسیدا، تا ئەسکەندەری مەقدونی وڵاتی فارسی لە (٣٣١-٣٣٠پ.ز) داگرت و دەسەڵاتی سیاسی دەوڵەتی ڕوخاند و، ئەنجا دەسەڵاتی ئاینی و یاسا دان و گیانی سڕایەوە لە وڵاتدا، بەڵام لە هەموو کارەساتەکان گەورەتر کە ئازاری پێ گەیاندن ئەوە بوو ئەسکەندەر وڵاتی ئیستەخری سوتاند کە پایتەختی ڕوحی وڵات بوو، زۆربەی کەلەپور و کلتوری زەردەشتی لەناو چوو[1].

[1] لێرەدا نوسەری کتێبی زەردەشت و زەردەشتیەکان هەموو گرنگییەکی دەوڵەتی ئاڤێستای لە فارسدا کورت کردۆتەوە و، بە هیچ شێوەیێ بە رای دەوڵەتی میدیدا نەڕۆیشتوە کە بەر لە کورش و هخامنشییەکان ئەوان سیاسەتی دنیای ئیمڕۆیان هەڵسوڕاندووە و، تا ئاڤێستا لە دەوڵەتی ئەواندا حوکمی کردووە و، ئەنجا دوای کورش و لاواز بوونی دەوڵەتی میدی کلتوری میدیەکان لە لایەن فارسەکانەوە داگیر کراوە و، بۆ خۆیان قورخیان کردووە وەکو ڕابردوو ئاماژەیان پێ کرد.
(المقدم عبدالوحید) لە کتێبی (الاکراد وبلادهم)دا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە تۆمارگە مێژوویەکان ئەوە نیشان دەدەن کە پادشاکانی گۆتی - جودییەکان پەلاماری مەمالیکی دەوروبەریان داوە وەکو سۆمەر و ئەکاد و عیلام و=

= ئەرمینیا. . . هتد. هەتا مێژوونوسی کۆنی یۆنـانی (کەسـنەفون ٥٣٠ - ٢٥٢ - xenophon پ. ز. ئامـاژە دەکات کە چۆن سوپای ئەو لە کاتی پەلاماری یۆنانیدا بۆ سەر کوردەکان پاشە کـشە دەکـات و، وە دەڵـێ: (گـەلی کاردۆخی قەت گوێڕایەڵی فارسەکانیان نەکردووە و، ملیان بۆ کەچ نەکردووە هـەتا شـایەکی ئێـران بـە سـوپایەکی گەورەی ١٢٠ هەزاری پەلاماری کاردۆخی دەدات بەڵام ئەو دەشکێن و تەفروتونایان دەکات). بـەو چەشـنە جـەنگ بەردەوام بووە لە نێوان فارس و کوردا بەهۆی تەماعی ئەوان تا دەوڵەتی میدی لە لایەن کورشەوە رووخا ئیبن جەوزی و تەبەری و شەهرستانی دەڵێن: زەردەشت پێغەمبەری خوا بووە بۆ سەر میدییەکان. (احمد امین) لە (فجر الاسلام)دا بە پێغەمبەرێکی خوایی چاکە خواز بۆ سەر دەوڵەتی میدی دادەنێت.

(مەسعود محمد) لە کتێبی (لسان کرد/ل١٩)دا دەڵێ: (مادییەکان یان میدییەکان باب و باپیرانی پێشینەی کوردەکانن کە لە باکوری خۆرئاوای ئێراندا نیشتەجێ بوون و، هاوسنوری فارسـەکان بـوون بـەلای باشـوردا. یەکەم پادشای ئاشوری کە ناوی مادی لە ناو نوسـینەکانیدا هـاتووە (شلمانسـەری دووەمـە کـە خـاکی مـاد (کوردستانی ئێستای ئێرانی) لە ساڵی ٨٤٤پ. ز) داگیر کردووە، سەر لە نوێ لە دوای حەوت سـاڵان داگـیری کردۆتەوە و، لە هەواڵەکەدا باسی (hadamadai)دەکـات. وە ناویـان لەسـەردەمی (شمس ادادی چـوارەم)دا هاتووە کوڕی شلمانەسری ناوبراو. ئەنجا ئەدادنیری سێیەم (٨١٠ پ. ز)داگیری کردونەوە. وە تیکلات پلیـسری چوارەم ساڵی (٧٢٢پ. ز) داگیری کردونەوە. مادییەکان لەو رۆژگارەدا لە ناو یەك حکومەتدا رێك نەخرابوون، تا بوار بۆ شا (pyaukko) یان دیوکو (یونانی بە deiokes ناوی دەبەن) رەخسا لە ساڵی (٧١٣ پ. ز)دا کە دەوڵەتێ دابەزرێنێ و پایتەختەکەی (hagmatana) پێ واتە (هەمەدان) کە بە یەکەم دەوڵەت دادەنرێ لە ناو گـەلانی ئێرانیـدا. پادشـای سـێیەمی مادیـەکان (huvadhshtra) هۆەخـشترە کـە یۆنـانی بـە زاراوەی (cyaxares) ناوی دەبەن و یەکێکە لە رزگار کەرە ناودارەکان و زۆر لە گەلانی هاوسنوری خۆی خستە سـەر دەوڵەتەکەی و ئێران و، هەتا لە ساڵی (٦١٢ پ. ز) و (خاوەنی تاریخ زبان فارسی ٦١٠ سـاڵی بـاس کـردووە) بە هاریکاری بابلیەکان پەلاماری نەینـەوای دا کـە پایتـەختی ئاشـوریەکان بـوو، لاپـەڕەی ئاشـوریەکان لـە تۆرمارگەی حکومەتەکاندا پێچرایەوە. ناوی میدی و ئێرانیەکان دوای ئەو رزگار کردنە بڵاو بۆوە، تا شا مردو کوڕەکەی شوێنی گرتەوە کە لە نوسراوەی بابلیەکاندا بە (ishtovggo)یە و لە یۆنانیدا لـە (astyages) بـوو لە ساڵی (٥٨٤پ. ز) و، لە چاخی ئەودا دەوڵەتی مادی هاتە رمان لەسەر دەستی داگیرکەری فارسی کورشـی گەورە ئەوەی ئەشتۆڤیگۆ کە لە کچەکەیەوە باسکراوە. داگیرکردنی بابـل لـە سەردەسـتی کورشـدا لـە سـاڵی (٥٣٩پ. ز)دا هاتە دی (فرهنگ ایران باستان/ ل: ١٠٣-١٠٦). ئەم مەسـەلەیەمان رابـردوو بـاس کردبـوو، بەڵام بۆ جخت لەسەر کردن ئەم راستییە مێژووییەمان دوپات کردەوە. تا خوێنەران و مێژوونوسـان زیـاتر تـێ بگەن و گلەیی و گازندەمان لە وەرگێڕانەکەدا لێ نەکەن، چـونکە رەنگـە نووسـەر ئاشـنا نـەبوبێ بـە مـاد و میدیەکان کە کێن و، چییان لێ هاتووە بۆیە مەسەلەی زەردەشتی لە فارسەکاندا قوڵ کردۆتەوە.

وە تا ئاینی پیرۆزی ئیسلام هات کورد ژێر دەستەی فارس و رۆمەکان بوو، بۆیە وەکو مەسعود محمد دەڵـێ: (کورد خۆش حاڵ بوو بە هاتنی ئیسلام تا فارس و رۆمیان لە یەخە بکاتەوە). وە مامۆستا هەژار لە پێشەکی=

کتێبخانەکانی شاری (ئیستخر) و دەوری خواپەرستی بە نرخترین شت کە قەڵەمی زانا و پیاوانی ئاینی لە هەموو لقە زانستییەکاندا ڕازاندبویانەوە لە خۆیان گرتبوو، وێستگەی سەرنج و ڕوانینی قوتابیان بوو کە لە هەموو بەرزایی و بڵندایایەکەوە بۆی دەهاتن، لە کاتێکدا ئەسکەندەر بەسەر سوپای فارسیدا زاڵ بوو هاتە پایتەختی وڵاتەوە و، سەرکەوتن و زاڵ بوونی بە دەست هێنا، فەرمانی بە سوپاکەی دا کە لەو پەڕی سەرخۆشی دا بوو کە شارەکە بە هەرچی لە ناویدایە بسوتێنرێ و، کەس نەیتوانی هیچی لێ دەرباز بکات و، بە هۆی خۆبەزلزانی ئەسکەندەر و گاڵتە هاتنی بە کلتوری مرۆڤایەتی زۆربەی پەڕتوکخانەکان و، قوتابخانەکان کاول و وێران کران، لەوانەش سفرەکانی ئاڤێستا بە ڕاڤە و ڕوونکردنەوە و لێکدانەوەکانیەوە).

---

= شەرەفنامەدا نوسیویەتی کە لە کاتی دەرکەوتنی ئیسلامدا (تیشکی برایەتی و یەکسانی وە چیاکانی کوردستانیش کەوتەوە تاریکایی و ئاگر پەرستی لەسەر ڕەواندین. . . ). وە مەسعود محمد لە (ل: ٢٠)دا لە (لسان کرد)دا ئاماژە دەکات کە ئەو پادشایەی پارێزەری زەردەشت بووە کە (گشتاسب)ە یان (ڤشتاسب) و لە ئاڤێستادا ناوی هاتووە و، بۆ سەدەی (٧)ی پێش زاین دەگێڕدرێتەوە ناوەکی میدییە و، ناوی (kushtaspi) کە لە نوسراوی بزماریدا هاتووە و کە لە شای ئاشورییەوە (تیکلات بلیسەر)ەوەیە لە ساڵی (٨٥٤پ. ز)دا هەمان (گشتاسب)ە. وە ناوەکی تر کە باسی دەکات باوکی زەردەشت و دایکییەتی کە لە ڕستەیەکی ئاڤێستادا هاتووە: (ئەی زارا ئوشترە هیچ کام لە پوردشسیەیان دوغدو یان هەرابدە ئازارمەوە). (ل: ٩٠ مزدیسنا و ادب پارسی).

به کورتی لێرەدا مەسعود محمد وشەی (پور) بە (بۆر) مانا دەکات واتە خاوەنی ئەسپە بۆرە. لێرەدا (پورد) بە مانای پیر نایەت بەڵکو بە مانای (بۆر) دێت کە بە عەرەبی پێی دەوترێ (أدهم). پاشان ڕەخنە لە زانایان دەگرێ و دەڵێ: ئەگەر زانایان بە ویژدانەوە سەیر بکەن (پوروشسپە) بە مانای (خاوەنی پیرە ئەسپ) نایەت بەڵکو ئەگەر کوردی بزانن و بە ویژدانەوە بڕوانن دەڵێن: ئەمە مانای: خاوەنی ئەسپە بۆرە. . . . . !

بەڵام ئەگەر بە پێی کتێبەکەی (محمد گۆمەیی) بێ کە لە سەر زەردەشت نوسیویەتی و لە سوید چاپی کردووە (دغدو) دەغدوڤای کچی ئیبراهیم خەلیلە. ئەگەر ئەمە وابێ هەموو مێژووی زەردەشت ئاوەژو دەکاتەوە و، مێژوەکان کە لەمەڕ زەردەشت نوسراون بۆ دۆخەکی تر دەگۆڕێت! دیارە ئەمەش دور نییە لە ڕاستییە و، بەڵام ساغ کردنەوەی ئەرکی زۆرتری مێژوونووس و زانایانی دەوێت. (وەرگێڕ)

ئەسکەندەر ویستی پایتەختی وڵات لە ناو ببات و، کلتوری ئاینی کە بنـەمای دەوڵەتی فارسی بوو، ئەدگاری فارسەکان بوو بـۆ جیاکردنـەوەیان لـە خـەڵکی تـر نەیهێڵێ و، پەیوەندییان بە خواوە بپچڕێنێ و بیروبڕوای یۆنـانی بـت پەرسـتی لـە شوێن بڕوای یەکتاپەرستیدا ڕۆبنێت، ئەمەش زیانێکە لە زیـانی لـە دەسـت دایـن سەربەخۆیی سیاسی و ژێر دەستەیی و بە دیـل بـوون گـەورەترە، بۆیـە فارسـەکان ئەسکەندەر بە شەیتانی لەعین نوێنەری شەیتان و دوژمنی یەکەم ناوی دەبەن و بـە هەموو شتێکی ناشیرین و خراپ ناوزەدی دەکەن.

(تنسر) شەرع زانی مەجوسیەکان لە ڕۆژانـی ساسـانیدا بـاس لـەو بارودۆخـە دەکات کە بەسەر ئایندا دێت دوای لە دەستدانی کلتـور و کیتـابی موقـەددەس و دەڵێ: (ئەگەر سەیری کاروباری ئاین بکەیت و، هەندێ شتت نکۆڵی کـرد کـە لـە ناویدایە و پەیوەندی بەوەوە نییە دەزانـی کـە ئەسـکەندەر (١٢) هـەزار کیتـابی پێستی مانگای لە ئێمە سـووتاند لـە (ئیـستخر)دا و، سـێیەکی ئـەو نوسـراوانە مایەوە کە دەرخ کرابوو لەناو سنگی خەڵك و، بەشـێکی ئـەو بڕەیـەش کـە دەرخ کرابوو بەسەرهات و ڕووداو بوو، بەهۆی خراپی خـەڵکی سـەردەم و نـەمانی شـاو سور بوون لەسەر بیدەع و داهێنراوو، ساختەکاری و لە خۆبایی بـوون خـەڵکی لـە یادی کردو، بە شێوەیەك کە هیچ ڕاستییەکی تێدا نەمێنێ ئەوکاتە ڕاست و زیندو کردنەوەی ئاینەکە کارێکی ئاسان نیە)[١].

[١] بەڵقیـسا ڕاسـتی فـەرمووە: (إِنَّ الْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا. . . ) النمـل/٢٧. واتـە: پادشـایان و داگیرکەران بڕۆنە ناو وڵاتەکەوە خراپی دەکەن و تێکی دەدەن. هەر وڵاتێك داگیر بکرێ، یان هەر گەلێ ئـەوە بێگومان جگە لە خاك و جوگرافیا و سامانی وڵاتی، ئازادی و، کلتور و، مێژوو، ئاسایش و، پـێش کـەوتن و، هەموو دەسـتکەوتێ لە دەست دەدات. ئەمە یاسایەکی مێژووییە و گۆڕانی بەسەر دانایـەت. سـەردەمی مەگۆڵەکان کاتێ هۆلاکۆ هات بەغدای گرت هەموو کلتوری ئیسلامی کە دەستی کەوتبێ خستییە دیجلەوە، لەسەردەمی پەلاماری خاچ پەرستەکاندا بە هەزاران کتێبی ئیسلامی سوتێنرا و بە تـاڵان بـران. تـا مێـژوو دەڵێ: دیجلە هەمووی گۆڕا بوو بە مرەکەب. یان بۆ نموونە لە کاتی گیرانی ئەندەلوسدا لـە لایـەن خـاچ= =

دوای ماوەیێ شەوەزەنگی لە ژێر حوکمی یۆنانی بت پەرستیدا، فارسەکان سەربەخۆیی سیاسییان وەرگرتەوە، بەلام بنەمای کتێبەکەیان دەست نەکەوتەوە و، ئاین چووە چاخەکی لێڵەوە لە مێژوودا[1]. وە چووە قۆناغەکی تازەی زەبوونی و

پەرستانەوە وەکو (کراتشکوفسکی) لە کتێبی (اغناطیوس، دراسات في تاریخ ادب العربي)دا دەڵێ: وەکو (د: سمیر سلیمان) لە کتێبی (الاسلام والغرب/ل۱٦۰)دا هێناویەوە دەڵێ: هەر لە قورتبە بە تەنیا ساڵانە ۱٦-۱۸ هەزار کتێب دەنوسرایەوە. دوای داگیرکرانی ئەندەلوس مورییەکان (موسڵمانەکان کە مابوونەوە لە ئیسپانیادا) کتێبەکانیان دەپاراست و بە تەنگەوە هەوڵیان دەدا لە دەست نوسینگەکانی پشکنین بشارنەوە، کاتێ ناچاربوون کە وڵات چۆڵ بکەن و بڕۆن ناچار بوون کتێبەکان لە کونی دیوارەکان دایان لە ماڵەوەیاندا کە چۆڵیان کردبوو بیانشارنەوە و ژێر زەمینیان بکەن بە ڕێکەوت لە سەدەی ڕابردوودا چەند کتێبخانەیێ دۆزرانەوە. . . ). (وەرگێڕ)

[1] بە ڕاستی دەوڵەتی میدی دامەزرێنەری دەوڵەتی زەردەشتی بوون کەچی کلتورەکە هەموو بۆ فارسەکان گوازرایەوە و، ئەوان بوون بە خاوەنی کلتور و شارستانی. هەتا بەشەکی زۆری ئاینی ئیسلام زانایانی کورد دەوڵەمەندیان کرد کەچی هیچ نیشانەیەکی ئەوانی پێوە نییە. ئەمەش لەبەر چەند هۆیێ، یەکەمیان کە زۆر گرنگە ئەوەیە وەکو مامۆستا مەسعود محمد لە (لسان کرد) ئاماژەی پێ کردووە نەبونی ڕەنوسی کوردی بووە، کورد قەت نوسینی نەبووە، یان قوتابخانەی نەبووە بۆ فێر بوونی نوسینی کوردی و قەتیش بیری لەوە نەکردۆتەوە بە کوردی بنوسن، ئەمەش بەهۆی کلۆڵییەکەی کە هەردەم لەگەڵیدا بووە و قەت بیری لەوە نەکردۆتەوە کە نەنوسین بە کوردی ناتەواوی و کەم و کوڕییە. بەڵکو بە زمانی فارسی و عەرەبی و تورکی کتێب و نامەیان نوسیوە، سەیر بکە لەو زانا گەورانە (ابن تیمیە - ابن حجر - ابن اثیر - ابن خلکان - ابن حاجب - ابن صالح شارەزوری. . . . هتد). یان (احمد شوقي - الرصافي - سعید نەورەسی) سەداتی تر، چونکە لەگەڵ نەبوونی ڕەنووسی کوردی دا، زۆریان وایان زانیوە نوسین بە کوردی نەنگییە و، ناتەواوییە. میرزاکان نامەیان بە فارسی و عەرەبی و تورکی نوسیوە لە دەوڵەتدا و، قەت ئەلف و بێی کوردییان بەکار نەهێناوە، هەموو ئەو هۆکارانە بووە هۆی دواکەوتنی ڕۆشنبیری کوردی و، زمانی کوردی و، مێژووی کوردی و، کلتوری کوردی. ئەوان نەهاتن بە زمانی خۆشیان لەگەڵ زمانەکانی تردا وەکو عەرەبی و فارسی خزمەت بە ئاین و کلتوری خۆیان بکەن، ئەمەش ڕێژەی نەخوێندەواری و نەزانی و دواکەوتوویی لە ناو کوردا زۆر کرد. هەتا ئێمە ئەوەندە لە بارەی مێژووی ماد دەزانین کە گەلانی تر ناوی ئەوانیان لە نوسینەکانیاندا داوە! (وەرگێڕ)

دارمانەوە و، تێکەڵ بە ئاگر پەرستی و بت پەرستی بوو، وا بەسەریدا زاڵ بوو تا پەیوەندی بە بناغەکانی یەکتاپەرستییەوە پساند، ئەم ماوە مێژوویی یە بە (٥٦٥ ساڵ) دەخەملێنرێت، واتە تا دروست بوونی دەوڵەتی ساسانی لەسەر دەستی ئەردەشێر (٢٢٦ز) کە دوا هەوڵی خۆی هەڵسا بۆ زیندوکردنەوە و گێڕانەوەی بۆ بناغەی سەرەتایی خۆی و، دوبارە فەرز کردنەوەی بەسەر خەڵکدا وەکو ڕێبازی خەڵك و دەوڵەت[1].

یەکەم شت کە ئەردەشێر ڕووی تێ کرد لە دوای کاروباری دەوڵەتدا ئاین بوو کە تەواوی بایەخی خۆی پێدا و، بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستەش زانایان و پیاوانی ئاینی کۆکردەوە بۆ وتووێژ کردن لەسەر باشترین ڕێگا کە دەبێتە هۆی زیندوکردنەوەی زانیارییەکانی زەردەشت، لە ناو هەزاران کەس کە بەشداری ئەو کۆبوونەوە گەورەیان کرد حەوت کەسی هەڵبژارد کە باشترین (موبەزە) بوون کە موبەزی گەورە (اروبیران)، توانیان دوای لێکۆڵینەوەی تەواو لە تەواوی وڵاتدا لە ڕێگای گێڕانەوەی سەرزار ئەوەی دەرخ کراوە و لەبەرکراوە دوای پەلامارەکەی ئەسکەندەر

[1] لە کتێبی (مێژووی کورد) بۆ پۆلی دووەمی ناوەندی / دانانی لیژنەیەکی پسپۆر لە وەزارەتی پەروەردەدا (١٩٩٦-٢٠٠٠) /(چ/١) /چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە / هەولێردا هاتووە: کە ئێمە لێرەدا کورتی دەکەینەوە، کورد بەر لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام زۆر دەوڵەتی دامەزراندووە وەکو دەوڵەتی (گۆتیەکان ٢٠٠٠پ. ز) و، (کاشیەکان ١٥٨٠-١١٦٠پ. ز) و، میتانیەکان سەدەی (١٥-١٤پ. ز) و، میدیەکان (١٠٠٠پ. ز) و، (ساسانیەکان) کە چوار سەد ساڵ فەرمانڕەواییان کرد، ئەردەشێری بابك لە گیرەی شوانکارەیە (٢٥) ساڵ پادشایەتی کردووە کە دەستی بەسەر فارسەکاندا گرتووە ناوی شاهەنشاهی لە خۆناوە. وە پایتەختیان لە عیراق شاری مەدائین بووە، وە ئەڵێن بۆ یادگاری نەتەوکەیان شارەکیان لە نزیك مەدائین ناوناوە (کوروئاوا). . . . هتد.

شایانی باسکردنە (شوکرولڵای بابان) لە مێژووی کورد و کوردستاندا ساسانیەکان بە زنجیرەی دووەمی پاشایانی کورد ناو دەبات /ل٦١ سەیر بکە. واتە: دەوڵەتی میدی بە یەکەم زنجیرە دادەنێ و، لە لاپەڕە (٥٠)دا ئاماژە بە سەرکردایەتی ماد دەکات وەکو (دیائوکو - خشتریتە) و فرەوەرتیش (فەرائورت) و هوخشترە (کیاکسار) و (ئاستیاك - ئازدیهاك).

لەوێدا نووسەر (ئازدیهاك) بە سەرکردەیەکی میدی ستەمکار دەناسێنێ کە دەوڵەتی میدی بەرەو هەڵدێر دەبات کە لای کورد بە ئەژدیهاك (زوحاك) ناسراوە (ل: ٤٥). (وەرگێڕ)

کۆبکرێتەوە، دیسان لە لایـەکی تـرەوە توانیـان چـەند بەشـەکی پـەرت و بـڵاوی ئاڤێستا کۆبکەنەوە و، ئەوەی لێی دڵنیا بوون کە ڕاستە و دروسـتە لـە کتێبەکـدا ڕێکیان خست و بە کۆی دەنگی زانایان ڕێگای پێ درا.

وە لە کاتێکدا زمانی کتێبەکە لە شێوەی تازەدا هەمان زمانی ئاڤێستای کۆنە زمانەکی شاراوەیە و، لە ڕۆژگاری ئەواندا بەکارنایەت و، زۆربـەی خـەڵکی دژوارە لێی حاڵی بێ، پێویستی بە ڕاڤە و لێکدانەوەیە، ئەنجا بڕیار دراوە کـە پـسپۆڕان و شارەزایان لە پیاوانی ئاینی و ئەدەب کە ڕوونکردنەوە و ڕاڤەی پێویست بە زمـانی پەهلەوی ئەو سەردەمە بنوسن، تا بۆ هەموان ئاسان بـێ کتێبەکـە بیخوێننـەوە و لێی تێ بگەن و، کار بەو ئەرکانە بکەن کە پێیان سپێراوە و، پاشان کتێبەکـە لـە دوای نوسینەوەی تازەیدا بەسەر خەڵکیدا دابەشکرا بەو سیفەتەی نـزیکترین دەقـە لەو کتێبەی خودای گەورە بە سروشتی ڕەوانەی زەردەشتی کردووە.

کۆکردنەوەی ئاڤێستا و نوێ کردنەوەی ئاینەکە چاکسازییەکی فراوانی لەگەڵـدا بوو هەموو لایەنەکانی ژیـانی گرتـەوە زۆربـەی چـڕ بۆتـەوە لـە مەسـەلەی پاکـژ کردنەوەی بڕوای یەکتاپەرستی لـە خڵتـە و پۆخڵەواتـەکانی بـت پەرسـتی و ئـاگر پەرستی و هاوبەشی پەیدا کردن، بت و سەنەمەکانی لابردوو، پەرستگاکانی بە پێ و دانگی زەردەشتی بنیات نرا، ئاگری لەناودا دانرا وەکو هێمایەکی کە بـۆ خـوای گەورە خامۆش ناکرێت.

ئەم جۆرە چاکسازییە گشتییە بەبێ گومانی پێویستی بە کەسانێ دەبێ کە بەر لە هەموو شتێ بڕوای پێ بکەن تا ئەو پـەری هـەوڵ بـدەن ئەوەنـدەی لـە توانـا و وزەیاندا بێ لە واقعی بژێویدا پراکتیکـی بکـەن، ئەردەشـێر ئـەم مەبەسـتەی لـە موابەزەکاندا بەدی کرد و، دەسەڵاتی فراوانی پێدان و، لـە بـەڕێوەبردنی دەوڵەتـدا بەشداری پێ کردن بە کردەوە و، لە هەموو شوێنەکدا دیاری کردن بۆ هەڵسوڕاندنی وڵات و، حوکم کردن لـە نـاو خەڵکـدا بـەپێی شـەریعەتی زەردەشـتی، وە ئەگـەر کەسێکی لە غەیری ئەوان دیاری کردبێ، نامەی زۆری بۆ ناردن کە هانی دەدان بۆ پاراستنی ئاین و دادوەری لە نێوان خەڵکدا.

گرنگی دانی ئەردەشێر بە ئاینی زەردەشتی و، بایەخی ئەو بۆ دەوڵەت و خەڵك لەو ڕاسپاردەیەیان پەیمانەیەدا ڕەنگدەداتەوە کە بۆ سابور (شاپور)ی کوڕی جێنشینەکانی دوای ئەو بەجێی هێشتبوو، کە لە وێدا پێیان دەڵێت: "بزانە کە پادشا و ئاین جمکێکن، هیچ کامێ بێی ئەویتریان توانای نییە، چونکە ئاین بناغە و کۆڵەکەی پادشایە، پاشان پادشا پاسەوانی ئاینە و، پێویستە پادشاش بنەمایەکی هەبێ و، ئاینیش پاسەوانەکی هەبێت، چونکە هەر شتێ پاسەوانی نەبێ وون دەبێ و، هەر شتێ بنەما و کۆڵەکەشی نەبێ ڕماو و ڕووخاوە،[1] سەرچاوەی ئەوەی من لێتان دەترسم تەقەلای نامەردو نامرۆکانە لە ئێوە

[1] ئاین بێ پاسەوان نابێ و، پاسەوانیش بێی ئاین نابێ، قورئانی مەزن لە مەڕ ئەمەوە دەفەرمێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الأَمْرِ مِنْكُمْ). . . . . واتە: گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر و، فەرمانڕەوایەکان بکەن. بەو پێیە دوای پێغەمبەر (ﷺ) ئەرکی پاراستن و پاسەوانی ئاین لە ئەستۆی فەرمان ڕەوایانی شەرعی و دەستورییە. پێویستە جەماوەر و کۆمەڵگاش گوێڕایەڵی ئەو فەرمانڕەوایە بکەن، بۆ ئەوەی بتوانن لە وڵاتدا پارێز لە دەستور بکەن و، مافی هەموو کەس بدرێ و، یەکڕیزی وڵات پارێزراو بێ، خوشگوزەرانی و، ئازادی و، ئاسایش و، دادگەری و، یەکسانی، دابین ببێت. وەکو کۆمەڵگا و دەوڵەت دوربێ لەسەرپێچی و تاوان و، ناکۆکی و، نا ئارامی و، نا دادوەری و، کێشە. کەواتە: ئاین بێ حاکم و سەرۆك نابێ و، سەرۆکیش بێ ئاین نابێت، دەبێ کۆمەڵگاش گوێڕایەڵی ئەو ئاینە بێ کە دەستوری وڵاتە و، پارێزگاری لە مافی هەموان دەکات. بەو پێیە دەوڵەت پێویستی بە ئاینە وەکو دەستور و، پێویستی بە سەرۆکە بۆ پاراستنی دەستوور یەکێتی وڵات و، پێویستی بە جەماوەرەکی گوێڕایەڵە بۆ دەستور. پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمێ: (كان بنو اسرائيل يسوسهم الأنبياء) رواه البخاري. واتە: بەنو ئیسرائیلیەکان پێغەمبەرانیان سیاسەتی ئەوانی بەڕێوە دەبرد. وە پێویستە ئەم دەوڵەتە دەستەی پەرلەمانی و، قەزائی هەبێت، هەم وەزارەت تا بتوانن بە هەموویان یارمەتی دەستوور و سەرۆك بدەن لە بەڕێوەبردنی سیاسەتی وڵاتدا. وەکو خوا دەفەرمێ: (وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ).

(وەرگێڕ)

بۆ خوێندنی ئاین و خوێندنەوە و حاڵی بوونی، کە واتاکان لێ دەکەن دەسەڵاتی سوڵتان بە کەم و سوك بزانن، ئەنجا ئەو دەسەڵاتدارانەی بە نهێنی کارەکانی خۆیان دەکەن پەیدا دەبن لە ناو ئەو کەسانەدا کە ئێوە ڕقتان لێیان داگرتووە و خۆتان لێ لاتون کردن و، خۆتان لێ دور گرتن و، لێیان ترساون لە خەڵکی نامەرد و میللەت و خەڵکی ئاسایی وە بزانن قەت سەرۆکێکی ئاینی کە بە نهێنی کارەکانی خۆی بکات و سەرۆکێکی کە لە موڵکی خۆیدا کارەکانی خۆی بە ئاشکرایی بکات پێکەوە لە وڵاتێکدا کۆنابنەوە مسۆگەر سەرۆکی ئاینی ئەوەی لە دەستی پادشا دایە لێی دەستێنێ، چونکە ئاین بناغەیە و، پادشا کۆڵەکەیە، خاوەنی بناغەش لە پێشترە بە هەموو بیناکەوە لەو کەسەی خاوەن کۆڵەکەیە).

لە ڕاستیدا ئاین بۆ ژیان گێردرایەوە و، زانیارییەکان بەسەر خەڵکدا فەرز کرا و، شەریعەتەکەی بەسەردا پیادە کردن کە پەیوەندی بە ئاینی ڕاستەقینەی زەردەشتەوە نەبوو بەڵکو ئاینەکی دەسکاری کراوو گۆڕاو بوو، کە زۆر لە تایبەتییەکانی خۆی لە دەست دابوو، حەقیقەتەکەی گۆڕی بوو، ڕواڵەتەکانی بڕوای ناوەوەی شێواندبوو، زێدەڕەوی ناکەین کە بڵێین ئاینی زەردەشتی لە شێوەی نوێیدا تێکەڵی شتی نامۆ و جیاواز بوو، کە ئاگر پەرستی ماد و فارسی کۆنی پێکەوە کۆ دەکردەوە، هەم بت پەرستی یۆنانی و، زەردەشتییەکی گۆڕاویش و، هەر کەس بە چاوەکی لێکۆڵینەوە لەو ئاڤێستایە بڕوانێ کە ئیمڕۆ بە کار دەهێنرێ لە ناو زەردەشتییەکانی ئێران و هیند لەهەر لاپەڕەیێ لە لاپەڕەکانیدا زۆر لەو ووشانەی دێنە پێش چاو کە کۆکراونەوە.

عەرەبی بەر لە ئیسلام بەو کۆکردنەوە بێ وێنەیان لە ئاینی زەردەشتدا ووتووە (مەجوس). ووشەی (مەجوس) فارسییە و بە عەرەب کراو. واتە ئاگر پەرستان، چونکە بەر لە زەردەشتدا بەشی زۆری ئاین بڕوای ماد و فارسەکان بووە کە بە هەمان ناو ناوبراوە.بە ووردی بۆیە عەرەب بە زەردەشتییەکانی ووتووە مەجووس چونکە ئاینەکە بە تەواوی گیانی ئاینی مەجوسی بە سەردا زاڵ بووە هەر لە پەرستنی ئاگرەوە بیگری، وە ڕابردن بە بنەماکانی پاکژ کردنەوەی ئاڵۆز، تا لەبەر

کردنی پۆشاکی جیا لە لایەن پیاوانی ئاینییانەوە و، ناوبراینان بە مەگوپەت (magupet) کە لای عەرەب بە (الموبذ) ناسراوە واتە گەورەی مەجوس، یان پارێزەری ئاینی مەجوس[1].

وە ووشەی مەجوس یان مەجوسییەت گەلەك بە زۆری لە ناو دەقەکانی ئاڤێستای نوێدا هاتووە و، ئەو بڕگانەی وشەکەی تێدا هاتووە خراوەتە ناوی یان گۆڕاوە، لەوانەش کە سفری ئەلیسنا ڕایگەیاندوە کە لەعنەتی خوا دەکەوێتە سەر هەر کەسێ کە بە خراپ مامەڵە و هەڵس و کەوت لەگەڵ مەجوس (موگ- موغ magi)دا دەکات.

لێرەدا بڕگەیەکی نامۆ هەیە لە ڤندیداد کە خوا بە زەردەشت دەفەرمێ: (ئەو پیاوەی ژنی هەیە باشترە لەوەی وەك مەجوسییەك magus دەژێت). واتە: بە بێ ژنی دەژیت.

---

[1] ڕابردوو باسمان کرد کە بۆچوونی تر هەیە لەسەر ووشەی (مجوس) کە وا باس دەکات ئەم ووشەیە قەت بە مانای ئاگر پەرستی نایەت، بەڵکو ووشەی (مجوس) وەکو مامۆستا مەسعود محمد لە کتێبی (لسان کرد)دا ڕوونی کردۆتەوە لە (ل: ١٩)دا کە ئەم ناوە بۆ پەیڕەوانی زەردەشت بووە و پێیان وتوون (موغ) و یۆنانیەکان بە پێی ڕێزمانی خۆیان بۆ ماگیۆسیان گۆڕیوە و، پاشان بووە بە (مجوس). هەرچی (احسان نوری)یە لە کتێبی (مێژووی ڕەگ ڕەچەڵەکی کورد/وەرگێڕانی لە فارسییەوە/حمە کریم عارف) لە (ل٦٦)دا ئاماژە دەکات کە ووشەی (موغ-ماژ-کرمانج-ماد) یەك سەرچاوەیان هەیە لە ڕەگدا. بەو پێیە (موغ) واتە: ماد بەڵام چۆن گۆڕاوە ؟ ئەمە دیار نییە. هەتا لە (مختار الصحاح)دا لە بارەی (المجوس) دەڵێ: گەلێکە.

ووشەی (موغ- موگ) لە شیعری شاعیراندا هاتووە وەکو لە فەرهەنگی ئیریەن ڤەجدا هاتووە: (مەگۆ mago) کە هەمان واتای (مۆگ-موغ)ی هەیە. لەو شاعیرانەی کە باس لە پیری موغان دەکەن مەلای جەزیرییە کە دەڵێ: (خدمەتا پیری مۆغان دێ کت کەسێ..... ).

وە لە لای مەحوی هاتووە: (ئەو قوڕ مەساغە دەڵێن: پیری موغانە پێی بڵێن). ئەم ووشەیە بە (مۆگۆ - مۆغو mogho) بەرچاو کەوتووە.

کەواتە: مەجوس بە مانای ئاگر پەرست نایەت هەرچەند زۆر لە زمان زانەکان وەك (عمید) لە فەرهەنگەکەیدا بە ئاگر پەرست واتای کردووە. (وەرگێڕ)

ئەم بڕگانە ڕاست بن یان نە ئەوەی لە مێژوودا سەلمێنراوە ئەوەیە کە هەمیشە وشەی (المجوس) لەمەڕ نەیارانی زەردەشتدا بەکارهاتووە و بە تایبەتی بە بت پەرستانی مادی و فارس دەوترێ بەر ڕەوانە کرانی زەردەشت، وە بۆ کۆمەڵی فارس بەکارهاتووە دوای ڕەوانە کرانی ئەو، واتە بەو کەسانە وتراوە کە لەسەر پەیڕەوی باب و باپیرانیان ماونەوە و بڕوایان بە پێغەمبەرەکەیان نەکردووە[1]، بەڵام هێنانی ئاگر بۆ ناو جەرگەی عەقیدەی یەکتاپەرستییەکە و کردنی بە ڕوگە (ألقبلە) بۆ خواپەرستی و، بایەخ پێدانی بۆ پلەی بە گەورە دانان، وای لە زۆربەی دیاردەی ئاینی زەردەشتی کرد کە زۆر لە ڕواڵەتی مەجوسی کۆن جیا نەبێت[2] بەهەر حاڵ جیاوازی لە نێوان ئاینی مەجوسی و زەردەشتیدا لە لای فارسەکان و ئەو مێژوو نووسە یۆنانیانەی مێژووی ئەوانیان نووسیوە ئەو نادیارییەی پێوە نییە وەکو لە پێناسە کردنی عەرەبەکاندا هەیە بۆ ئەو دوو ئاینە، بۆ نموونە (هیرودوتس) ئەو دوانە وەك دوو ئاینی جیا باسیان دەکات و لەمەڕ شۆڕشی مەجوس لە دژی حوکمی بنەماڵەی ئەلیخانی دەڵێ: (کاتێ قەمبیز کوڕی قورش لە میسر کاری دەکرد دوو برا لە مەجوس دەرفەتیان وەرگرت بۆ دەرچوون لە گوێڕایەڵی ئەو).

یەکێ لە سەرکردەکانی قەمبیز نامەیەك بۆ قەمبیز دەنوسێ و دەڵێ:

(وا بزانم تۆ زانیوتە چی ڕوویداوە و، مەجوسیەکان لە دژی تۆ ڕاپەڕیون). هیروتس بە دوای ئەوەدا باس دەکات (دەرچونی مەجوس زۆر خەمباری کرد).

---

[1] بە بڕوای من ئەم بەکارهێنانەی ووشەی (موگ-موغ) بۆ زەردەشتییەکان وەك لە ئاڤێستادا هاتووە وەك لەم دەقەیەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ووشەی مەجوس (موغ-موگ) ناوی پەیڕەوانی زەردەشت بووە، نەك بە واتای ئاگر پەرست بێت. دیسان قورئانیش (المجوس) بۆ زەردەشتییەکانی ئەهلی کیتاب بەکاردێنێت. لێرەدا هیچ گۆڕین و ساختەییەك لە وشەکەدا نییە !

[2] لێرەدا نووسەر مەبەستی پێ لە گەورەدان و بە مەزن سەیر کردنێکە کە وەکو بە گەورە سەیر کردنی خوای گەورە بێ، ئەگینا بە گەورەدانانی دروشمی خوایی بەشێکە لە تەقوای دڵان: (وَمَنْ يُعَظِّمْ شَعَائِرَ اللَّهِ فَإِنَّهَا مِنْ تَقْوَى الْقُلُوبِ). الحج/٣٢. واتە: کێ دروشمی خوا بە مەزن دابنێ ئەوە بەشێکە لە تەقوای دڵەکان. (وەرگێڕ)

وە داریوس جێنشینی قەمبیز لەسەرەتای دەسەڵاتی سەرکردەی شۆڕش دژی ئەوان ڕاشکاوانە ڕایگەیاندووە کە سەر بە مەجووسە و بە ئاشکرا ئاماژە بەوە دەکات کە لە ئـاین و بـڕوادا لـەوان جیـان[1] هیرودوتـس باسـی مێـژووی گەڕانـەوەی دەسـەڵاتی خانەوادەکەی دەکا و دەڵێ: فارسەکان شمشێریان هەڵکێشا ئەو مەجوسـانەیان کوشـت کە تووشیان هاتن ئەگەر شەو بەسەردانەهاتبایە کەسیان دەربازیان نەدەبوو، فارسەکان ئاهەنگەکی گەورەیان لەمەڕ ئەمەوە کـرد، ئـەم جەژنـەیان گـەورەترین جەژنـە و بـە (ماگوفونیا) ناوی دەبەن واتە کوشتنی مەجوس، لەو ڕۆژەدا ڕێگا نادرێ بە مـەجوس کە بێنە ناو خەڵکی بەڵکو لە ماڵەکانیاندا دەمێنێتەوە[2].

بەهەر حاڵێ بێ ئاینی زەردەشتی کە هاتـە دورگـەی عەرەبییـەوە و لـە چـەند ناوچەی جیاجیادا بڵاو بۆوە و، هەندێ لە هۆزەکان وەك ئـاین وەریـان گـرت، کـە ئاینەك بۆ ڕواڵەتی مەجوسی بەسەریدا زاڵ بوو بوو، عەرەبیش بە ڕواڵەتی ئەو بڕوا و نەریتانەوە ناوی بردووە کە بەسەریدا زاڵ بووە.

لە کتێبی مێژوویيدا هاتووە کە گەورە پیـاوانی (بـەنو تـەمیم) وەکـو زوراەی کوڕی عەدەس و حاجبی کوڕی و، ئەقرەعی کوڕی حابس وە ئەبو سـودی بـاپیرەی

---

[1] لەو قسانەی (هیرودوتس)دا هیچ جیاوازییەك دەرناکەوێ لە نێوان مەجوس و زەردەشتییەتدا. بـەڵکو لێـرەدا دەڵێ: کاتێ قەمبیز لە میسر بووە کۆمەڵێ لە مەجووسیەکان کە بە حـوکمی ئـەوان ڕازی نـەبوون لـە ژێـر گوێڕایەڵی ئەو چوونە دەر و، هیچی تر! پاشان قورئان و سوننەت مەجوس بە ئەهلی کیتـاب دەزانـن، ئـاگر بپەرستن یان نە. مەسیحییەکان بە ئەهلی کیتاب دەزانن بڕوابە سێ خوایی بکەن یان نە! (وەرگێڕ)

[2] لێرەدا مەجوس مەبەست لە زەردەشتییە میدییەکانـە کـە زەردەشـتی ڕەسـەنن، بـەڵام فارسـەکان ئەوانـەن دەوڵەتی میدی دەڕوخێنن و چەند جار پەلاماری دەدەنـەوە. لـە دوایـشدا بـۆت دەردەکـەوێ کـە مـەجوس زەردەشتی ڕەسەنن نەك فارسەکان و، نوسەری کتێبەکەش زۆر فەرموودەی لەمەڕ ئەمـە هێناوەتـەوە وەکـو: (في خلافة علي -ر- اشكل امر المجوس على البعض من الصحابة، كيف تأخذ الجزية من المجوس وهـم ليـسوا باهل الكتاب فارتفع الاشكال الى علي ابن ابي طالـب فقـال لهـم: انـا اعلـم النـاس بهـم كـانوا اهـل كتـاب يقرئونه، وعلم يدرسونه فنزع من صدورهم. . . . ) وەك دوایی باسی دەکەین لە نـاو کتێبەکـەدا و نووسـەر هێناویەوە. ئایا ئەمە بەڵگە نییە کە مەجوس ئەهلی کیتاب بوون نەك فارسەکان؟! (وەرگێڕ)

وەکیعی کوڕی حەسسان بڕوایان بە مەجوسییەت هێناوە، کاتێ فارس و مەجوسیان چوو نەلا.

لە یەمەندا مەجوس هەبووە، بەشی زۆری ئەوانە لە سوپای فارسی مابونەوەکە کیسرا ڕەوانەی کردبوون بۆ دەرکردنی سوپای حەبەشە لە یەمەندا و، کە خۆیان و کوڕەکانیان لەسەر مەجوسییەت بوون، بەڵام مەجوسی عومان و، پاشماوەی تر لە ناوچەکانی باشوری دورگەی عەرەبیدا لەو فارسانە بوون کە بە مەبەستی بازرگانی لەوێدا مابونەوە و، دەستیان بەسەر زەویەکەدا گرتبوو، لە کاتی دەرکەوتنی ئیسلامدا هیچ دەسەڵاتی سیاسییان نەما و، لە کاتێکدا وڵاتەکە موسڵمان بوو، هەندێ لەو مەجوسانە سەرانەیان (الجزية) دا و، ئەوانی تر موسڵمان بوو.

هەرچی مەجوسی بەحرەینە لە مەجوسی یەمەن زۆرتر و بە دەسەڵاتتر بوون، چونکە لە ئیمپراتۆری ساسانی نزیکتر بوون و، فارسەکانیش کەنارەکانی بەرامبەر ئەوییان داگیر کردبوو، لێکۆڵەران زۆر گۆڕیان دۆزییەوە، هەروەها زۆر لە پەرستگاکان کە بۆ ئەوان دەگەڕێنەوە، لە کاتێکدا لە ڕێگای پیاوێکی فارسی بە ناوی (سیبەخت موزبان) بانگەوازی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) پێ گەیشت کە لە هەجەردا حاکمی فارسی بوو، دوای موسڵمان بوونی ئەو، کۆمەڵێکیش لەگەڵ ئەودا موسڵمان بوو، ئەوانەی لەسەر ئاینی خۆیان مابوونەوەی سەرانەی دان.

ئەوەی سەیرە مێژوونوسەکان نەیان بیستووە کەسیان لە پادشا و فەرمانڕەواکانن حیرە کە فارسەکان لە سەر عەرەبیان دانا بوون چووبنەوە ناو مەجوسییەوە، کەچی زۆر پەیوەندی دار بوون بە ئەوانەوە و، بوونی فارس لە خاك و پایتەختی ئەواندا هەبووە، کەچی بیستوومانە هەندێ لەوانە بوون بە گاور و نەسرانی، ئەوەی دەردەکەوێ ئەوەیە ئاینەکە لە کۆتاییدا بۆ ئاینەکی نەتەوەیی تایبەت بە خۆیان گۆڕا وەکو توخمی ئاری لێ هات و، ئێستا مەجوسی ئێران و هیند لەسەر ئەوەن.

خوای گەورە پەیامی دواییني خۆی بۆ سەر عەرەب و سەرجەم گەلان نـارد کـە ڕاستی ئاینی زەردەشتی دەربخات، خوای گەورە دەفـەرمێ: (الَّـذِينَ آمَنُـوا وَالَّـذِينَ هَادُوا وَالصَّابِئِينَ وَالنَّصَارَى وَالْمَجُـوسَ وَالَّـذِينَ أَشْـرَكُوا إِنَّ اللَّـهَ يَفْـصِلُ بَيْـنَهُمْ يَـوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ).واتـە: ئەوانـەی بڕوایـان هێنـا و، ئەوانـەی جولەکەن و، صابیئەکان و، مەسیحییەکان و، مەجوسیەکان و ئەوانەی هاوبەشییان پەیدا کرد خوا لە قیامەتدا حوکمیان لە نێواندا هەڵدەبڕێتەوە، خوا بەسەر هـەموو شتێکدا بینەرە.

مەجووس لە ئایەتەکەدا ئاکشرا دیارە و، لە کاتی ڕیز کردنی پۆلی خەڵکدا لـە ڕیزی بت پەرستاندا داینەناون بەڵکو بە پۆلێکی داناوە لە ئەهلی کیتاب و جیا لـە شـیرك و خـاوەن شـیرکەکان، لەمـەدا وەکـو بـڕواداران و یـەهود و صـابیئە و نەصرانیەکانە و، بەلای کەمەوە وەکو ئەهلی کیتاب وان.بەو پایە قورئـان دان بـە مەجوسدا دێنێ کە لە بنەڕەتدا ئەهلی کیتابن و خاوەن نامە بوون، وەکو چۆن بڕوا بە بناغەکانی ئاینی یەهود و نەصرانی و صابیئە دەکات و، نکۆڵی لـەو گـۆڕان و دەسکاریە دەکات کە سەر ئاینی خۆیاندا هێناویانـە، کەواتـە: ئـەو نکـۆڵی لـەو دینەی زەردەشتییەت دەکات کە تێکەڵ بە غەیری خۆی بووە کە دوایـی بـووە بـە مەجوسی کە پەیوەندی بە سروشی خواوە نەماوە[1]. ئاشکرایە و بەڵگە نەویستە کە دەرچوونی خاوەن نامە ئاسمانیەکان لە ڕێنومایی پەروەردگاریان و، دورکەوتنەوەیان لە ڕێبازی ڕاستی خوا و، بڵاو بوونەوەی هاوبەشی پەیدا کردن لە نـاو بڕوایانـدا و،

[1] لێرەدا نووسەری کتێب دەڵێ مەجوس و زەردەشتییەت لە یەکتر جیان و، مەجوسەکان ئاگر پەرسـتەکانن کـە بەر لە زەردەشتییەت هەبووە، کەچی لێرەدا خۆشی ئایەتی قورئانی هێناوەتەوە کە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی مەجوسی ناوی ئاینی زەردەشت و ناوی پەیڕەوانی ئەوە، کەواتە: مەجوسی بە مانای ئاگر پەرسـتی نایـەت، چۆن مانای نەسرانی بە مانای سێ خوایی نایەت. خوێنەران و زانایان خۆشتان دوای لێکۆڵینەوە لە بۆچوونی ئێمە و نووسەر ڕاستی ئەوەتان بۆ ئاشکرا دەبێت!

ڕابردووش ڕونتر تیشکمان خستە سەر ئەم ڕاستییە. (وەرگێڕ)

زاڵ بوونی ڕواڵەتی هاوبەشی پەیدا کردن لە ژیانیدانـدا، هـەموو ئـەو شـتانە ئـەو وەسفەی لێ نەسەندنەوە کە خوا بە ئەهلی کیتاب ناویان دەبات و، لەو ئەدگارەیان دانا بڕێ کە پێی لەو گەلانە جیا دەبنەوە کـە نامـەی ئاسمانیـان نییـە وەکـو پـت پەرستەکان و غەیری ئەوان.

پێغەمبەریش (ﷺ) لەسەر ئەو دان پێداهێنان و بڕوا پێ کردنەی قورئان ڕۆیشت و مەجوس و ئەهلی کیبابی لە یەك ئاستدا دانـان و بـە هـەمان حـوکمی ئـەهلی کیتاب لە گەڵیاندا جولایەوە، لە ئەبوو هورەیرە گەڕاوەتەوە (رضي الله عنه) کـە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ما من مولود الا يولد على الفطرة فـابواه يهودانـه وينـصرانه ويمجسانه، كما تنتج البهيمة بهيمة جمعاء هـل تحسون فيهـا مـن جدعـاء). واتـە هەموو منداڵێ کە پەیدا دەبێ لەسەر پاکی پەیدا دەبێ بەڵام بـاوانی دەیکـەن بـە جولەکە و گاور و ئاگرپەرست، وەکو چۆن ئاژەڵ ئاژەڵێکی بە لەشـێکی تـەواوە لێ دەبێت ئایا هەست پێ دەکەن گوێی بڕ ا بێت؟

کە ئەوان ئەهلی کیتـابن وەکـو جوولەکـە و مەسـیحییەکان پێغەمبـەر (ﷺ) مەجووسی دورگەی عەرەبی لە عەرەب و فارس وەکـو ئـەهلی کیتـاب مامەڵـەی لەگەڵدا دەکردن، واتـە لەسـەرانە و بـاج وەرگرتنـدا لێیـان، پێغەمبـەر (ﷺ) لـە بارەیەی ئەوانەوە دەفەرمێ: (سنوا بهم سنة اهـل الكتـاب غـير آكـل ذبـائحهم ولا ناكحي نساءهم). واتە: مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن وەك مامەڵـەی ئـەهلی کتـاب، جگە لەوەی نابێ ژنیان لێ بخوازرێ و سەر بڕاویان لێبخورێ.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) مەجوسی هەجەر نامەیەکی نووسـی وەکـو (ابـن سـعد) لـە (طبقات)ی دا و (ابو يوسف) لە (الخراج) داگێڕاویەوە کە ناوەڕۆکەکەی هەمان ناوەڕۆکی فەرموودەی ڕابردووە و، ئەوەی تێدایە کە: ئیسلامیان پیشان بـدات، کـە یـاخی بـوون سەرانەیان لێ وەردەگیرێ و ژنەکانیشیان مارە ناکرێن و، سەر بڕاوەکانیان ناخورێن.

وە پێغەمبەر (ﷺ) نامەیەکی بـۆ (منـذر بـن سـاوي الاخـنس) فـەرمان ڕەوای بەحرەین نارد کە (العلاء الحضرمي) هەڵی گرتبـوو، ئەمـەش دەقەکەیـەتی: (مـن

محمد رسول الله الى المنذر بن ساوي، سلام الله عليك، فاني احمد الله الذي لا اله الا غيره، واشهد ان لا اله الا الله وان محمدا عبده ورسوله، اما بعد:

فاني اذكر الله عزوجل، فانه من ينصح فانما ينصح لنفسه، فانه من يطع رسلي ويتبع امرهم فقد اطاعني، ومن نصح لهم فقد نصح لي، وان رسلي قد اثنوا عليك خيرا، واني قد شفعتك في قومك فاترك للمسلمين ما اسلموا عليه وعفوت عن اهل الذنوب فاقبل منهم، فانك مهما تصلح فلن نعزلك عن عملك، ومن اقام على يهوديته او مجوسيته فعليه الجزية).

واتە: لە (محمد) پێغەمبەری خواوە بۆ مونزیر کوڕی ساوی، سەلامی خوات لێ بێ، من سوپاس و ستایشی ئەو خوایە دەکەم کە جگە لەو هیچ خوای تر نییە، وە گەواهی دەدەم کە جگە لە ئەڵلا هیچ ئەڵلای تر نییە و، (محمد)یش بەندە و پێغەمبەری ئەوە، لە پاشاندا: من خوای شکۆدارت یاد دەخەمەوە، هەر کەس ئامۆژگاری وەربگرێ ئەوە بۆ خۆیەتی و، هەر بە گوێی نامەبەرانی من بکات و شوێن کاری ئەوان بکەوێ ئەوە گوێ ڕایەڵی منی کردووە و، کێ بە ئامۆژگاری ئەوان بکات ئەوە بە ئامۆژگاری منی کردووە، وە نامەبەرانم زۆر ستایشی تۆیان کردووە بە چاکە و، تۆم کردووە بە یاریدەدەر لە ناو گەلەکەتدا، لە موسڵمان گەڕێ لە سەر ئەوەی لەسەری موسڵمانان بوون و، لە تاوانباران بوراون و تۆش لێیان وەربگرە، وە تۆ هەرچی بکەی قەت لەسەر کارت لاتنابەم و، کێ لەسەر یەهودییەت و مەجوسییەتی خۆی بمێنێتەوە ئەوە دەبێ باج بدات[1].

[1] بێگومان ئەمە ئەوپەڕی ئازادی دانە بە گەلان و نەتەوەکان و خاوەن ئاینەکانی جیا لە ئیسلامدا لە سایەی حوکمی دەوڵەتی قورئاندا، سەیر بکە چۆن پێغەمبەر (ﷺ) داوا لەو سەرکارە دەکات کە تۆ ئازادی بیروبڕوا بە موسڵمانانی ژێر دەوڵەتی خۆت بدە و، تۆش لە دەوڵەتی خۆتدا ئازادی موسڵمان دەبی یان لەسەر ئاینی خۆت دەمێنیەوە و، من دەست لە کاروباری تۆ وەرنادەم، مادام دادگەر بی و، ئازادی و ئاسایش بۆ گەلانی ژێر دەستت دابین بکەیت بەڵام دەبێ سەرانە بدەیت کە مانای فیدراڵییەتی تێدا بەدی بکرێت و، ئەم دەوڵەتە سەر بە دەوڵەتی ناوەندی بێ کە دەوڵەتی قورئانە! (وەرگێڕ)

ئەبو بەکری صددیق (ﷺ) لەسەر هەمان سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشت و، دوای ئەویش عومەری فاروق لەسەری ڕۆیشت، یەکێ لەو بەسەرهاتانەی گەڕاوەتەوە ئەوەیە کە: گەڕاوەتەوە میرزایەکی (کاتب) جەریری کوڕی معاوییە کرا بە بریکار لەسەر شارەکانی(مەنازیر و دەست و میسان) کە دەکەونە لای خوزستان لە نێوان فارس و واست و بەصرەدا، بۆ عومەری کوڕی خەتتاب گێڕایەوە کە گەلێ هەیە ئاگر دەپەرستن کە نە جوولەکەن و، نە مەسیحی و نە ئەهلی کیتاب، عومەر ووتی نازانم چی بکەم لەگەڵ ئەوانەدا، (عبدالرحمن ابن عوف) ووتی: شاهیدی دەدەم کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (سنوا بهم سنة اهل الکتاب) واتە: بە یاسای ئەهلی کیتاب لەگەڵیان دا بجولێنەوە، عومەری خەتتاب بۆی نووسی کە سەرانە (الجزیه) لە مەجووسەکانی لای خۆت وەربگرە و، پێغەمبەری سەرانەی لە خەڵکی هەجەر وەرگرتووە.

وە لە سەردەمی جێنشینییەتی عەلیدا (ﷺ) هەندێ لە صەحابەکان لەمەڕ مەسەلەی مەجوسدا خستە دوو دڵی و نا ڕوونییەوە کە چۆن سەرانە لە مەجوس وەردەگیرێ و کەچی ئەهلی کیتاب نین، دوو دڵیە کە بەرز کرایەوە بۆ عەلی کوڕی ئەبو تالب (ﷺ) پێی فەرموون: (أنا اعلم الناس بهم، کانوا اهل کتاب یقرؤنه و علم یدرسونه فنزع عن صدورهم، سأحدثکم بحدیث ترضیانه جمیعا عن المجوس، ان المجوس کانوا امة لهم کتاب یقرؤنه، وان ملکا لهم شرب حتی سکر فاخذ بید اختە فاخرجها من القریة، فاتبعه رهط فوقع علیها وهم ینظرون الیه، فلما افاق م سکره قالت له اخته انت صنعت کذا و کذا، وفلان وفلان ینظرون الیك، فقال ما علمت بذلك، فقالت انت مقتول الا ان تطیعني، قال فاني اطیعك؟ قالت: فاجعل هذا دینا، وقل هذا دین آدم، وقل حواء من آدم وادع الناس الیه، واعرضهم علی السیف فمن تبعك فدعه، ومن ابی فاقتله، ففعل، فلم یتبعه احد و قتلهم یومئذ حتی اللیل، فقالت ان الناس قد اجتروا علی السیف، فاوقد لهم نارا ثم اعرضهم

عليها، ففعل فهاب الناس النار فاتبعوه، وقاتلوا الذين خالفوهم، فاصبحوا وقد اسرى على كتابهم فرفع بين اظهرهم، وذهب العلم الذي في صدورهم، فهم اهل الكتاب، وقد اخذ رسول الله (ﷺ) وابو بكر وعمر الجزية منهم).

واتە: من لە هەموو کەس ئاگادارتر و زاناترم لەمەڕ ئەوانەوە، ئەوانە ئەهلی کیتاب بوون دەیانخوێندنەوە و، خاوەن زانست بوون دەیان خوێند و، لە سینەیاندا هەڵگیرایەوە و، بەسەرهاتەکتان بۆ دەگێڕمەوە هەمووتان لە مەجووس ڕازی دەکات، مەجوس نەتەوەیەك بوون کتێبەکیان هەبوو دەیانخوێندەوە پادشایەکیان هەبوو[1] ئەوەندەی شەراب خواردەوە تا مەست و سەرخۆش بوو، دەستی خوشکەکەی گرت و لە شاری بردە دەرەوە و، خەڵکێکی دوا کەوت و، ئەنجا زینای لەگەڵدا کرد و خەڵکەکەش سەیریان دەکرد، کاتێ هاتەوە هۆش خوشکی پێی ووت: تۆ ئاوا ئاوات لێ کردوم و، فلان و فیسار سەیری تۆیان دەکرد و، وتی من ئاگام لەمە نەبووە، ووتی: ئەگەر بە گوێم نەکەیت تۆ کوژراویت، ووتی: من بە گوێت دەکەم، ووتی: ئەم مەسەلەیە بکە بە ئاین و یاسا و، بڵێ ئەوە ئاینی ئادەم بووە و، بڵێ حەوا لە ئادەم پەیدا بووە و، خەڵکی بۆ ئەمە بانگێشە بکە، بە شمشێر هانیان بدە کێ بە قسەی کردی لێی گەڕێ و، کێ یاخی بوو بیکوژە، ئەویش ئەو کارەی کرد کەس بە گوێی نەکرد و، ئەو ڕۆژە تا شەو ئەوانی کوشت، ئەنجا (خوشکەکەی ووتی: خەڵك لە شمشێر ناترسن، ئاگرێ بکەوە ئەنجا هانیان بدە ئەو کارە بکەن، خەڵکەکە لە ئاگرەکە ترسان و، بە قسەیان کرد و، ئەوانەی قسەی ئەویان شکاند کوشتنی. کە بەیانیان کردەوە و، بە شوێن کتێبەکەیاندا گەڕا لە ناویاندا بەرز بۆوەوە زانیاری یەکەیان لە دڵدا ڕەش بۆوە و، ئەوان ئەهلی کیتابن و، ئەبو بەکر و، عومەر و سەرانەی لێ وەرگرتوون). لە پاش یارانی پێغەمبەریش (ﷺ)

[1] لێرەدا مەبەست لە شا قەمبیزی کوڕی کورشە کە لەم کتێبەدا بە زولقەرنەین ناسێنراوە. نوسەریش خۆی لە پەراوێزدا کە ئاماژەمان پێ کردووە ئەم مەسەلەیەی باس کردووە. ئێستا دەتوانی سەیری پەراوێز بکەیت ژمارە (٢٦١).

شەرع زانەکان لەسەر ئەوە کۆبوونەوە کە (ﷺ) کە دەبێ سەرانە و باج لە مەجوسەکان وەربگیرێ، لەسەر حەرامی ژنەکانیان خواردنی سەر بڕاوەکانیان جیاوازی و ناکۆکی هەیە، هەیانە حەلاڵی کردووە وەکو شافعی و، هەیانە حەرامی کردووە، بەلام خەریکە لەسەر ئەوە کۆبوونەوە و ئیجماع ببێ کە دروستە و حەلاڵە، (ابن عبدالبر) لە (ابن مسیب) گێڕاویەوە کە سەربڕاوی مەجوسی هیچ کێشەی نییە، ئەگەر موسڵمانێ فەرمان بە کوشتنەوەی بدات. (ابن شیبة)لە (عطاء) و (طاوس بن عمرو بن دنیا) گێڕاویانەوە کە ژن هێنان لە مەجوسی قەیدی نییە. شێخ محمد ڕەزا دوای ئەوانە فتوای داوە کە دروستە سەربڕوای مەجوسی بخورێ و، ژنیان لێ بخوازرێ، بەو پایەی کە ئەوانە ئەهلی کیتابن نەك بت پەرست.

بەلام لەمەڕ ئەوەی کە ئایا ئەوانە ئەهلی کیتابن وەکو جولەکە و مەسیحی هەندێ لە شەرع زانەکان لە مەلایانداوە و دەڵێن: ئەوانە ئەهلی کیتاب نین بەڵکو سەرانە بە قورئان لە جوولەکە و مەسیحی وەرگیراوە و، بە سوننەت لە مەجوسییەکان وەرگێراوە، چونکە لەم فەرموودەیەدا کە دەفەرمێ: (بە سوننەتی ئەهلی کیتاب سەودایان لەگەڵدا بکەن) هەست بەوە دەکرێ کە ئەهلی کیتاب نەبن، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) تەنیا لە سەرانەدا وەکو ئەهلی کیتاب مامەڵەی لەگەڵدا کردون.

هەندێ لە فەقیهەکان وەکو (ابو حنیفە) و (ابو ثور) و (ابن حزم) بۆ ئەوە دەچن کە مەجوس ئەهلی کیتاب بن، بۆ نموونە (ابن حزم) دەڵێ: (بەلام مەجوس دانیان پێداهێنراوە و بڕیاریان لەسەر دراوە کە ئەو کتێبەی ئاینی ئەوانی تێدا بووە، ئەسکەندەر سوتاندویەتی، کە دارای کوڕی دارا کوژرا، وە زیاتر لە دو سێیەکی کتێبەکە ڕۆیشتوە، کەمتر لە سێیەکی ماوەتەوە، شەریعەتەکە لەگەڵ بەشە ونبوەکە دایە، ئەگەر ئەوە سیفەتی ئاینەکەیان بێ، قسە کردن دەربارەی حەق نییە و، چونکە زۆربەی وون بووە و، خواش ئەرك ناخاتە سەر کەسێ کە نەتوانرێ

بیپارێزێ هەتا پێی نەگات و، هەر کتێبەکی شتی ناڕاستی تێدا بێ ئەوە بەتاڵە و هەڵبەستراوە و لە لایەن خواوە نییە، تێك چوونی ئاینی مەجوس سەری هەڵدا چۆن تێك چوون لە ئاینی جوولەکە و مەسیحیدا پەیدا بوو بێ جیاوازی لە ناویاندا.

لە هەردوو بارودۆخدا لێرەدا فەقیهەکان دان بە بەرزی ئاستی مەجووسەکان دادێنن، هەم بە پلە و پایەیان ئەگەر لەگەڵ بت پەرستی و بت پەرستاندا بەراورد بکرێت، بۆیە لەگەڵ ئەهلی کیتابدا لە جوولەکە و مەسیحی پۆلێن کران و، وەکو خاوەن نامەی ئاسمانی سەیر کران، لەو گۆشەیەوە کە ئیسلام پێی تەماشای هەردوو ئاینەکان دەکات لەو گۆشەیەشەوە سەیری مەجوسی دەکات وەکو ئاینەکی ئاسمانی، نەك بەپێی ئاڤێستا وەکو کتێبەکی سروش کراو لە لایەن خواوە و، بە گوێرەی تەورات و ئینجیل بێ هیزترە، لەگەڵ بوونی جیاوازییەکی زۆر لەنێوان ئەو سێ کتێبەدا[1].

---

[1] لە (فقه السنة/السید سابق/ج٢/ل: ١٠٥)دا هاتووە "کە حەنەفیەکان بڕوایان وایە هەر کەس بڕوا وابێ ئەوانە خاوەن ئاینی ئاسمانین و، کتێبیان هەیە و بۆیان دابەزیوە وەکو پەڕاوی ئیبراهیم و شیت و، زەبوری داود (ع) دروستە ژنیان لێ بخوازرێ و ئاژەڵی سەبڕاویان بخورێ، مادام هاوبەشی پەیدا نەکەن" "بەڵام ئەحمەد ئەوەی قبوڵ نییە مەجوس کیتابی ئاسمانییان هەبوێت) وە هەندێ لە شافعییەکان قبوڵیان نیە ژنیان لێ بخوازرێت.

هەمیسان بەشێکیش لە زانایانی حەنەفی وەکو لە (فقه السنة/ج٢/ل: ١٠٤-١٠٥) ئاماژە پێ کراوە. وە هەرچی (صابیئە)یە لای (المجاهد) بەشێکن لە ئەهلی کیتاب و زەبوور دەخوێنن. (القرطبي) بڕوای وایە یەکتاپەرست بن. دیارە هەیە بە ئەهلی کیتابیان نازانێ، بەڵام ئەمە پێچەوانەی دەقی قورئانە کە مەجوس و صابیئە) بە ئەهلی کیتاب و جیا لە بت پەرستان لە قەڵەم دەدات. (وەرگێڕ)

## بەندی پێنجەم: زەردەشتییە هاوچەرخەکان:

لە ئاکامی هاتنی ئیسلام بۆ ناو ئێران لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتتابدا (ﷺ) ڕژێمی سیاسی لاچو کە شەرعییەتی بوونی خۆی لە بنەڕەتدا لە ئاینی زەردەشتی وەردەگرت، ئەو شتەی ئاینەکە لە دەستی دابوو شێوازی پیادە کردنی و پراکتیك کردنی یاساکان و زانیارییەکانی ئەو بوو لە ژیانی خەڵکیدا، بە دوای ئەوەشدا سەرەتای کۆتایی هاتنی ئاینەکە کە هێزەکی زیندەگییە لە کۆمەڵگادا دەست پێ دەکات.

بێگومان فارسەکان بەر هاتنی ئیسلام بۆ ناویان گوێیان لەو بیرو بڕوا و پرەنسیپانە بوو بوو کە ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) بانگەوازی بۆ کردبوو، لە کاتێکدا ناسییان و، لە نزیکەوە هەستیان پێی کرد بینیان کە ئەم ئاینە کە کاروباری بنەڕەتیدا لەگەڵ ئاینی ئەوانەدا یەك دەگرێتەوە و، دیارترینیان پاکژ ڕاگرتنی خوای گەورەیە بە ڕەهایی و، هاندان بۆ کرداری باش و، خۆش ویستی چاکە و چاکە خوازی و، قەدەغە کردن لە خراپەکاری لە زەویدا. لە سەروی ئەوەشەوە لێرەدا ژیانێکی تر هەیە کە چاکەکاران پاداشتی تێدا وەردەگرن و، خراپەکارانی تێدا سزا دەدرێن و، دڵنیابوون کە سەرچاوەی هەردوو ئاینەکان لە یەك سەرچاوەیەوە. هیچ ڕوو لێ وەرگێڕان و کەمتەرخەمیان لە بەرامبەردا پیشان نەدا وەك بۆ بت پەرستنی یۆنانی پیشانیاندا لەکاتی هەڵمەتی ئەسکەندەری مەقدونیدا و، لە هەمان کاتدا لە وەرگرتنی بیروبڕوای ئیسلام هیچ دژواری و ئاستەنگ نەهاتە پێشیان، وە نە هیچ شەکەتییەکیان بینی بۆ گرتنە بەری داخوازییەکانی زانیارییەکانی، بۆیە زۆر بە فراوانی باوەشیان بۆ کردەوە[1] کۆمەڵێ

[1] ئەگەر ئێمە چاوێك بە مێژووی میللەتی کوردا بگێڕین لەکاتی پەیدا بوونی ئیسلامدا دەبینین کورد دوای ڕووخانی دەوڵەتی میدی دەکەوێتە ژێر حوکمی فارسەکان، وە لەسەر ئاینی زەردەشتی بوون و=

= حوکمیان پێ کردووە لە کاتی سەرهەڵدانی بانگەوازی ئیسلام و بڵاو بوونەوەی دەنگ و دۆیەکەی لە ناو کوردا خۆشحاڵی خۆیان لە بەرامبەردا نیشاندا، با دەقی هەندێ لە مێژوو نووسان وەربگرین لەمەڕ هەڵوێستی گەلی کوردی زەردەشتی لەگەڵ سەر هەڵدانی ئاینی ئیسلامدا:

١- (محمد مەردۆخی) دەڵێ: (کوردەکان بینیان و تێ فکرین کە ئەم ئاینە تازەیە بە تەواوی موافقی تەبع و ویژدانیانە لەبەر ئەوە بە ئاسانی بەرە بەرە قبوڵیان کرد).

٢- مەسعود محمد دەڵێ: (کورد خۆشحاڵ بوو بە هاتنی ئیسلام تا ڕۆم و فارسیان لە کۆڵ بکاتەوە).

٣- مامۆستا ڕەشید چاوشلی لە کتێبی (التراث التأريخي للقومية الكردية)دا دەنووسێ: (هەندێ لە زانا و کاربەدەستانی کورد لەسەردەمی خەلافەتی عومەری کوڕی خەتتابدا -ر- سەفەریان کرد بۆ مەدینە و، لەو سەردانەدا چاویان بە خەلیفەی ئیسلامی دادگەر کەوت و، بەر لە هاتنی سوپای ئیسلام بۆ ئێران و عێراق و ئەنازۆڵ بانگەوازیەکی فراوانیان بۆ ئیسلام کرد و، بوون بە بانگەوازکەری ئیسلام و، بۆ ئەوەی خەڵکی ڕاپێچ بکەن بەرەو ئەو ئاینە پاکژە و، بەر لە هاتنی سوپای ئیسلام بۆ باشوری عێراق کوردەکان ئاینی ئیسلامیان پەسەند کرد وەکو ئاین و بیروبڕوایەکی هەتا سەر).

٤- (عباس العزاوي) لە کتێبی (عشائر العراق الكرديه) دا دەنووسێ:

مێژوو لە ڕێڕەوو ڕووداوە دورو لەمێژینەکانی خۆیدا دەری خستووە کە ئەو ڕەگەزە (کوردەکان) هەر لەو کاتەوە هاتنە ناو ئیسلام بوون بە گرنگترین بناغە بۆ ئیسلام و، بۆ بڕوای خۆیان دڵسۆز بوون، بیروبڕوای بەرزی ئەو بە تەواوی کاری تێ کردون و، پاشان بەشەکی فراوانی شارستانی و شوێنەکی پەسەندیان وەرگرت. کە وای لێ کردن ببنە گرنگترین بناغەکانی ڕابونی، زاناکان و ئەدیبەکانی و، مێژوونووسانی و، سیاسەتمەدارانی و، شارەکانی و پیشەسازیەکانی هەموو ئەوانە بەڵگەیەکی بەرجەستەن لە سەر وەرگرتنی ئەم پلە بەرزەیە) وە مێژوو لەوانە (ابن حجر)باس لە گاوانی کوردی دەکات کە ئەگەڵ دەرکەوتنی ئیسلام دا چووەتە لای پێغەمبەر و (ﷺ) بووە بە یاری ئەو خۆشەویستە، وەکو چۆن سەلمانی فارسی یەکەم فارسە دەبێ بە سەحابی، گاوان(کابان) یەکەم کوردە دەبێتە یاری پێغەمبەر و(ﷺ) نوێنەری میللەتی کورد.

پاشان لە ناو سەرچاوە زەردەشتییەکاندا ئاماژە بە هاتنی ئیسلام و سەرهەڵدانی (محمد المصطفى (ﷺ)) کرابوو، ئەمەش زیاتر دڵنیایی بە زەردەشتییەکاندا لە کورد و لە فارس کە بەرەو ڕووی ئیسلام بچن و پەسەندی بکەن. چونکە ئەگەر ئاڤێستا نامەی زەردەشتی کوڕی ئیبراهیم بێ، ئەوە قورئانیش نامەی (محمد المصطفى (ﷺ)) کە نەوەی ئیبراهیمە (ﷺ) و، نوێترە و، شوێنی ئاڤێستای وون بوو دەسکاری کراو دەگرێتەوە.

وە لە دوای ئیسلامدا زۆر میرنشینی لە ناو کوردا پەیدا بوون وەکو: (هەزبانیە و بەکتینیە (٥٢٢-٦٣٠ك) و مازنجان و دلکەندییە - دلقەندییە). (وەرگێڕ)

لە فارسەکان ئەوەیان هەڵبژارد، کە دەست لە زەردەشتییەت بەر نەدەن و لەسەر کلتورو فۆلکلۆری باب و باپیرانیان بێننەوە، هەم لەسەر ئەو پاشماوە ئاینییەی ماوەتەوە لەم ئاینەی پێغەمبەرەکەیاندا، ئیسلام نەهات ڕێگا لەو هەڵوێستەیان بگرێ بەڵکو ڕێزی لە خوا پەرستی و داب و نەریت و پەرستگای ئەوان (پەرستگاکانی ئاگر) گرت و، تەنیا بە دانی سەرانە نکۆڵی لێ دان کە لە سەر هەموو ئەهلی کیتاب فەرز کرا بوو، ئەوان دروشمی ئاینی خۆیان بەو پەڕی ئازادییەوە بەڕێوە دەبرد، لە هەموو ئەو شوێنانەدا کە موسڵمانان بە دەستیانەوە بوو، بێ ترس و بیم بوون.

ئەم کۆمەڵەیە لەگەڵ کەمینە ئاینەکانی تردا لە ژێر لێ بوردەیی ئیسلامدا ژیان هەر لەو کاتەوە کە ڕزگاری هاتە ناویانەوە، پاشان لە سەدەی (٣)ی کۆچیدا بەرەبەرە لە کەمیان دا، تا ئێستا کە بەپێی سەرژمێری (١٩٦٠) ژمارەیان نزیکەی (١١٠٠٠) کەسە. زۆربەیان لە کۆمەڵگاو ئوردوی بچوکدا دەژین لە سەرپەری دەشتاییەکانی هەردوو شاری (یزدوکرمان)دا و، کەمێکی ئەوانە لە تاران و پاشماوەی شارەکانی تردا دەژین.

مەجوسی ئێران لە ناو موسڵماناندا بە ناوی (الکفار) ناوبراون، بەڵام ئەوان جار هەیە بە زەردەشتی و جارێك بە ناوی خاوەن ئاینی ڕاست (bah- dinan) ناوی خۆیان دەست بە ناوەکەی دواییەوە بگرن‌و لای خەڵکی تر باسی نەکەن.

لە بەرامبەری ئەوەشدا، مەجوسی ئێران وەکو مەجوسی هیندستان بە خۆیان دەڵێن: (پارسیس - parsis) یان پارسی (parsi)، کە بە فارسەوە پەیوەست دەکرێ، کە بەشێکە لە ئێرەن ڤیچی کۆن، ئەو پەیوەست کردنەش بووە هۆی ئەوەی ئاینی زەردەشتی بگۆڕێ بۆ ڕەوتێکی نەتەوایەتی، کە شکۆی کۆنی ئایینی دەخاتە بەرچاو، کە گەورەترین ئیمپراتۆریەتی دروست بکات، کە دنیای کۆن بینیویەتی.

هێشتا مەجوسی ئێران زۆربەی ڕواڵەتە زەردەشتییە گۆڕاوەکان دەست پێوە دەگرن و، بە توندییەکی گیر تەواوی جلەوەکانی ئاینەکە و ئەرکەکانی پەیڕەو لێ دەکەن، وەکو سور بوونی زۆریان لەسەر ڕێساکانی پاکژی کۆن بە هەموو ئەو دژوارییەی لە ناویدایە و، بەستنی پشتێنەی پیرۆز و، ڕەچاو کردنی نەریتی باب و باپیرانیان لە ژن هێناندا و، پیرۆز ڕاگرتنی ئاگر لە پەرستگا و ماڵەکاندا، بەو وەسفەی ڕەمز و هێمای خوای گەورە و بەرزە و ڕوگەی خواپەرستی یە و، دانانی لاشەی مردوەکانیان لە ناو بورج و قەڵاتی خامۆشی (البرج الصمت) بۆ داڵ و پەلەوەرە گۆشت خۆرەکان.

تاکە ڕواڵەت کە لە واتای ئیسلامیەتی ئاینی ئەواندا ماوەتەوە و، خەڵکی پێی خۆشە و بە دڵیانە و، وەکو ئەدگار و سیفەتێکە لە گەڵیاندا و هەر کەس لەگەڵیاندا هەڵسا بێ و دانیشتبێ و ئاگاداریان بووبێ لە نزیکەوە شاهیدی ئەوەی بۆ داون ئەویش ڕەوشت بەرزییانە و، سوربونیانە لەسەر چاکە و، ویستنی ڕاستگۆیی و ڕاستەقینە و، دورکەوتنەوەی سروشتییانە لە هەر کارێکی خراپ و دزێو. ئەو موسڵمانانەی ئێستا کە تێکەڵاوییان دەکەن لە یەزدوکرمان و شەو و ڕۆژ مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن و، بە تەواوی ئامادەن کە داوای کۆمەکییان لێ بکەن بۆ کێڵگە و باخچە و کارەکانی کشتوکاڵی و بازرگانی و تەواوی کارەکان، نەك ئەمەش تەنیا لەبەر شارەزایی و چاك ئیش کردنیان بەڵکو لەبەر ڕاسپاردەیی و ڕاستییان لە هەڵس و کەوت و مامەڵەدا لەگەڵ خەڵکی تردا، با لە سەر ئاینی ئەوانیش نەبن، لێرەدا پەندێك هەیە لە ناو موسڵماندا و دەڵێ: (با هەر یەکێ لە ئێوە لە ماڵی جولەکە نان بخوات خواردنی باش دەخوات، بەڵام با لە ماڵی زەردەشتیدا شەو بمێنێتەوە و، لەوێدا پڕ بە پێڵۆی خۆی دەخەوێ و، بە تەواوی لەوە بێ خەم دەبێ کە خانە خۆی دەست بۆ خۆی و کەل و پەلەکانی درێژ ناکات).

ئەمە هەمووی دەربارەی ئەوانەیە مانەوەیان هەڵبژارد لە ئێراندا دوای ڕزگاری ئیسلامی، بەڵام ئەوانەی ئاینی تازەیان پەسەند نەکرد، وە نە ڕزگار کەرانی تازە

ویستیان لەسەر ئاینی باوك و باپیرانیان بمێننەوە، ئەوەیان هەڵبژارد کە لە نیشتمانمان دور بکەنەوە، بە ژمارەیەکی گەورەوە و، هەتا سەر لە ناوچەی خۆرئاوای هیند بمێننەوە.

بەڵام ئەو ژمارە زۆرەیە هەر لە سەدەی بیستەمەوە، لەهەر دە ساڵێ ٪٧ی لێ کەم بۆوە، بەپێی سەرژمێری ١٩٧١ لە هیند کۆی هەموویان وەك گەورەترین ئۆردویان لە جیهاندا لە دەوروبەری ٢٦٦,٩١ دایە، لە بۆمبایدا بە تەنیا نزیکەی ٦٤,٠٠٠ هەزار کەس هەیە و، لە پاکستاندا ٥٢٠٠کەس هەیە و، ئەوانەی تر لە ویلایەتەکانی هیند و دەوری جیهاندا لە شێوەی کۆمەڵی زۆر بچوکدا بڵاو بونەوە.

لە زەردەشتییەکان لە هیند خۆیان بە پارس ناو دەبەن کە ئاماژەیەکی ڕوونە ئەوانە لە فارسەکانەوە لێژ بوونەوە و، خۆیان بە بێگانە پیشان دەدەن لە هینددا، چونکە لەوە دەترساون لە کۆمەڵگای ئیسلامی نوێدا بتاوێنەوە نیشتمانی ڕەسەنی خۆیان بەجێ هێشتووە و، هێشتاش چینی زانا لەوانە زمانی پالەوی کۆنی خۆی پارستووە، وەك زمانی باپیران و، بەو زمانە ئاڤێستا دەخوێنرێتەوە لە نوێژەکان و پەرستگاکانی ئاگر و، ئاهەنگەکانی ئاینیدا و، ئەوانیش وەکو براکانیان لە ئێراندا دەستیان بە زانیارییە ئاینەکانیانەوە گرتووە و، چونکە - وەکو بڕوایان وایە - باشترین زانیارییە دابەزیوە سەر مرۆڤایەتی و، وە شانازی بەوە دەکەن زیاتر لە شانازی کردنیان بە توخمی ئارییان و نەژادی فارسییەتیان.

کەچی ئەو زانیارییانە - وەکو ڕابردوو باسکرا - لە چاخی ساسانییەوە وەرگیراوە دوای زیندو کردنەوەی ئاینی کە زەردەشتییەتی گۆڕاوو ئاگرپەرستییە. دیارترین ئەو زانیارییانەی مەجوسی هیندی پەیوەستن پێیەوە لەم چاخەدا کە ناوە ناوە دەردەکەون، کە زەردەشت و جێنشینەکانی پەیڕەویان لێ کردووە ئەمانەن کە دێن:

## ١- مەراسیمی چوونە ناو ئاینەكەوە:

كاتێ زەردەشت تەمەنی گەیشتە (١٥) ساڵی - وەكو زانیمان - ملی بۆ نەریتێكی كەچ نەكرد، كە شوێنەواری بت پەرستی پێوە بێ ، بەو پایە چووە ناو ئاینی باب و باپیرانی و[1]، زەردەشتیەكانیش لە چەند قۆناغێكدا، كە لە چاخی پێغەمبەرەكەیان دوور نەبێ شوێن هەمان نەریت كەوتن، دوای داماڵینی دیاردەی بت پەرستی و، چەند هێمایەكی ئاینی خرایە سەر، كە پێویست بێ و هەر زەردەشتییەك تەمەنی گەیشتە تەمەنی ئەرك خستنە سەر (تەكلیف) دەبێ ملیان بۆ كەچ بكات.

بە ئەنجامدانی دانانی منداڵی زەردەشتی، كە لە باوانەوە بێ لە ناو بازنەی ئاینەكەدا بە (naojote) ناوی ناوە و، وشەیەكە لە دوو بڕگە پێك دێ (nao). واتە نوێ و (jote) بە مانای ئەنجامدانی ئەركە خواپەرستییەكانی سەرشانیەتی، یان هەڵسانیەتی بەو ئەركانەی لەسەر شانیەتی.

سەرباری ئەو زێدەكارییە زۆر و قورسەی ئەو واتا بت پەرستییانەی هاتوونە ناو تەقەلاكانی ئەو ئاینەوە، واتای زەردەشتی هەر بە دەركەوتویی ماوەتەوە و، خاڵێكی سەرەكی پێك دێنێ، كە چاو هەڵەی تێدا ناكات، ئەویش ئەوەیە ئەو تەمەنەی خەڵكەكە ئاهەنگی بۆ دەگێڕن كە منداڵی تێدا پێ دەگات، ئەو تەمەنەیە كە شەریعەت ئەركی شەرعی دەخاتە سەر و، كارو كردەوەكانی بەرپرسیارییان تێدا پەیدا دەبێ و، نە لە دنیاو نە لە دوا ڕۆژدا ڕزگار بوونی بۆ نییە بە شوێن كەوتنی ئەو شەریعەتە نەبێ كە خوای گەورە دایناوە و، كەسیش ناتوانێ لە خۆی زیاتر كە خودی ئەو ڕزگار بكات.

---

[1] قورئانی پیرۆز دەفەرمێ: كاتێ ئیبراهیم دەفەرمێ: (وَمِنْ ذُرِّيَّتِي قَالَ لاَ يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ).
واتە: ئەی لە وەچەكانم (دەكەی بە ئیمام) ؟ خوا فەرمووی: (پەیمانی من بە ستەمكاران ناگات). ئایا شیرك ستەمەكی گەورە نییە؟ ! كەواتە چۆن پەیمانی خوا بە زەردەشت دەگات، لە كاتێكدا خۆی لەگەڵ كەمترین شیرك و بت پەرستی تێكەڵ كردبێت؟ ! (وەرگێڕ)

مەجوس لەسەر ئەو مانایە مانەوە کە لە دروشمەکەدا شارا بـووە وەکـو خـۆی، بەڵام لە مەسەلەی تەمەنەکەدا کە ئاهەنگی تێدا دەکرێ لە کـاتی پـێ گەیـشتندا ئاسانکاری زۆریان تێدا کردووە، لای کەمی تەمەن لای مەجوسی هیند بۆ چـوونە ناو ئاین بە ڕەسمی بۆ نێرە و مێیە حەوت سـاڵانەیە و، لای مەجوسـی ئێـران (٩) ساڵییە، جیا لەو هەل و مەرجانەی ناتوانرێ خۆیان لێ دور بگرەرێـت. ئـەو کاتـە دەتوانرێ بۆ پانزە ساڵی دوا بخرێت و نابێ لەو تەمەنە دوا بخرێت هەر چـۆنێ بـێ، چونکە ئاڤێستا دەقی لەسەر داناوە کە ئەو پەڕی سنورە، لەمەڕ ئەمەوە یەکێ لـە شەرع زانەکانی مەجوسی دەڵێ: (پێویستە لەسـەر پیـاو و ئـافرەت کـە تەمـەنی گەیشتە پانزە ساڵ ئەرکەکی پێویستە شوێن ئاینی حەق بکەوێ و، پشتێنەی پیرۆز (زەنارم ببەستێ، چونکە پشتێنەی پیرۆز لە شەریعەتی زەردەشتیدا پەیوەستکردنی خوا پەرستییە بە خوای گەورەوە و، پێویستە لەسەر کەمەرە (کەلەکە) ببەسترێ و، بپارێزرێ و، وەکو هێمایەك بۆ گوێڕایەڵی بۆ خوا بهێڵرێتەوە و چەپاڵە بدرێ).

منداڵ بەر لە ئاپۆرەی چوونە ناو ئاین مل بۆ نەریتی پاکژ کردنـەوەی تایبـەتی کەچ دەکات کە بە نەریتی گەرماوی پیرۆز دادەنرێت، کە پیاوی ئاینی دیاری کـراو هەڵدەستێ بەو گرنگییەوە لەشی کوڕەکەیان کچەکە دەشوات و ناوێ بـەکار دێنـێ کە سیفەتی پیرۆزی لە ناودا بن و، بە دوای ئەوەدا ڕاسـتەوخۆ منداڵەکـە شـەهادە دێنی زەردەشتی و، یان وەکو مەجوسی هیندی دەڵێن بـڕوای خـۆی بـە ڕەوانـی و ڕوونی ئاشکرا دەکات و دەڵێ: (گەورەترین شکۆ و ستایش بۆ ئاینی ڕاست و تەواو ڕاستەڕێ، ئەو ئاینەی خوا لە ڕێگای پێغەمبەرەکەیەوە زەردەشت ڕەوانەی کـردووە و، ئێمـەی تایبـەت کـرد بـە ئـەوەوە، ئـەو ئاینـەی زەردەشـت بـە خـەڵکی ڕاگەیاند).دوای شەهادەی بڕوا منداڵەکە لەسـەر زەوی ڕۆ دەنیـشێ لـە بەرامبـەر کاهیندا و، هەنگاوی یەکەم لە مەڕاسیمی لاسایی کاریـدا کـاهین کراسـی سـەدرە (sudreh) لەبـەردەم منداڵەکـەدا دادەنـێ و، ئـەنجا گەنکەکـە و کاهینەکـە و

ئامادەبوانی دانیشتنەکە نزای تۆبە و پەشیمان بونەوە دەخوێنن و، دوای تەواو کردنی ڕاست هەڵدەستن و هەردوکیان لە بەرامبەر ئاگر دەوەستن و نزای دان هێنان بە خوا وەکو ئیلاهو ڕەب و زەردەشت وەکو پێغەمبەری خوا دەخوێنن و، کاهینەکە بۆ پۆشینی کراسەکە یارمەتی منداڵەکە دەدات.

کراسەکەش مەرجە لۆکەی ڕووت بێ و، سپی و سۆڵ و خاوێن بێت و، دو کلکە و گیرفانەکی بچوکی هەیە[1]. ئەو گیرفانۆکەیە لای ئەوان گیرفانی کردەوە باشەکانە و، دەبێ منداڵەکە هەردەم سەیری بکات و، هەر کاتێ لێی بڕوانێ دەبێ پرسیار لە خۆی بکات ئایا پڕ بووە لە کاری باش یان نە، دروست نییە لە کاتی لاسایی کاری کراسدا هیچ جلەکی تری لە ژێردا بکاتە بەر تا کراسەکە بتوانێ بەر لەشەکەی بکەوێت.

بەڵام لە حاڵەتی لاسایی کاری پشتێنەی پیرۆز (زەنار - kusti) لاوەکە ڕوو لە خۆرهەڵات دەکات لە بەیانیاندا و، لە ئێوارانیدا ڕوو لە خۆرئاوا دەکات و، لە کاتێکدا کاهینەکە بە بەستنی پشتێنەکەی هەڵدەستێ منداڵەکە دوعا دەکات و بە دەنگی بەرز پاڕانەوەی (kusti baastan nivangii) دەخوێنێ وە شکۆدار ڕاگرتن و بێ گەرد ڕاگرتنی خوا و نەفرینی شەیتان و کردەوەکانی تێدایە.

پشتێنەکە وەکو لە دەقی لاساییەکاندایە لە خوری سپی دروست دەکرێ و، وە بە مووی دیاریکراو، بەر لەوەی لە ناوەڕاستی گەنجە بئالێنرێ بە ماوەیەکی ئامادە دەکرێ، ژمارەی سێ ئاڵاندەکان ئاماژەیە بۆ سێ بناغەکانی بڕوا، بیری باش و، قسەی باش و، کاری باش، لە لێهاڵاندنی دووەمدا سێ قولفەی لە پێشەوەدا لێ

---

[1] لە دێریندا باب و باپیرانی کورد ئەم کراسە سپی و کلکدارەیان پۆشیوە و کلکەکانیان لە دەستیان هاڵاندووە و، بەڵام ئێستاکە پیرەکانمان بە دەگمەن ئەم کراسەیە لەبەر دەکەن و، مۆدەکەی نەهاتووە، بەڵام نەك بۆ مەبەستی ئاینی، وەکو کلتورەکی کوردی ڕەسەن پۆشیویانە. داخەم ئیمرۆ میللەتی کورد ڕێزی جل و بەرگی ڕەسەنی خۆی کەم بووە، کە هەم نیشانەی میللەتایەتییە و، هەر بەرگەکی شەرعی و شەرم پۆشە و، پیاوانە و ژنانەیە و، هەم جوانترین شێوازە لە ناو جل و بەرگەکانی جیهاندا، بەڵکو لاسای مودەکانی بیانی دەکەنەوە و، وا دەزانن پێشکەوتن بە گۆڕینی ڕواڵەتە، نەك بە گۆڕینی هزر و ڕۆشنبیری. (وەرگێڕ)

دەدریّ و، لـە لیّ هالاّنـدنی سـێیەمدا دوو قولّفـەی لـە پـشتەوەدا لیّ دەدریّ و، هەریەك گرێیانە ئاماژە بۆ کاریّ لە کارەکان دەکات و، گریّی یەکەم ئاماژەیە بـۆ شەهادە و بۆ بوونی یەك تاقە خوا و، دووەم ئاماژەیە بۆ ئاینی زەردەشت و سـێیەم دان هێنانە بە پەیامی زەردەشت و، چوارەم لەسەر بناغـەکانی بڕوایـە کـە بـڕوا و قسە و کردەوەیە[1].

بە کۆتـایی هـاتنی نەریتەکـە، هـەردوکیان کـاهین و منداڵەکـە ئـەم دەقەیـە دەخوێنن: (ئەی پەروەردگارم پەنا بۆ تۆ دێنم کە دەستی یارمەتی بۆ مـنی زەبـون درێژ بکەیت و، من بەندەی تەقواکار و خاوەن وەرعی تۆم و، من زەردەشتی یـەکم شەو و ڕۆژ بە خواپەرستی لە تۆ نزیك دەبمەوە، مانـدونابم لـە سەرخـستنی دیـنی تۆدا، ئاینی زەردەشتی، ئەو ئاینـەی بـڕوام پێیـەتی، سـوپاس و سـتایش دەکـەم پەروەردگارم کە ئەو بیرە پاك و قسە پاك و کـارە پاکـەت پـێ داوم. پـەروەردگارم سوپاس و ستایش دەکەم لەسەر ئاینت، ئەو ئاینەی کە کێشە و ناوکۆکی خـەڵکی لە زەویدا ڕیشە کێش کرد و، ئەو ئاینەی هاتووە بۆ هانـدانی برایـەتی لـە پێنـاو خـواداو، پەیوەنـدی و سـەردان و خزمایـەتی. بـەردەوام لەسـایەی خـواوە ئـاینی زەردەشتی لە دڵماندا زینـدووە و، هـەر ئەویـشە ئاینـدە زینـدوو دەبێتـەوە و لـە ئایندەدا دەگەشێتەوە و، ئەگەر لەگەڵ ئاینی تردا بەراورد بکریّ گەورەترین ئاین و بەرزترین ئاین و تەواوترین ئـاین و، باشـترین ئاینـە، چـونکە ئـەو ئاینەیـە خـوا دایبەزاندووە بۆ سەر زەردەشت. من سوپاس و ستایش بۆ خوا بڕوایەکم هەیـە کـە

[1] ووشەی (kusti) لە پشتێن نزیکە کە وشەیەکی کوردییە و، کلتورەکی جل و بەرگی باب و باپیرانمانە، هـەتا قولّفەکانیش یان (کەمەر) کە لە ئاڤێستادا بە دەقی (kamara) هاتووە وەکو لە فەرهـەنگی ئیریـەن ڤـەج دا /محمد نەمین هەورامی دا هاتووە ووشەی کوردین. وە لە شیعری شاعیراندا باس لە کەمەر و پشتێن و قەیاسـە کراوە وەکو دیوانی گۆران و، پیرەمێرد و قانیع کە نووسەری کتێبی (ئیریـەن ڤـەج) نموونـەی پـێ هێناونـەوە. کەواتە: (کوشتی - کەمەر) بە مانای پشتێن دێن کە لە ئاڤێستادا هـاتووە و، ئاشکراشـە کەمـەر و پـشتێن تەواوکەری جل و بەرگی کوردین. بەلاّم نەك بۆ سیمای دینی بەڵکو وەکو سیمایەکی نەتەوایەتی. (وەرگێڕ)

بچوکترین گوناهم لەوەدا بۆ پەیدا نابێ کە هەموو شتێ لـە بوونـەوەردا لـە لایـەن خوداوەیە و، وە خودا شکۆی ئاینی بەرز دەکاتەوە و، دەیکات بە لوتکەی هـەموو ئاینەکان، شکۆ و مانەوە بۆ ئاینی خوایە، کە ئاینی زەردەشتە).

## (ئاگر و پەرستگایەکانی)

پەرستگاکانی ئێران و هیندستان سیمایەکی جیا لە خانوبـەرەکانی تریـان نییـە، پەرستگاکان لە ئێراندا ژورەکیان لە ماڵدا بۆ دیاری دەکرێ و، هەندێ جار بینای بـۆ تایبەت دەکرێ کە جیاواز نەبێ لە بیناکانی تر و ئاگری پیرۆزی تێدا دادەنـرێ[1] بـەڵام لە هیند بە زۆری بیناکە بـە تـەواوی بـۆ خواپەرسـتی دەسـت نیـشان دەکـرێ، بـۆ پارستنی ئاگر لە ناویدا لە کوژانـەوە و نوێـژ لـە جەژنـە و ئاهەنگـە ئاینییەکانـدا. پێچەوانەی ئەوەی باوە و بـڵاوە هـەموو ئـاگرێ لای مـەجوس سـیفەتی قەداسـەتی نییەتی نییە و پیرۆز نییە، بەڵکو پێویستە پاکژ و بێ گەرد بکرێ تا دەگاتە ئەوپەڕی ڕوون بوونەوە و سافی و، بۆ ئەو پاکژ کردنەوەیەش نەریت و تەقەلای درێژ و ئاڵۆزیـان هەیە و، لێرەدا ئەوەی گرنگترینە بە سادەیی دەیخەینە ڕوو.

ئەو ئاگرە ناگاتە ئاستی پیرۆزی و جێگای ڕێز و گەورەیی و مـەزنی هـەتا لـە (١٦) ئاگران پوختە نەکرێت بەم شێوەیە:

---

[1] (دبلیو. أی ویگرام) لە کتێبی (مهد البشریە) دا دەڵێ: (ئۆرمییە و دەشتەکەی کەعبەی یـەکێ لـە بەرزترین ئاینە فەلسەفەکانە کە مرۆڤایەتی بۆ خۆی بنیاتی نا. شوێنی لە دایك بـوونی زەردەشـتە، بۆیە چەند سەدەیێ قەلای (مەجوس) و ئاگر پەرستەکان بـوو، قـەڵای ئاینەکـەیان بـوو، پیرۆزتـرین پەیکەریان شاری (سروش) بوو کە ئیمڕۆ تەختی سولەیمانی ناسراوە و کەمێ بـەرەو لای باشـور لـە ئۆرمییە دورە. لەوێدا چەند کەلاوەیێ هەیە کە گەورەترین پەرستگای ئاگر پەرستی بوون و، ئیمـڕۆ ماون. وەکو زانیومانە ئیمڕۆ هیچ زەردەشتییەکی تێدا ناژی، بەڵام کۆمەڵـەکی زۆر کـەم لـە (بـرج الصمت)دا دەژین لە شاری (ڕەشت)دا (ل/١٦٥)). (وەرگێڕ)

ئاگرەکە بە کۆمەڵە دارێکی سەندڵ (الصندل) دەکرێتەوە تا گڕ دەگرێ و بڵێسە دەدات و، دەگاتە پلەیەکی تەواو لە بەرزیدا کە پیاوی ئاینی دەتوانێ بەو بڵێسەیە پارچە تەختەکی تری بچووك بسوتێنێ کە دەیخاتە ناو کەوچکێکەوە چەند کونێکی تێدایە و، لەو کونەوە گڕەکە بۆ تەختە بچووکەکە دەڕواتە ژوورو، تەختەکە گڕ تێ بەر دەدات، کاتێ ئەم تەختە بچووکە گڕ دەگرێ ئاگرێکی تری لێوە دەردەچێ، وە لە هی دووەمیش دوبارە، وە بە ڕێگای زۆر ئالۆزتر لە هی دووەم و بە دوعا و نزای چەند بڕگەیێ لە ئاڤێستا ئەم کردارە ئاوا شانزە جار دوبارە دەکرێتەوە و، لە دوا جاردا دەگاتە ئاستی پاکژی داواکراو، ئەنجا بە چاوی پیرۆزی سەیری دەکرێ و دەکرێ بە هێمایەك بۆ خوای گەورە و، ڕوگەیەك بۆ خواپەرستی.

مومارەسەی پاکژ کردنەوەی ئاگر تەنیا بۆ چینی بەرزی پیاوانی ئاینییە و، بەندەکانی داگیرساندنی و پاکژ کردنی زۆرە و، گرنگترینیان دەمامك کردنە و، نابێ فوی لێ بکرێ و، نابێ هیچ کامێ لەوانە بە هێواشی زۆر نەبێ هەناسە بدات تا بە هەناسەی ئەوان ئاگرەکە پیس نەبێ و، نابێ بڵێسەکە بە پانکە و هیچ شتەکی تر خۆش بکرێ و، وازی لێ دەهێنرێ خۆی ئاگر بگرێت.

دوای ئەوە ئاگرەکە لە ناوەڕاستی ژوورەکی تایبەتدا دادەنرێ لە ناو پەرستگاکەدا و لەناو دەفرێکدا کە بنچینەکەی بەردی چوار گۆشەیە. بەردەوام ڕۆژ بە ڕۆژ بە سەندڵ دادەگیرسێنرێ بە هۆی پیاوانی پەیوەست بەمەوە بە هەمیشەیی، ئەگەر ئاگرەکە کوژایەوە دەبێ بە ئاگری پەرستگایەکی تر هەڵبکرێتەوە نەك بە هۆی ئاگرەکی ئاسایی، پێویستە ئەو پیاوانەی وا بەستەن بەمەوە لە کاتی ئەنجامدانی ئەو ئەرکەیە لە ژوورەکەدا کە دەمامکی خۆیان بکەن بە بەرگێکی سپی تا بوارنەدات هەناسەی ئەوان بە ئاگرەکە بگات، نابێ لە بەرامبەریدا بکۆکن یان بپژمن.

زۆربەی مەجوسەکان مانگانە چوار سەردانی پەرستگای ئاگر دەکەن و، ئاین پەروەرەکان بە ئارەزووی خۆیانە ڕۆژانە هەر کاتێکی بیانەوێ دێنە ناوی و، نوێژەکەش بە زۆری بە تەنیاییە و بەم شێوەیە ئەنجام دەدرێت:

پێویستە نوێژ کەر بەر لە وەستانی لە بەرامبەر ئـاگردا ئەندامـەکانی دەرەوەی بشوات لە لەشیدا وەکـو دەسـت و دەم و چـاو و پایـەکان و، دوای ئـەوە دوعـای کوشـتی (کوسـتی) دەخوێنـێ کـە دەقـی ئاڤێـستای لەسـەرە، پاشـان هـەردوو پێڵاوەکانی دادەنێ و، بەپێی خاوسی بە نـاو هـۆڵی نـاوەوەی پەرسـتگادا گـوزەر دەکات، تا دەگاتە باهوی ناو ژوورەکەی ئاگرەکەوە لەوێ هەرچی پێیەتی لە ماڵ و داری سەندڵ کە دەیەوێ بیبەخشێ دەیدات مجێور و خزمـەتکاری ئاگرەکـە، ئـەنجا دێتە ناو ژوورەکە و لەبەردەم ئاگر دەوەستێ و تێـوەی ڕادەمێنـێ و، نوێـژ و ئـەو پاڕانەوەی مەبەسـتیەتی دەیخوێنێـت، دوای تـەواو کردنـی نوێژەکـە بـە هێواشـی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی پێڵاوەکانی ئەوی لایە و، بڕێکی کەم لە خۆڵە مێـشی ئاگرەکە لە خزمەتکاری ئاگرەکەی پەرسـتگاکە وەردەگـرێ لـە پێڵـوو ناوچـەوانی دەدات و، ئەنجا لە کوێوە هاتووە بۆ ئەوێ دەگەڕێتەوە.

بە پێچەوانەی ئەهلی کیتاب مەجوس ناوی تایبەتی لـە پەرسـتگاکانی خۆیـان نانێن، بەڵکو بە ناوی ئەو ئاگرە ناوی دەبەن کە لە ناویدایـە، بـۆ نموونـە کـۆنترین پەرستگای ئاگر ئەوەیانە ئێستاکە لە بۆمبای هەیە کە بە (ئاتەش بـەهرام atash behram) ناو دەبرێ .

ئەم ئاگرە لە هەموویان پیرۆزترە، چونکە پلەی یەکەمی لە بێ گەردی و پاکیدا و، سەرجەم پەرستگاکان ئاگریان لەو وەردەگرن.

دوای پەرستگای (اتش بەهرام) پەرستگای تر دێ کە لەو پیرۆزیـایی کـەمترە و بە (ئاتەش ئەوران atash adran) نـاو دەبـرێ و لـە چـوار ئـاگر دەرهێنـراوە و، دواترین ئاگر لە پیرۆزیدا (ئاگری دادگا)یە (atash dad guh)، کە مـاڵی ئـاگری ئاساین کە مەجوسی ئاسایی دەتوانێ هـەڵی بکـات و، پێویـستی بـە ڕسمییـەتی ئاڵۆزی خاوێن کردنەوە نییە، بەڵام ئەوانەی تـر، بـە تایبـەتی هـی یەکـەم کـەس دایناگیرسێنێ مەگەر پلەی دەستوری (الموبذ) ی هێناوە.

## (نوێژ)

وەکو باسمان کرد مەجوسەکان پێنج نوێژی فەرزیان هەیە لەسەر هەر کەسێکی پێ گەیشتوو کە پشتێنی پیرۆزی بەستبێت.

بە بەشێ لە خواپەرستییەکان و چەکەکی کاریگەری دەزانن دژ بە شەیتان و دەستە و دائیرەکەی و، پێنج نوێژەکان بەسەر کاتەکانی ڕۆژدا دابەش کراون، نوێژی یەکەم کاتی خۆرهەڵاتنە و، کاتی دووەم ناوەڕاستی ڕۆژە کە نیوەڕۆیە و، کاتی سێیەم بەر لە خۆرئاوا بوونە، پاشان ماوەیەکی کەم دەوەستێ و خۆر خەریکی ئاوابوونە لە سوێدا و چاوەڕێی ئەوەیە نوێژی چوارەمی بکات، بەڵام نوێژی پێنجەم نوێژی بەیانییە.

بابای مەجوسی بەر لە نوێژ کردن دەست و دەم و پەل و چاو و قاچەکانی دەشوات ئینجا پشتێنەی پیرۆزی دەبەستێ (زەنار) لە ناو بەژنی و بە وەستاوی لەبەرامبەر ئاگر دەوەستێ، بە هەموو ملکەچی و ڕێز و دڵنیاییەکەوە و، سەیر کردنەکەی بۆ بڵێسەی ئاگرەکەیە و، ئەنجا بە دەنگەکی نزم نوێژەکەی دەخوێنێ و، کە نوێژی خەریکی لێ بوونەوە بوو پشتێنەی پیرۆزی بۆ ناو قەدەکەی دەگێڕێتەوە و بەمە دوایی بە نوێژی دێت. هەموو جارێك کە نوێژی تێدا دەکات پێویستە لەسەری کردنەوە و بەستنەوەی پشتێنەکە وەکو بەشێ کە لە نوێژ جیانابێتەوە، نوێژ بەمە نەبێ تەواو نابێت، بەڵکو مەجوسی ئێران بە ڕوکنەکی دادەنێن کە نوێژ بەو نەبێ تەواو نابێ، بۆیە بە هەموو نوێژەکە دەڵێن: (نوێکردنەوەی پشتێنەی پیرۆز).

ئەوەی لە نوێژدا دەوترێ چەند پاڕانەوەیەکی پێشینانە لە ئاڤێستا وەرگیراوە کە هەریەکێ لەوانە بەو پاڕانەوانە ڕوو لە خوای گەورە دەکات کە ئەنجام دەری پێویستییەکانە و، وەڵامدەرەوەی پاڕانەوەکانە و، هەندێ جار لە نەفرەت کردن لە شەیتان و دارو دەستەکەی پێك دێ و، ڕێگا بە هیچ کاسێك لەوانە نادرێ مەسەلەکە بە هەند وەرنەگرێ یان گوێی پێ نەدات، ئەگەر نا بە بکەری گوناهو تاوانەکی گەورە دادەنرێت.

نوێژ لای ئەوان بە زۆری تاك کەسییە، بەڵام لە هەندێ ماوەی دور لە یەکتریدا یان لە بۆنە و جەژندا بە کۆمەڵ نوێژەکە دەکەن و، بەرگی سپی پاکژ دەکەنە بەر و پشتێنەی پیرۆز دەبەستن، پاشان بە کۆمەڵ یان ڕوودەکەنە ئاگر پەرستگای ئاگریان خۆری ئاوا بوو.

جار بەجار شەقامەکانی بۆمبای کۆمەڵێ لە پارسەکان بە جل و بەرگی سپی جیایان دەبینرێن و، پشتێنیان لە بەژن بەستووە و، بەرەو کەناری (المطل) دەڕۆن لەسەر دەریای عەرەب و، لەسەر لێواری ئاوەکە ئەو پیاوانە بەرامبەر خۆر دەوەستن کە خەریکی ئاوا بوونە و، دەستیان دەخەنە ئاوو ئەنجا بەرەو ناوچەوانیان بەرزیان دەکەنەوە و، پاشان دەستیان بۆ پشتێنیان دەبەن و دەیکەنەوە و، ئەنجا دەستیان بۆ ناوچەوانیان بەرز دەکەنەوە:

دوای ئەوەی جارێکی تر پشتێن دەبەستنەوە دەستیان بۆ خۆری ئاوا بوو بەرز دەکەنەوە و، دوعایەکی سوك دەخوێنن و دەڵێن:

(بە ئاشکرایی ستایشی بیرێك دەکەم کە باشترین بیر کرنەوە لەودایە، وە قسەیەك کە باشترین قسەیەتی، وە کردەوەیێ کە باشترین کردەوەیەتی).

## کەلوێ خامۆشی(برج الصمت):

مەجوسی ئێران و هیند لە کاتی مردندا هەمان نەریتی باب و باپیرانیان دوبارە دەکەنەوە و، لاشەی مردوان ناسوتێنن و، نایانخەنە ژێر خاکەوە و، نایانخەنە ناو ئاوەوە، بەڵکو دەیانخەنە بەر خۆر بۆ باڵندە گۆشت خۆرەکان لە ناو بورجی خامۆشی (برج الصمت tower of silence).

وە (الدخمە) وەکو باسکرا قەڵاتی بەرز و شێوە بازنەیە کە سەقف و بانی نەبێ و، زەوییەکەی بەرد ڕێژەیان کاشی کراوە، زەوییەکە سێ چین بەردە، چینی هەر بەر زەوی و شوێن پێکەی بۆ مردوی پیاوە و، هی ناوەند بۆ ئافرەتانە و، هی خوارەوە

بۆ منداڵانە.لە نێوانیاندا ڕێڕەو و گوزەر هەیە بۆ هەڵگرانی جەنازە تایبەتکراوە و، لە ناوەڕاستی بورجەکەدا بیرەکی وشك هەیە.

لە کاتی مردندا مردوەکە بە ئاوەکی پاك دەشۆردرێ کە جگە لە مەجوسی کەس تخونی ناکەوێ و، پاشان بە بەرگی خاوێن کفن دەکرێ و، پشتێنەی پیرۆزی تایبەتی لە ناو قەدا دەهاڵێنرێ و، پاشان کۆمەڵەکی دیاریکراوی ئەو کارە دێن تا بۆ ئارامگای کۆتایی هەڵی بگرن و، خزم و کەسی مردوو یەکەم جار بۆ پەرستگای دەبەن و، لە نزیك ئاگری دادەنێن تا نوێژی لەسەر بکەن، پاشان ڕاستەوخۆ بۆ بورجەکەی دەبەن و، لە دەرەوەی بورجەکەدا هەموویان بۆ دواجار بە چاوی ماڵ ئاوایی سەیری دەکەن.

دەبێ تەنیا خزمە هەرە نزیکەکانی مردو تەرمی مردووەکە هەڵبگرن و، لە شوێنەکی دا دادەنێن کە تایبەتکراوە بە ئەوە، ئەنجا هەڵگرانی تەرمەکە کفنە بە مەقەست یان بە دەست ئەیدڕن، تا بە تەواوی لاشەی دەردەکەوێ و، بەو حاڵە بەجێی دێڵن و، شوێنەکە چۆڵ دەکەن. هەر کە لاشەیان بەجێ هێشت داڵەکان لەو شوێنەوە کە هەمیشە لەسەری هەڵدەنیشن لەسەر شورەکەوە دەگەنە سەری و لاشەکە هەڵدەدڕن و پارچەی دەکەن و، نیو کات ژمێر پێ ناچێ کە تەنیا ئێسقە ڕووتەکانی لەبەر ڕووی گەرمایی خۆر دەمێنێتەوە. دوای چەند ڕۆژی ئێسقەکان ووشك دەبنەوە، ئەنجا هەمان ئەو پیاوانە دێن ئێسقانەکان دەخەنە چاڵ و بیرە وشکەکەوە، چونکە بڕوایان وایە کە لاشەی گۆشتی لێ داماڵرا توانای پیس بوونی نامێنێ.

کێشەیەکی تر کە بەرەو ڕووی مەجووسەکان دەبێتەوە لەمەڕ مردوەکانیەو بە تایبەتی کە لە کۆمەڵگایەکی بچوکدا بژین نەبوونی باڵندەیەکی گۆش خۆری زۆرە لەبەر کەمی لاشەی مردووەکانیان، هەندێ لە زۆرینەی ئەو کەسانەی لەگەڵیاندا دەژین بەرەو ڕووی نارەزایی توند بوونەوە، بۆیە شەرع دانەر کێشەکەی بەو ڕەنگە چارەسەر کرد کە دروستە لاشەی مردوەکە لە ناو تابوتەکی بەردینی ناوپۆش کراو

بە خۆڵەمێش دابنرێ، هەتا پاشماوەی لاشەکە لە دزە کردن قەدەغە بکات و بوار نەدات تێکەڵ بە گڵ ببێ و پیسی بکات.

بەڵام ئەو تاکانەی کەمن و لە شارەکانی خۆرئاوای ئەورووپی دا دەژین بەو بیرە گەیشتن کە لاشەکە لە ڕێگای فرنی کارەباییەوە بسوتێنن کە بتوانێ لاشە لە پلەیەکی گەرمی بەرزدا بسوتێنێ بێ ئەوەی بەر بڵێسە بکەوێ و ئاگرەکە پیس بکات.

## (تێڕوانینێکی گشتی بۆ مەجوسی هیند):

پارسیەکانی هیند تا ڕاددەیەکی زۆر دەستیان بەو زەردەشتییەتە گۆڕاوە گرت کە لە باب و باپیرانیان وەریان گرتووە، دیسان دەستیان بە زۆربەی دیاردەکانی ئاینەکەوە گرت، دیارترینیان خوێندن و توێژینەوەی ئاڤێستاوە پاکژ ڕاگرتنی خاك و، دانانی کار بە باشترین شت بۆ نزیك بونەوەی بڕوادار لە خوای گەورەیە. وە شتی تریش کە ئیمڕۆ لە ناویاندا بەناو بانگە.

بەڵام لە ڕووی ڕواڵەتی دەرەکییەوە ناویان بە پاکژی و پۆشینی بەرگی سپی بۆن خۆشکراو و، لەشی جوان دەرکردووە، هەروەها بە داپۆشینی سەر لە دەرەوەی ماڵ و ناوەوەیدا، هەتا ئەو کەسەی یەکەمجار بەرچاوی بکەون وا دەزانێ موسڵمانن، چونکە موسڵمانیش بەوە لە خەڵکی تر جیا دەکرێنەوە.

دووەم: ژمارەیان دەستی بە کەمییەکی بەردەوام کردووە و، مەجوسی ئێرانیش بە هەمان شێوە لە کەم بوونەوەدان، ئەمەش بە هۆی ژن و ژن خوازی ئەوان لەگەڵ هۆزە هیندییەکاندا و تێکەڵ بونیان لەگەڵ ئەواندا بە شێوەیەکی مەترسیدار، ژن هێنانی بابای پارسی لە غەیری خۆیان کەم دانی پێ دادەنرێ، منداڵەکانی لە ئاین و کۆمەڵگادا بە مەرج پەسەند دەکرێ و، ژنەکەش لە هەموو بارێکدا وەکو نامۆو بێگانە سەیری دەکرێ و، کەمترین ئاستی پەسەند کردنی پێ نادرێ، بەڵام ئەگەر ژنە پارسییەك مێرد بە غەیری خۆیان بکات خۆی و منداڵەکانی بێ بەزەییانە دەردەکرێن حوکمی وون بونیان بۆ دەدرێت.

هەرچۆنەك بێ مەجوسی لە هیندستاندا ئەدگار و ڕەوشتی تایبەتیان هەیە پلەیەکی بەرزیان لە ناو هیندەکانا پێ ببەخشێت، بۆ نموونە ئەوانە زۆر گوێ بەزوهد و دنیا نەویستی و لێ بران بۆ خواپەرسیت نادەن، یان گۆشە گیری وتەریکی لە ژیانی گشتی،بەڵکو هەر لەو کاتەوە لە فارستان ڕۆیشتن بەوە ناسران کە ئیش و کاریان ئامانجە و هەڵوێستی ئیجابی و باشی کارلێکردویان هەیە لەگەڵ جموجۆڵی ژیاندا، بە شێوەیەکی زیندەگی و چالاکی و گیانی چوونە پێشیان تێدایە.

ئەوان بە گەواهی کۆمەڵگای هیندی لە هەموو کەس پتر بەشداری دەکەن لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، سیاسی و ئابوری و کۆمەلایەتی.

بۆ بەڵگە هێنانەوە لەسەر کارلێکردنی ئەوان لەگەڵ چەندان لایەنی جیاوازی ژیاندا و، کار لێ کرانیان و کارتێکردنی ئەوان تێیدا تەنیا دوو نموونە وەردەگرین لە بەشداری چالاکیاندا لە دوو بواردا کە لە هەموو بوارەکان گرنگترن، ئەویش بواری رامیاری و ئابوریە:

لە بواری ڕامیاریدا ئەوەی لەناو ئەواندا ناوبانگی دەرکرد (داوا هارناوروجی) (dauaharnaorogii)یە کە (جەواهیر لال نەهرو) لە یەکەم کۆبوونەوەی دەستەی یاسادانانی بالآی ١٨٨٥دا گەواهی بۆ دا کە ئەو یەکەم کەسە ووشەی خودموختاری (swaraj - الحكم الذاتي) بەکار هێناوە لە هیندستاندا و، (داوا هار) لە سێ خولدا سەرکردایەتی دەستەی یاسادانانی بالآی کردووە، لە سالی (١٨٨٦و١٨٩٣و١٩٠٦).

(داوا هار) لە پێناوی سەربەخۆیی هینددا تێکۆشا و خەباتەکی بەردەوامی بۆ پێناوی ئەوە کرد، چووە مەیدانەکانی سیاسی بە بێ دو دڵیەوە بۆ هێنانە دی ئامانجە بەرزەکانی وڵاتی بڕیاری دا بڕواتە ناو کۆنگرەی گشتی بەریتانی و، لە هەڵبژاردنی گشتیدا لە پارتی (الاحرار)دا واتە ئازادەکان چووە پێش و، بێگومان وەکو یەکەم کەسی هیندی کە لە پەرلەمانی بەریتانی (١٨٩٢- ١٨٩٥)دا

هەڵبژێردرێ سەرکەوتنی بە دەست هێنا و، لە ناو پەرلەمانی ئینگلیزیدا داوای خودموختاری و سەربەخۆیی کرد.

پەرلەمانی ئینگلیزی سێ هەڵبژێراوی هیندی تێدا بوو کە ڕاستەوخۆ لە لایەن هەڵبژاردەی بەریتانییەوە هەڵبژێران و کاندیدا کران و، هەر سێ لە پارسەکان بوون و، قەت شتی ئاواش ڕابردوو لە مێژووی پەرلەمانی ئینگلیزیدا و نە لە مێژوی سیاسی هینددا ڕووی نەداوە.

بەڵام لە بواری ئابوریدا ئەوان یەکەم کەس بوون پیشەسازییان پێش خست لەسەر شێوازی خۆرئاوایی نوێدا، یەکێك لەوانەش کە ئەو ڕێزەی بۆ دادەنرێ (دینشاو پتیت dinshaw petit) بوو کە بە دەرکەوتوترین کەسایەتی دادەنرێ لە بواری پیشەسازی و بازرگانی و کاری چاکەدا، ئەو چاکەیە بۆ ئەو دەگەڕێتەوە کە شاری بومبای بۆ (مانشێستەری خۆرهەڵات) گۆڕی لە پیشەسازی ڕستن و چنیندا.

مەجوس بە گشتی لەگەڵ ژمارەی کەمینەیاندا سەرمایەدار و فرە دەوڵەمەندن و، زۆربەی کارە بازرگانیەکان بە دەست ئەوانەوەیە و، گەورەترین ئوتێل و کۆگا و پیشەسازییان هەیە، خەریکە سەرجەم کاروبارەکانی دارایی بۆ خۆیان دابین بکەن لە هەر جێگایەك بێ، ناودارترین دەوڵەمەندیان لە هیندا (تاتا) و خێزانەکەیەتی و، خاوەنی زنجیرە کارگەیەکن کە بە فرۆکە دەست پێ دەکات و بە سابون و شیرنەمەنی کۆتایی دێت.

ئەوان سەرباری ئەوەش لە هەموو خەڵکی هیندستان زانا و ڕۆشنبیرترن وە کەس ناتوانێ شانیان لە شان بدات لە سود وەرگرتن لە ڕۆشنبیری خۆرئاوا و شارستانی خۆرئاواییدا و، بەوە گەیشتنە ئاستێك لە هەڵچوونی هزری و پێش کەوتن و گەشە کردنی بیری دا کە وای لێ کردن پێشڕەوی ڕابردو بن لە پێك هێنانی هیندی تازەدا.

لەوەش گرنگتر ناویان بە ڕەوشتی بەرز و ڕەفتاری شکۆدار دەرکردووە، هەم بە خوی بەرز و، ڕێکخستنی جوڵەی ورد لە ژیاندا کەوای لێ کردون لە هەموو کەس

پتر ڕوو لە خێر و چاکە بن و، دور لـە خراپـە بـن، ئەوەشـە ئیمـڕۆ وەك شـاهید و بەڵگە دەمێنێتەوە[1]. لەمانای یەکتاپەرستی لە ئاینی زەردەشـتیدا، هـەروەها وەك گێڕانی ڕۆڵێکی نمونـەیی لـە داڕشـتنەوەی تـاك بـە داڕشـتنەوەیەکی خـوایی کـە بەهۆیەوە بەرزترین پلەی مرۆیی بەدەست دێنێ.

## پەراوێزەکان

١- ئەو سەرچاوانەی مێژووی زەردەشتی یان نووسیوە لەسەر ئەوە کۆ بوونەوە کـە باوکی زەردەشت پوراشسپە بووە و، دایکی دغدو (dughdo - poursushasp) و، لە

[1] بێگومان ئەم ئاینەی زەردەشت هێنای (بیری بـاش - وتـەی بـاش - کـاری بـاش) کاریگەرییـەکی گەورەی کردە سەر گەلی کورد و، تا ئیمڕۆ کورد خاوەنی سیفەتی جوانە کـە لـە نـاو گـەلانی تـری دنیادا دەگمەنە، وەکو دڵسافی و، ڕێزی میوان و، پەیوەنـدی بـەهێزی کۆمەڵایـەتی و، ئازایـەتی و، پیاوەتی و وەفاداری و، گیانبەخشی و پاکژی و، قەناعەت و سەربڵندی و، سەخاوەتی.

(گرام) دەڵێ: (نزیکەی ١٠٠٠ ساڵە سروشتی کورد نەگۆڕاوە، ئەوان گـەلێکی بـەهێزن و زیـرەکن و مامەڵەیان خۆشە). (الأسس النفسية والاجتماعية للقبائل الكردية/هاشم العقراوي). وە لە کاتێکی دا کە ئیسلام هات وەکو محمد مەردۆخی دەڵێ: (کوردەکان بینیان و تێفکرین کە ئـەم ئاینـە تازەیـە بـە تەواوی موافقی تەبع و ویژدانیانە لەبەرئەوەی بە ئاسانی بەرە بەرە قبوڵیان کرد).

گەشتیاری ئینگلیزی (ڕیچ) لە کتێبی (رحلە الی العراق عام ١٨٢٠-ل: ٤٨/ت: بهاءالـدين نـوري) دەڵێ: (ئێستا دوای ئەوەی دیمانەم کردووە لە گەڵ گەورە پیاوانی کورد چ لە بەغداد، یان دوای ئـەوەی چوینە ناو خاکیانەوە دەبینی لایەنگری ئەوانم، چونکە گومانی باش بە ڕەفتار و ڕەوشت و بەخشندەیی و میوانداری یان دەبەم بۆ ڕادەیەکی زۆر). ئەم نمونە بەهادارانە زۆرن لەمەڕ مـەدحی ڕەوشـتی گـەلی کورد لە لایەن دۆست و دوژمنانی کورد کە لە ناو کتێب و سەرچاوەی خۆیاندا نوسیویانەوە و، دانیـان پێدا هێناوە. وەکو (محمد ئەمین زەکی بەگ) لە مێژووی کورد و کوردستاندا باسی کردووە کاردۆخی بە درێژایی مێژوو دەستیان بە ڕەوشتی خۆیانەوە گرتووە، (ڕەشید چاوشلی) دەڵێ: (هەرچەندە کوردسـتان تووشی داگیرکردنی کاتی هاتووە بەڵام نەریتی بێگانە نەیگۆڕیوە).

(الأسس النفسية والاجتماعية للقبائل الكردية / هاشم طه عقراوي). (وەرگێڕ)

فارسی نوێدا دغدەوییەیە، بەڵام نازناوی خێزان ئیپیتیما spitema. لە سەرچاوەی ئیسلامیدا بە ئەسقیمان هاتووە واتە سپی، کە ووشەیەکی فارسی کۆنە و ئێستا کە (شپیز)ە و، تا ئێستا ناوەکە لە فارسی نوێدا بە هەمان واتای کۆن بەکاردێت[1].

لەو بارەوە بڕوانە: jacksonp.١٦ soroster- والملل والنحل ج/١/الشهرستاني/ص٢٣٦/وتجديد التأريخ، عمر فروخ/ص٤٨.

٢- يسألونك عن ذي القرنين/ابو الكلام آزاد/ص١٤٤.

٣- بۆ نموونەی ئەوە سەیری (مروج الذهب/ج٢/المسعودي/ص١٢٧والملل والنحل/ج١/الشهرستاني/٢٣٦ بکە.

٤- مقدمة الفنديداد. د:زداؤد الجليي/ص١٣.

٥- ashistory eo persia boi syes p.١٠٤

دووبارە: zoroaster - jackson p.١٤

٦- aoroaster- jackson p.١٤

٧- the heritage persia - richard p.١٠٤

٨- تجديد التأريخ، عمر فروخ/ص٤٩/والعالم بين يديك/جوزيف رعد/ص٧٢٩/

٩- avesta vendid voi p.٣

١٠- اثار البلاد واجنار العباد/القزويني/ص٢٣٣.

١١- التنبيه والاشراف /المسعودي /ص١٣٤.

---

[1] ووشەی سپیتیما لە کوردیدا (سپ)یە و، لە فارسیدا (سپیدە). لە کتێبی (زەردەشت/محمد گۆمەیی)دا دەغدوڤا کچی حەزرەتی ئیبراهیم خەلیلە، کە مێردی بە کوڕە هۆزەکی کورد کردووە بە ناوی پوراشسەسپە زەردەشت لەو پەیدا بووە.

(محمد ئەمین هەورامی) لەسەر ووشەی spaita) دەڵێ: ئەو ووشەیە بە ڕواڵەتی تریش بەرچاوە کەوتووە کە (spaeta)یە. ئەو ووشەیە بە واتای سپی هاتووە، لە پاڵەویدا بووە بە (سپێت = spet) و بە ئەرمەنی بووە بە سپیتەك spitak و بە ئەفغانی (سپین = spin) یان (ئیسپیت = ispit) ەو، بە هیندی کۆنیش (چڤێت cvet)ە»

١٢- كتاب التنسر/ ص٥٣.

history of zoroastrianism - dhalla,p.٣١١ -١٣

١٤- تجديد التأريخ / عمر فروخ/ ص٥٠.

a history of persiavol sykes p.١٠٤ -١٥

١٦- ڕووباری ئاراس یان ڕەس وەكو قەزوینی دەڵێ یەكێكە لە ڕوبارەكانی ئازەربیجان، كە دەریایەكی گەورە و تیژڕەوە و، بەرد و تاوێڕی تێدایە كەشتی ناتوانێ بە ناویدا بڕوات و، زۆر كەندڕو تاوێڕی تێدایە. لەو بارەوە بڕوانە/آثار البلاد و اجنار العباد/عبدالعزيز الثعاليي.

١٧- زەردەشت لە ژیانیدا سێ ژنی هێناوە و، لە هی یەكەم كە (هانوییە) بووە منداڵی پەیدا بووەو، هەروەها لە هی دووەمیش، بەڵام سێیەم منداڵی پەیدا نەبووە.

١٨- قەزوینی لەمەڕ چیای سابلان دەڵێ: بەرزترین چیای جیهانە و، دەكەوێتە ئازەربیجان و، زەردەشت لەوێ خەڵوە و گۆشە گیری كردووە و، لەوێ كتێبی (باستا) بۆ ئەوان دەبات، پاشان لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە: (من قرأ سبحان الله حين تصبحون الى قوله تخرجون: كتب الله له من الحسنات من الحسنات بعدد كل ورقة ثلج تسقط على جبل سابلان، قيل وما جبل سابلان يا رسول الله؟ قال: جبل بين ارمينيا واذربيجان، عليه عين من عيون الجنة، وفيه قبر من قبور الانبياء) آثار البلاد واجنار العباد/القزويني / ص٢٨٤- ٣٩٩ واتە: (كێ سبحان الله بخوێنێ كاتێ بەیانی دەكەنەوە، تا دەگاتە (تصبحون) خوای گەورە بە قەد هەموو كلۆە بەفرەكی كە لە چیای سابلان دەبارێ چاكەی بۆ دەنوسرێ، یەكێ ووتی سابلان چییە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی:

چیایەکە لە نێوان ئەرمینیا و ئازەربیجان، کە سەرچاوەیەکی بەهەشتی لێیە و، گۆڕێ یەکێ لە پێغەمبەرانیشی لێیە)[1].

١٩- (الابتساق) ناوی عەرەبی ئاڤێستایە avesta و ووشەکەش وەك دیارە بنەماکەی نادیارە و، هیچ ڕاستییەك لەو بارەوە نەزانراوە و، هیچ ووشەیەکیش نەزانراوە کە لێی وەرگیرا بێ و، زۆربەی گومان ئەوەیە کە ووشەیەکی ئارییە کە (ڤیر) یان (بیذ)ە واتە: زانین یان زانیاری کە ئەمەش دیار نییە، ئەوەی پشتگیری لەمە دەکات زانیاری و هەواڵەکانی ڕابردوو ڕوودا وە دانە هاتووەکانە، کە خەڵکی هیچ ئاشنایەتییان لەگەڵدا نەبوو، بە هاتنی زەردەشت نەبێ ئەمەیان بۆ دەرنەکەوتبوو.

[1] (ج. ار. درایڤەر) لە کتێبی (الکرد فی المصادر القدیە) / ترجمە: فـواد حمـە خورشـیدی/ل: ٣١)دا دەڵـێ: (کوردستان لە چاخی کۆندا بەناوی یۆنانییەوە کاردۆچیا (dardochia) ناسراوە و، دیسان بە ناوی یۆنانی و ڕومانی بە کوردوئین یان کوریایا ناسراوە و، سریانیەکان بە کاردۆ یان قاردو (ardu)ناویان داوە، کـە سەرچاوە عەرەبیەکان لە کۆندا ناوی (قارد) ایان لەو وەرگرتووە، کە بەو نیشتمانە گوتراوە کە ئەرمینیا لە باکوردا سنوری بووە و، ڕووباری فوڕات لە خۆرئاوا داو، دەشتایی عەرەبی لە باشوردا و، میرنشینی میدیای کۆن لە خۆرهەڵاتدا.

زانای جوگرافی یۆنانی سترا بۆ ئاماژەی کردووە کە ئەرمینیا و ئەتروپاتین دوو ناوچەی دەوڵەمەند بوون، بەڵام بەشی باکوری ناوچەکی چیایی بووە هۆزی دڕی لێ بووە وەکو کیرتی kyrtii کە بە ڕەوەنـد و کۆچـەری ژیـاون و لەسـەر بەشەکانی ئەرمینیا و هەتا خۆرهەڵات بڵاو بوونەوە بە درێژایی چیای زاگرۆس).

سەبارەت بە ڕووباری (ئاراس) لە کتێبی (الکرد في دائرة المعارف الاسـلامیة/ترجـمة حمیـد ریبـوار/تـألیف مجموعة من المستشرقین المعـروفین/ل١٤)دا هـاتووە: (بـا لـە ئـەرام دەسـت پـێ بکـەین سەرچـاوەکەی لـە کوردستانەوەیە، لە (ئەلف بەحیرە) هەڵدەقوڵێ لە دەشتی (بن کول) کە دەکەوێتە نێوان دیجلە و فوڕات، بە پێچەوانەی دیجلە و فورات کە لە درێژ بوونەوەیاندا ڕووە و باشوری خۆرئاوا دەڕۆن. بەڵام ڕووباری ئاراس لە درێژ بوونەوەی دا سەرەتا بەرەو باکور دەڕوات ئەنجا بەرەو خۆرهەڵات و بە ئەرمینیای ڕوسی دا گوزەر دەکات، هەردوو ڕووبار دیجلە و فوڕات بە تەواوی بە کوردستاندا تێ دەپەڕن. (وەرگێڕ)

لەم ئاڤێستایە وەحی کراوەی زەردەشت تـەنیا (گاتـا gatha)[1] کـە ئیمـڕۆ بـە کۆنترین و پیرۆزترین سـفرەکان دادەنـرێ و، جگـە لەمـە شـوێنەکی تایبـەتی لای مـەجوس هەیە لە بە زمـانی زەردەشـت و زمـانی بنـەڕەتی ئـەو دادەنـرێ: بـەڵام توێژینەوە نوێکان سەلماندویانە کە بونی پەیوەندی ئەمـە بـە زەردەشـتەوە ئەگـەر نییـە، ئـەویش وەکـو سـفرەکانی تـری ئاڤێـستایە و، جیاوازییەکـەی تـەنیا کۆیلەکەیەتی، بەڵکو کۆنترین دەقـی زەردەشـتییە، بۆیـە مـەجوس لـە ئاهـەنگی خۆیان بەپێی نەریتی تایبەتی خۆیان دەیخوێنن.

بەڵام سفرەکانی تر لە ناو چوون و هیچیان لێ نەماوەتەوە و، ئاڤێستای ئێمـڕۆ کە هەیە تەنیا یەك سفری ماوەتـەوە کـە تـەواوە و لـە سـەردەمی ساسـانیەکاندا کۆکراوەتـەوە و نوسـراوەتەوە و وەرگـەڕاوە کـە (ڤندیـداد) ە، هـەر لـەو کاتـەوە نوسراوەتەوە بۆ سنورەکی دور وەك خۆی ماوەتەوە.

دێت.ئەو ئاڤێستایەی ئیمڕۆ بەکاردەهێنرێ لـە لایـەن مـەجوس و هیندەکانـدا بەشێکی ناتەواوی ئەو نوسخەیەی لەسەردەمی ساسانیەکاندا نوسراوەتەوە وە تاکە بەشێکە زەردەشتیەکان لـە کۆچـڕەوی یەکەمـدا دوای ڕزگـاری ئیـسلامی لەگـەڵ خۆیاندا بۆ هیندیان گواستەوە.

## کتێبەکە لە ڕوانگەی بابەتییەوە دەبێ بە پێنج بەشەوە:

١- ڤندیداد (vendidad): واتە: شەریعەتی دژ بە شەیتانەکان، تاکە سـفرێکە بە تـەواوی پێمـان گەیـشتووە لـە نـاو (٢١) نوسـوکدا بـە نووسـراوی . بـەیانی شەریعەتەکانی تایبەت بە ژن هێنان و شو کردن و یاسای خێزان و ژیان و مردن و، کێـشەی کۆمەلایـەتی و، پیـسی و، ڕێـساکانی پاکـژ و، شوشـتنی مـردو، پاکـژ

---

[1] بۆ ووشەی ئاڤێستا و گاتا، ووشەی گاتا واتە سرودەکان و، ئاڤێستا لای (محمد ئەمین هەورامی) لـە فەرهەنگی نیریەن ڤەچدا" بە واتای زانین یان بە بنچینە

کردنەوەی بەرگ و، دروستی و نەخۆشی و سوێند و پاراستنی پەیمانەکان و شتی تر تێدایە. لە دەقەکانی ڤندیداد شەریعەت و یاساکانی ڕەوشتی و ڕژێمی ژیانی کۆمەلایەتی و ئابوری پێك دێ بۆ مەجوسی هیند و ئێران.

٢- (ڤیسپێرد vispered): دوعا و ویردی بۆکانی جۆراو جۆری ژیانە لە جەژنەکاندا و، بۆ وەرزەکانی ساڵدا و، ڤیسپێرد سەربەخۆ نییە، بەڵکو تەواوی (یەسنا yasna)نایە.

یەسنا واتە خوا پەرستی و تەسبیحات، یان خواپەرستی و سوپاس و ستایش و نوێژ و، بریتییە لە کۆمەڵە دوعا و نوێژەك لە سەر شێوەی چەند بڕگەیەکی بە وەزن و کێش کە زەردەشتییەکان ڕووی پێ لە خوا و فریشتەکان دەکەن. یەکێ لە بەشەکانی یەسنا کە چەند بڕگەیەکی بە وەزن و کێشن بە گاتا gatha ناسراوە کە کۆنترین بەشی ئاڤێستا و پیرۆز ترین بەشە لای مەجوس.

٣- یەشتا yasht یان یەشتات، ووشەی یەشتا لای ئیسلامیە کۆنەکان خودا پەرستی و ورتە ورتە (زمزمە) لە سەر خواردن و تەسبیحاتە، بەڵام ئیمڕۆ بریتییە لە چەند خوێندنەوەیەکی هەڵبەستراو کە بۆ چەند هەڵبەستێ دابەش دەبێ و لە شێوەی سکاڵا و پاڕانەوە لەو فریشتانەی دەسەڵات بەسەر هەموو دیاردە گەردونی و هێزی مرۆڤایەتی دا دەگرن. حەمد و سەنای تێدایە کە ئاراستەی هەریەك لە فریشتەکانی خوای دەکرێ وەکو یەك.

٥- خوردە ئاڤێستا (khorda avesta) واتە: وردە ئاڤێستا کە لە سەردەمی شاپوری یەکەمدا (٣١٠- ٣٧٩ز)دا نوسراوەتەوە و، هەموو شەریعەتی زەردەشتی تێدایە و، پاڕانەوە و نوێژی ڕۆژانەی تێدایە، یان ڕۆژە پیرۆزەکانی مانگ و، جەژنە ئاینیەکان لە ساڵدا و، کاتەکانی تەندروستی و نەخۆشی و، دیسان، یاساکانی عیبادەت و ژن هێنان و تەلاقی تێدایە.

٢٥٩- ئەو پادشایەی عەلی کوڕی ابو تالـب (ﷺ) مەبەسـتییەتی قـەمبیزە، هیرودوتس بەسەرهاتەکی گێڕاوەتەوە لەگەڵ بەسەرهاتی عەلی کوڕی ئەبو تاڵـب دا (ﷺ) وەکو یەکە کە هێنانی خوشکی فەرز کردوە و فارسەکان بەر لەوە خوشکیان مارە نەکردووە، بەڵام لە چۆنیەتی دانانی ئەم دەستورەدا لەم بەسەرهاتە جیایە. لە مێژوەکەیدا (٢٢٠٧و٢٠٨)دا دەڵێ:

قەمبیز خۆشەویـستی خوشـکێکی چـووە دڵـەوە و، ویـستی کـە بیخوازێـت، کەسیش بەر لەو شتی وای لێ ڕوونەدابوو، بانگی قازییـەکانی کـرد پرسیاری لێ کردن ئایا هیچ شەریعەتێ هەیە ڕێگا بە برا بدات خوشکی خۆی مارە ببڕێ ئەگـەر حەز بەمە بکـات؟ ئـەو قازیانـە لای گـشت فارسـەکان هەڵبـژێرابوون و، تـا دوا تەمەنیان لەسەر ئیش و کـاری خۆیـان دەمانـەوە، مـادام هـیچ سـتەمیەکیان لێ نەبینرێت، ئەوان لێکدەرەوەی ڕاڤەکانن و، قازی و دادوەری سکالاکانن و، هـەموو بەرژەوەندییەکان بۆ کۆڕی ئەوان دەڕوات، کاتێ قەمبیز پرسیاری کرد، وەڵامی بێ مەترسییان دایەوە، کە زیان بە لە لایەنی دادگـەری بـدات. ئـەوان ووتیـان: هـیچ شەریعەتێ نییە بوار بە مارە کردنی خوشك بـدات، بـەڵام شـەریعەتێ هەیـە کـە پادشای فارس ڕێگای پێ دراوە هەرچی بیـەوێ بیکـات. وەڵامیـان لەمـەدا هـیچ حوکمەکی شەرعی نەشکاند، هەرچەند ئەوان لە قەمبیز دەترسان، بەڵام بۆ ئـەوەی پادشا نەیانکوژێ بەو مەنع کردنە یاسایەکی تریان دۆزییەوە کـە ڕێگـا بـە پاشـا بدات خوشکی مارە بکات ئەگەر دڵی لێی بێت. لەسەر ئەم وەڵامـە قـەمبیز ئـەو کەسەی دڵی لێی بوو خواستی، پاش ماوەیەکی کەم خوشکەکەی تری مارە کرد کە لە هەموان بچووکتر بوو. ئەو خوشکە بوو لەگەڵیدا چووە میسر و کوشتی).

# پێرست

